لە ژێر چاوەدێریی بەڕێز

**نێچیرڤان بارزانی**

سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و

بە سەرپەرشتیی وەزارەتی ڕۆشنبیری

فیستیڤاڵی شاعیری گەورەی کورد

**مەحوی**

لە شاری هەولێری پایەتەختی هەرێمی کوردستان

لە ڕۆژانی ٢٨-٣٠ ئاب ٢٠٠١دا سازدرا

بەحەق هەر حەق، بەناحەق ناحەقم وتووە لە ڕۆژی بووم
وەکو مەنصور ئەگەر بیشمکوژن، ناکەم لە حەق لادەم

مەحوی

وتەی بەڕێز نێچیرڤان بارزانی سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان
لە ڕۆژی دەست پێکردنی فیستیڤاڵی مەحوی لە هەولێر
ڕۆژی ٢٨ ئاب ٢٠٠١

**بەناوی خوا**

بەڕێزان نووسەران و ڕووناکبیران و مامۆستایانی کورد

بەڕێزان میوانانی کە لە دوورەوە تەشریفیان هێناوە زۆر بەخێر بێن.

سلاوتان لێ بێ و بەخێرهاتنتان دەکەم، بۆ ئامادەبوونتان لەم فیستیڤالە ڕۆشنبیرییەدا کە یادی کەڵە شاعیرێکی ناسراوی کوردە. ئەو شاعیرەی کە یەکێکە لە لوتکە دیار و ناودارەکانی شیعری کلاسیکی کوردی و، ئەویش (مەحوی)یە.

مایەی خۆشحاڵییەکی گەورەیە بۆمان، ئەمڕۆ شارەکانی کوردستان بەتایبەتی هەولێری پایەتەخت ئەم جۆرە چالاکییە ڕۆشنبیرییانە بەخۆوە دەگرن و لە ئامێزیان دەگرن. نووسەر و مامۆستا و شارەزایانی کورد لە دوور و نزیکەوە، لە دەرەوە و ناوەوەی کوردستانەوە هاتوون و بەشداری لەم چالاکییەدا دەکەن، ئەمڕۆ وا خەونی گەورەی خانی و نالی و حاجی قادر و مەحوی دێتە دی و، زمان و ئەدەب و هونەری کوردی لەسەر خاکی وڵاتی خۆیاندا ڕێزیان لێ دەگیرێ و بە ئازادی گەشەیان پێ دەدرێ.

لەم دەرفەتە بچووکەدا، حەز دەکەم وتەیەکی کورت ئاڕاستەی ڕووناکبیر و پسپۆر و شارەزایانی کوردستان بکەم: ئەو ئەرکەی ئەمڕۆ لە ئەستۆی ئێوەدایە ئەرکێکی یەکجار گەورەیە و لە ئەرکی سەرشانی ئێمە کەمتر نییە، دۆزی کورد تەنیا دۆزێکی سیاسی نییە کە ئەرکی سەرشانی حزب و سەرکردە سیاسییەکان بێت. بەڵکو دۆزێکی کولتووری و زمانەوانی و ڕووناکبیریشە. ئەوەی ئەمڕۆ لە بواری ڕۆشنبیری و هونەرییەوە لە کوردستان ڕوودەدات، ئیسپاتی دەکات کە میللەتی ئێمە خاوەنی فەرهەنگ و ئەدەبیات و زمانی سەربەخۆی خۆیەتی و هیچی لە گەلانی تر کەمتر نییە.

بەشێک لە ململانەی کورد و نەیارانی، بریتییە لە ململانەی فەرهەنگی و ڕۆشنبیری. ئەگەربێو ئێمە پەرە بە باری کولتووری و فەرهەنگیمان بدەین ئەوا دەتوانین زیاتر و زووتر لە ڕیزی گەلان نزیک ببینەوە. دەبێ لە بیرمان بێ کە دایەلۆگی کولتووری یەکێکە لە کەناڵەکانی ناساندنی کورد بەمیللەتانی دوور و نزیک. ئێمە زۆر پێویستیمان بەپێشخستنی ئەم بوارە هەیە

و ئەمەش ئەرکێکە لە ئەستۆی ئێوەی بەڕێزدایە.

ئێمە دەتوانین لەناو گەلانی دراوسێدا شانازی بەزۆر ڕەمزی کولتووریمان بکەین کە یەکێک لەم ڕەمزانە (مەحوی)یە. وەک چۆن شانازی بەڕەمزەکانی تری وەک: فەقێ تەیران و بابەتاهیر و مەلای جزیری و ئەحمەدی خانی و نالی و حاجی و ئەسیری و گۆران و پیرەمێردیش دەکەین. مەحوی، شاعیر و متەصەوف و عارفی سەردەمی خۆی بووە، بە چەکی بیر و قەڵەم بەرەو ڕووی زۆرداران و چەوسێنەران بووەتەوە. ئەمەش لەسەرتاپای دیوانی مەحویدا هەستی پێ دەکرێ.

زۆر جێگەی شانازییە کە شیعر و ئەدەبیاتی کوردی لە هەموو سەردەمێکدا لە سەنگەری مەزڵووم و بەشخوراواندا بووە. زانایانی کورد بەرەوڕووی زاڵم و داگیرکەران بوونەتەوە و ڕیزی گەلی خۆیان بەرنەداوە. ئەمە یەکێکە لە ڕووە گەشەکانی میللەتی ئێمە و شانازی پێ دەکەین.

نەوەی ئەمڕۆی کوردستان، زۆری پێویست بەناسینی مێژوو و ئەدەبیات و شارەزابوون لە داب و نەریت و ڕابردووی خۆیەتی. پێویستە لە کوردستاندا نەوەیەکی وشیار بەبیری نەتەوەیی و ڕۆشنبیریی نەتەوەیی پێ بگەینین. ئەم ئەرکە تەنیا بەداوودەزگاکانی حکومەت هەڵناسووڕێ و، دەبێ لەم بارەیەوە ڕووناکبیر و زانایانی کورد هاوکارییەکی تەواو بکەن. پێویستە هەنگاوەکانمان فراوانتر و خێراتر بێ و کۆڕ و کۆنگرە و فیستیڤالەکان زیاتر و فراوانتربن.

ئێمە وەکو حکوومەتی هەرێمی کوردستان، پشتیوانیمان بۆ بزووتنەوەی ڕۆشنبیری و بەستنی ئەم جۆرە یادانە و هەر جموجۆڵێکی هونەری، پشتیوانییەکی بێ سنوورە. دەبێ لە سایەی ئازادیی دەسەڵاتی حکوومەتی هەرێمی کوردستاندا هەموو خەونەکانی ڕووناکبیرانی کورد بێنەدی.

دووبارە بەخێرهاتنی هەموو لایەکتان دەکەم. بەتایبەتیش ئەوانەی ئەرکیان کێشاوە و لە شوێنی دوورەوە هاتوون. هیوادارم فیستیڤالەکەتان سەرکەوتووبێ. زۆر سوپاس.



مەلا محەمەدی مەلا عوسمانی باڵخی

**مەحوی**

١٨٣٠-١٩٠٦

## دیارم دەیری عیشقە

دیارم دەیری عــیـشــقــە، جێ بەســووتن بێ لەوێ دەگــرم
کە من مـشـتێ چڵ و چێـوم، بەچی بم، کـەڵکی کێ دەگرم
نەگــەییــە دامــەنی دەســتی دوعــا، جــا دەبمە خــاکی ڕێی
طەریقــەی گــۆشـەگـیــری بەردەدەم، ئەمــجـارە ڕێ دەگــرم
کــە دادی یەئسی خـــۆمم بردە لا، ئەم عـــارفــە توند بوو
وتی ئاخــر ســبــەینێ جــەژنە، خــوێنی تۆ لە پێ دەگــرم
لە ڕووســووریی عـیـبـادەت لام و ڕووزەردی خەجاڵەت مـام
بە نـاوی ســـێـــوی نـاوم باغـــەوان و، من بەهێ دەگـــرم
لەســەرخـۆ چوونە، شـەیدا بوونە، قـوڕ پێـوانە، ســووتانە
هەتا مــردن، مــەحــەببــەت ئیــشی زۆرە، ڕێزی لێ دەگــرم
چ شـــۆخـــە ئاگـــرم تێ بەردەدات و پێم دەڵێ: یا شـــێـخ!
بە خـاشـاکی دەوت شوعلە، عـەصـامـە دەسـتی پێ دەگـرم
کــە ســینەی ڕێشــمی بەو تێــغی نازە ئەنجن ئەنجن کــرد
وتــی: پەژمـــــوردەیە ئەم لالـەزارە، ئـاوی تێ دەگـــــرم
لە پاداشــتی قــســەی ســەردا هەمــە ئاه و هەناسـەی گـەرم
کــەسێ شــێــتــانە بەردم تێگرێ، من بەرقی تێ دەگــرم
شــوکـر هوشـیــارە «مـەحـوی»، تێـدەگـا دنیـا خـەراباتە
کــە بەدمــەســتێ بکا ئەهلی، خــراپەی بۆچی لێ دەگــرم!

**مەحوی**

ناوی کتێب: مەحوی - بەشێک لە بابەتەکانی فیستیڤاڵی مەحوی - هەولێر ٢٨-٣٠ ئاب ٢٠٠١
دانانی: ژمارەیەک لێکۆڵەوە و نووسەران
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٨٨
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: خۆشنووس محەممەد زادە
پیت لێدان و سەرپەرشتی: ئەمیر داوود
هەڵەگری: ئەمیر داوود + شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمان مەحمود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٣٨٥)ی ساڵی ٢٠٠١ی دراوەتێ

# مەحوی

## بەشێک لە بابەتەکانی فیستیڤاڵی مەحوی

هەولێر ٢٨-٣٠ ئاب ٢٠٠١

## بەسەرچووم

بەپیـــر ئەو مـــاهەوە چووم و بەســـەر چووم
پەری بوو، ئەو نەبوو، شەو بوو، بەسەرچووم
تەڵێ نێــرگـــسم و باغی حـــیـــرەتم پـێ...
بەفـــەڕ هات و وەکـو گـوڵ زوو بەســەرچووم
گلەی پێـــشم لـەســـەر ســـەر هەم بووە بار
کە دیی من دولبەرم بەرەم هات و بەسەرچووم
دەزانم بادیەی عـــیـــشـــقـــە خـــەطەرناک
کـەچی هەر چووم، ئەگەر مام و ئەگەر چووم
لە حـــینی نەزعی ڕۆحـــا، ڕۆحی عـــاشق
وتی: ئۆخـەی لە مـــیـحنەتخـانە دەرچووم
بە ئۆغـــرکـــردنی، من بوومـــە قـــەقنەس
کە ئەو چوو بۆ سەفەر، من بۆ سەقەر چووم
وتی: قـــەت وا مـــەیە، من واوە هەر دێم
نەهات ئەو وا قـــەت و، من واوە هەر چووم
شـــوکـــور مـــوورم بووە پامـــاڵی مـــیـــرێ
بـەبێ نـامـی ژیـام و نـامــــــــەوەر چـووم
غـەمی قـاتلـمە «مـەحـوی»! مـونفـەعـیل مـا
لە حـەشـــرا کـفنی خـوێناوی بەبەر چووم

**مەحوی**

## ئەم دەستپێشخەرییە پیرۆزە پێویستە بەرز ڕابگیرێت

**دکتۆر عەبدوڵڵا ئاگرین**

دیمەنی ڕووداوە تراژیدیاییەکانی کوردستانی خاپوور و کاولکراوی بەر لە ڕاپەڕینی جەماوەریی بەهاری ئاداری ١٩٩١ و چەوساندنەوەی کورد و دەربەدەرکردنی لەسەر ماڵ و زێدی خۆی و تەنانەت بەمەبەستی «تەرحیل و تەبعیس و تەعریب» سامناکترین شێوازی فەوتاندنی میللەتێک بەکارهێنرا و، کوشندەترین ئامێر و چەکی کۆکوژیی قەدەغەکراوی سەردەمی بەرامبەر بەکارهێنرا، ئا ئەو حاڵە؛ وای لە خەڵکانی ورە تەپیو و ڕووخاو کرد؛ بڵێن: تازە کورد چۆکی داداوە و ناتوانێت، خۆی لەبەردەم چەرخی کەچ ڕەفتار ڕاپسکێنێ و دەستی لێ بشۆن!.. کەچی ڕاستی و واقیعی ئایندە پێچەوانەی سەلماند و نەتەوەی کورد بەر لە ڕاپەڕین بەگشتی و دوای ڕاپەڕین بەتایبەتی؟ لە سای هۆشیاری و بیرفراوانی و توانای کەم وێنەی دڵسۆزانیەوە؟ توانی خۆی لەبەردەم تەوژمی پەلاماری لەناوبردن و ڕەشەبای مەرگدا بگرێت و لە ناوەوە و دەرەوەی کوردستاندا پێشکەوتنی ئەوتۆ بەخۆیەوە ببینێ؛ مایەی دڵخۆشی بێ.

ڕاستە تازەترین شۆڕشی زانستی سەردەم؛ شۆڕشی ئاڵ و گۆڕی زانیاری و داهێنانی ئەو بەرهەمە نوێ و زانستانەن؛ کەم کەس بەعەقڵیدا ئەهات وەک سەتەلایەت و فاکس و تەلەفۆنی جیهانی و ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەر.

بەڵام بەکارهێنانی ئەو ئامێرە داهێنراوانە پێویستییان بەزەمینە خۆشکردن و توانا و عەقڵی کراوەی مرۆڤ هەیە، دەنا بەتەنیا لە ژوورێکدا دابنرێن هیچ ڕۆڵێک نابینن و کەڵکیان لێ وەرناگیرێت و ئامێرێکی ساردوسڕ دەرئەچن.. توانا و عەقڵی بەکارهێنان و جۆری کەڵک وەرگرتن مەرجێکی سەرەکییە، بۆ سەرخستنی ئەو ئامێرە نوێیە داهێنراوانە لە هەمان کاتیشدا، ئەو دیاردە بەنیشانەی بەردەوامی شۆڕشە زانستییەکە ئەگەێنێت.

وەزارەتی ڕۆشنبیری حکوومەتی هەرێمی کوردستان بریاری دا ڕۆژی سێ شەممە ٢٠٠١/٨/٢٨ فیستیڤاڵێک بۆ مەحویی شاعیر لە شاری هەولێر ساز بکات... ڕۆژی ٢٠٠١/٨/٢١ واتە هەفتەیەک بەر لە سازدانی فیستیڤاڵەکە، سەردانی دەزگای ئاراسی خۆشەویست و برای دڵسۆزمان کاکە «بەدران ئەحمەد»م کرد... لە جۆر و چۆنیەتیی سازدانی فیستیڤاڵەکە و کۆسپ و تەگەرەی بەردەم چاپکردنی بابەتەکان وەک «ملزمە» نەک کتێب دواین، چونکە دەرفەت لەبەردەمدا نەماوە و تەنیا هەفتەیەکە... کاکە بەدران بە ڕوویەکی گەش و ورەیەکی بەرز و بڕوا بەخۆکردنەوە، پێشوازیی لەسەرخستنی فیستیڤاڵەکە کرد و گفتی چاپکردنی تێکڕای بابەتەکانی فیستیڤاڵەکەی لە کتێبێکی سەربەخۆدا دا... ئەمەش

دەستپێشخەرییەکی نوێی سەردەمانەیە لە بوار و دنیای چاپ و چاپەمەنیدا بەتایبەت بەنسبەت بارودۆخی ئێستەی کورد و هەژاری و دوورەدەستی لە مەڵبەندی زانستە پێشکەوتووەکانی دنیا.

بەڕاستی ئەم دیاردە کەم وێنەیە، سەلماندی رۆڵەی کوردیش هۆشیار و بەتوانا و، خاوەنی عەقڵیەتێکی پێشکەوتووی سەردەمانەیە و نەتەوەی کوردیش وەک هەموو میللەتانی سەربەخۆی سەر رووی ئەم زەمینە شیاوی ئەوەیە؛ مافی رەوای خۆی هەبێت و گیانی سەربەخۆی خۆی بەرێوەبەرێت.

دەستخۆشی لە هەموو کار و داهێنانێکی بەکەڵک و نوێ و ئافەرین بۆ ئەو عەقڵە کراوانەی بەهیوایەکی گەش ورە و متمانە بەخۆکردنەوە باوەش بەئایندەدا ئەکەن.

# شیعری مەحوی
# لە نێوان سۆفیزم و دەروێشیزمدا

**دوکتۆر مارف خەزنەدار**
کۆلیجی ئەدەبیات – زانستگای سەلاحەدین

## بەشی یەکەم

### سۆفیزم

بیرکردنەوەی ئادەمیزاد لە دروست بوونی خۆی و سروشت ڕایکێشاوە بۆ بیرکردنەوە لە کردگار. ئەمە لە ڕۆژگارێکدا بووە کە مەڵبەندی ژیان (المجال الحیوي) پەیدا بووە. واتە لەو کاتەی کە ئادەمیزاد لە سروشت پچڕاوە و هەوڵی داوە بۆ چاکەی خۆی بەکاری بێنێ.

بیرکردنەوە لە کردگار و گەڕان بەشوێنیدا فەلسەفە و سۆفیزمی دروست کردووە. پێش کەوتنە ناوەوەیان وەکو زاراوەیێکی ئەکادیمی. بەڵام بیرکردنەوە و گەڕانەکە ساکار بووە تا ڕۆژگاری فەیلەسووفەکانی بەرایی گریکی، ئینجا سەردەمی نەوەی دووەم لە فەیلەسووفەکان، سوکرات و ئەفلاتوون و ئەرستۆ. لەم ماوەیەدا بیروڕا لە بنج و بناوانی. «ئادەمیزاد– سروشت– کردگار» شێوەیەکی جەدەلی وەرگرت و بەدرێژاییی ڕۆژگار ماوەی بیرکردنەوە قووڵتر و فراوانتر بوو و گەلێ تیۆری و تاقیکردنەوە کەوتە ناوەوە.

جەوهەری ئایینە ئاسمانی و زەمینییەکان لەسەر بنجی ناسینی کردگار دامەزراوە، هەست کردن بەبوونی کردگار و جۆری ناسینی و وێنەگرتنی لەناو ئاینەکاندا وەک یەک نییە و جیاوازە، بەڵام زۆربەی ئایینەکان لە «بوون» (کەون)دا کە «ئادەمیزاد و سروشت»ە، «کردگار» دەبینن.

تاقیکردنەوە لەم بابەتەوە گەلێ فراوان بوو، سامانێکی بیروڕای فەلسەفی گەورە و دەستووری ئایینە کۆنەکانی و کتێبی پیرۆزی ئایینە ئاسمانی و زەمینییەکان کەوتنە ناوەوە تا داهاتنی ئایینی ئیسلام. ئەم ئایینە شۆڕشێکی گەورە بوو لە تازەکردنەوەی ئایینە ئاسمانییەکانی پێش خۆی بەتایبەتی ئایینیی مەسیحی کە ڕاستەوخۆ پێش کەوتبوو. هەر لە سەرەتاوە بەهۆی لە ناوەوە بوونی سامانێکی گەورە لە بیروباوەڕی فەلسەفی و سۆفیزمی گریکی و ڕۆمانی و ئایینە ئاسمانی و زەمینییەکان بیروباوەڕی «زوهد» لە کۆمەڵی ئیسلامی تازەدا پەیدا بوو. نویشکی ئەمە لە فەلسەفەی ئایینی ئیسلامەوە وەرگیرابوو بەوەی کە گێتیی ئێستا لەناو دەچێ، گێتیی

دوارِۆژ نەمر و هەمیشەییە. بۆ وەدەست خستنی گێتیی داهاتوو پێویستە بایەخ بەم گێتییە و ژیانی ئەم سەرزەوییە نەدرێ.

«زوهد»ی ئیسلامی سەرچاوەی دۆزینەوەی سۆفیزم بوو لە کۆمەڵی ئیسلامیی تازەدا، لەو کاتە کـە «زوهد» لە چوارچێـوەی شـەریعـەتدا نەچوو بووە دەرەوە سـۆفـیـزم خـەریکی لێکدانەوەی دەسـتـوورەکـانی ئایین بوو بەشێـوەیەکی تازە. تاقـیکردنەوەیێک بوو بینراو و نەبینراو (الظاهر والباطن)ی بابەت و کەس (الموضوع والذات) ئادەمیزاد و کردگار (الأنسان والخالق)ی بەیەک شت دەزانێ. لەبەرئەوە سۆفیزم لە سروشتی دەکۆڵییەوە لەبەر ڕۆشنایی «دەرچوون لە دەستوور» کە خۆی لە خۆیدا دۆزینەوەی سەربەستی بوو. سۆفیزم لە چوارچێوەی مێژووی نووسراو ڕەت دەبێ خـۆی دەکـوتێـتـەوە نـاو جـەرگـەی گێـتـیـیـەوە خـەریکی مـانـای شـاراوە دەبێ و لە مـەنـتـیق و دەستوورەکانی دەچێتە دەرەوە.

ئیـدیۆلۆجی سـۆفـیـزم لـەسـەر ئەوە دامـەزراوە کـە «بوون» دیار و نـادیارە، بوونی ڕاسـتـەقـینە نادیارییـە لە ئایین و شـەریعـەت دەبێ بۆ حـەقیـقەت و بەرەو دۆزینەوەی کردگـار دەکەوێتـە ڕێ. کـردگـار جـەوهەری گـێـتـیـیـە، سـۆفـیـزم لەناویدا دەتوێتـەوە، بەم پێـیـە پرتەوی دیارە بۆ نادیار. دڵسۆزیی لقە بۆ بنج (الفرع للاصل)، وە گەڕانەوەی وێنە بۆ ناوەرۆک.

ڕاسـتـی (حەقـیـقـەت) لە سـۆفـیـزمدا دیاردەیێکی عـەقـڵی (مەنتـیـقی) نییـە هەروەها نەقلی (شـەرعـی)یش نییـە بەڵکو ئیلهـامی و زەوقـیـیـە. دیارە دەبێ «اداة» (ئامـراز، دەسـتـاوێژ)ی گـەیشتن بەحـەقـیـقـەت شـتـێکی تری غـەیری هەست (الحس) و بیـر (العـقل) و دەسـتـوور (شەریعەت) بێ دڵ دیاردەی کردگارەکەیە کە سۆفی بەهۆی ئەوەوە هەست بەخودا و نهێنییەکانی بوون دەکا، دڵ مەڵبەندی زانین و دڵدارییە.

لە کۆمەڵی ئیسلامیی تازەدا بۆ یەکەمجار لە نیوەی یەکەمی سەدەی دووەمی هیجری (نیوەی دووەمی سـەدەی هەشـتـەمی مـەسـیـحی) زاراوەی «سـۆفی» پەیدا بوو. لە ناوەڕاسـتی سـەدەی دووەمی هیـجـری (نیـوەی دووەمی سـەدەی نۆیەمی مـەسـیـحی) شـاری بەغـدا بـوو بەمـەڵبـەندی بزووتنەوەی سـۆفـیـزم و کۆبوونـەوە و گفـتـوگۆ و ئـاڵوگـۆڕی بیـروباوەڕی ئایین و شـەریعـەتی تـێدا دەکرا.

بەلای ئێـمەوە قـۆناغی یەکەمی بزووتنەوەی سۆفیزم کە لە سەدەی دووەمی هیجرییەوە دەست پێ دەکاو ماوەی جموجۆڵی سۆفیزمە لە ڕووی تیۆرییەوە. سۆفیزم بزووتنەوە (حرکة) بووە لە دژ وەستان (دەستووری هەمیشەییی نەگۆڕان)، بێگومان شۆڕشێک بوو دژی دەستووری هەمیشەیی لەبەرئەوە لە لایەن دەسـەڵاتەوە بەرهەڵسـتی دەکـرا، هێـشـتـا ڕەنگێکی تەواوی لە داهێنانی شیـعـریدا نەدابووەوە. ئەم قـۆناغـە تا دەوروبەری دوا سالانی سـەدەی شـەشـەمی هیـجـری (دوا سـالانی سـەدەی دوازدەمی مـەسـیـحی) خـایاند. ئەم قـۆناغـە دوور و درێژە ناوی گـەلێ لە سۆفییەکانی سۆفیزمی ئیسلامی دەور دەکاتەوە بەشێکیان گەیشتنە پلەی فەیلەسوفی بەهۆی

لێکدانەوە ورد و ژیرەکانیان کە لە دواییدا بوون بەتیۆری لە بزووتنەوەی سۆفیزمدا. بەشێکی تریان خوورەوشت و ژیانی رۆژانەیان یاغی بوون و بەرهەڵستیی دەسەڵاتی خوێنخوار بوو.

بەشی سێیەم تیۆرییەکانی سۆفیزمیان لەگەڵ شەریعەتدا گونجان و بزووتنەوەی دەروێشی کەوتە ناوەوە. هەندێ لە سۆفییە هەرە دیارەکانی سۆفیزمی ئیسلامی ئەمانە بوون: حەسەن ئەلبەسری (٢١هـ-٦٤٢م، ١١٠هـ-٧٢٨م) ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم لە (١٦١هـ-٧٧٨م) مردووە، بالوولی دانا لە (١٩١هـ-٨٠٦م مردووە)، شێخ مەعرووفی کەرخی لە (٢٤٥هـ-٨٥٩م) مردووە، زوننونی میسری لە (٢٤٥هـ-٨٥٩م) مردووە تەیفووری بایەزیدی بەستامی لە١(٢٦هـ-٨٧٥م مردووە) جونەیدی کوڕی محەمەدی بەغدایی لە (٢٩٧هـ-٩١٠م) مردووە، مەنسووری هەلاج لە (٣٠٩هـ-٩٢٢م) مردووە، ئەبولقاسم عەبدوکەریمی قوشەیری لە (٤٦٥هـ-١٠٧٢م) مردووە، ئەبوحامیدی غەزالی لە (٥٠٥هـ-١١١١م) مردووە، شێخ عەبدولقادری گەیلانی لە (٥٦١هـ-١١٦٦م مردووە)، سەید ئەحمەدی رفاعی لە (٥٧٨هـ-١١٨٢م) مردووە، شەهابەدین سەهرەوەردی کوژرا و (٥٨٧هـ-١١٩١م) مردووە و هی تریش.

قۆناغی دووەمی بزووتنەوەی سۆفیزم لە سەدەی سێزدەهەمی مەسیحییەوە دەست پێ دەکا، بەدڵنیاییەوە دەتوانین ناوی بنێین قۆناغی داهێنانی ئەدەبی لە چوارچێوەی سۆفیزمی کۆزمۆسی و سۆفیزمی ئیسلامی. لەم قۆناغەدا شاعیرە سۆفییەکان یا سۆفییە شاعیرەکان رەمزی سۆفیزم و زاراوەی فەلسەفییان تێکەڵ بەسروشت و هەستی ناوەوەی خۆیان کردووە و ئەدەبێکی مرۆڤایەتییان هێناوەتە ناوەوە. ئەمەش ئەوە ناگەیێنی کە لێکۆڵینەوە لە ئیدیۆلۆجیەتی سۆفیزم پەکی کەوت بوو یاخود تەریقەتەکانی دەروێشیزم کپ بووبوون، بەپێچەوانەوە ئەم هەموو دیاردانە لە گۆڕان و پەرەسەندندا بوون، هەندێ جاریش تێکهەڵکێش بووبوون. بۆ بەڵگە ئەم قۆناغە کۆمەڵێک لە سۆفی و شاعیر و شێخی سۆفی و دەروێش دەور دەکاتەوە هی وەکو: فەریدەدین عەتاری نیشابووری لە (١٢٣٠م) مردووە، ئینبولفاریز لە (١٢٣٥م) مردووە، شێخ محیەدین عەرەبی لە (١٢٤٩م) مردووە، ئەبولحەسەنی شازلی (لە ١٢٥٨ مردووە)، جەلالەدین رۆمی لە (١٢٧٣) مردووە، حاجی بەکتاش لە (١٣٣٧م) مردووە، عیمادەدین نەسیمی لە (١٤١٧م) مردووە، نوورەدین جامی لە (١٤٩٢م) مردووە و هی تریش.

### دەروێشیزم

دەروێشیزم هەندێ دەستوور و خوونەریت و بیروباوەڕی سۆفیزم لە رووی پراکتیکییەوە دەور دەکاتەوە، رەنگە لە سەرەتادا لە دژی دەسەڵات بووبێ، بەڵام لە پاشانا لەگەڵ دەسەڵات یەکی گرت و بەناوی «تەریقەت»ەوە کەوتە ناوەوە و بوو بەپاڵپشتی دەسەڵات وەکو لە مێژووی سۆفیزمی ئیسلامیدا دەردەکەوێ، تیۆریی هەموو فەیلەسووفەکانی سۆفیزم نەبووە بەتەریقەت بەڵکو بەشێکیان، هەر ئەو بەشە بووە بەرێکخراو و بەناوی شێخی خاوەن تیۆرییەکانی سۆفیزم

ناوبانگی دەرکردووە، لە سەرانسەری بزووتنەوەی سۆفیزمی ئیسلامیدا، نموونەی تەریقەتە گرنگەکان ئەمانەن:

تەریقەی تەیفووری یا بەستامی، تەریقەتی جونەیدی، تەریقەتی قادری، تەریقەتی ڕیفاعی، تەریقەتی شازلی، تەریقەتی مەولەوی (جەلالەدین ڕۆمی)، تەریقەتی بەکتاشی، تەریقەتی نەقشبەندی، تەریقەتی حرووفی و هی تریش.

ئەوەی سەنج ڕادەکێشێ ئەوەیە ئەگەر بەوردی تەماشای ئەم تەریقەتە دەروێشییانە بکەین دەبینین ڕێبەر و شێخەکانیان وەکو خاوەن تیۆریی سۆفیزم بیروڕا و بۆ چوون و زانیاریی ئەوتۆیان نەخستۆتە ناو بزووتنەوەی سۆفیزمییەوە زیاتریش ناویان هەر بە«دەروێش» ڕۆیشتووە وەکو لە عەرەبیشدا دەبینین زاراوەی «الدروشة» بۆ ئەم بزووتنەوەیە بەکاردێ، هەروەها ئەم تەریقەتانە بە گشتی نەبوونە هۆی داهێنانێکی ئەدەبی، بێگومان لێرەدا دەبێ حسێبێکی تایبەتی لەگەڵ جەلالەدین ڕۆمی بکرێ.

ئەمەو لەلایێکی ترەوە کردەوە پراکتیکییەکانی ڕێکخراوی تەریقەتی دەروێشی بۆتە هۆی ئەوەی «دژی دەروێشیزم» لە بەرهەمی ئەدەبی نەتەوە موسلمانەکاندا پەیدا بێن.

ئەوەی زۆر دیار و ئاشکراشە لە بابەت مێژووی دەروێشیزم لە کوردستانا وەکو ڕێکخراوێک بە شێوەیێکی ڕەسمی لەسەدەی هەژدەمدا پەیدا بووە بە ناوی دوو تەریقەتی بەناوبانگ قادری و نەقشبەندی، دەسەڵاتی عوسمانی ڕێزی لێ گرتوون و یارمەتی داون.

لەم ڕۆژگارەدا سۆفیزیم وەکو ڕێباز و فەلسەفە و ئیدیۆلۆجی و داهێنانی ئەدەبی لە گێتیی موسلمانیدا بەسەرچوو بوو.

## شیعری سۆفیزم و دەروێشیزم

## لە ئەدەبی کوردیدا تا سەردەمی مەحوی

کورد وەکو کۆمەڵێکی ئیسلامی پێوەندییێکی بەهێزی بووە لەگەڵ هەموو بزووتنەوە بیرییەکانی نەتەوە موسلمانەکان، شاعیرانی کورد لە قۆناغە جیاوازەکانی گۆڕانی شیعری کوردیدا بەشیدارییان لە دەوڵەمەندکردنی ئەدەبی سۆفیزم کردووە.

بەگشتی کارکردنی سۆفیزمی ئیسلامی لە شیعری کوردیدا لە سێ شێوەدا دەبینین ئەم سێ شێوەیە ئەگەرچی لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی ئیدیۆلۆجیی سۆفیزمەوە داهاتووە بەڵام جیاوازیێکی تەواو لە ڕووی هونەرییەوە لە نێوانیاندا هەیە هەروەها نرخی ئیستێتیکیشیان لەیەک پلەدا نییە. بەلای ئێمەوە ئەم شێوانە لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە ئەمانەی لای خوارەوەن.

١- شیعری سۆفیزم (عیرفانی).

٢- شیعری وەسفی سۆفیزم.

٣- شیعری دژی دەروێشیزم.

**١- شیعری سۆفیزم (عیرفانی)**

شیعری سۆفیزم داهێنانێکە ئیلهامی لە ناوەڕۆکی فەلسەفەی سۆفیزم وەرگرتووە واتە داهێنانی وێنەی فەلسەفەی سۆفیزم ئامێز زۆرتر پەنا بۆ ڕەمز و ڕۆمانتیزم دەبا. تا ئێستا سنوورێک بۆ شیعری سۆفیزم لە ئەدەبی کوردیدا نەکێشراوە، بەرهەمی هەندێ شاعیر بەشیعری سۆفیزم لە قەڵەم دراوە بەڵام ڕاستییەکە ئەوە نییە، شاعیری تریش هەن دەوری باڵایان بووە لە شیعری سۆفیزم بەڵام گوم ناون.

لە پاش لێکۆڵینەوە و وردبوونەوە گەیشتینە ئەوەی کە بتوانین شاعیرانی پسپۆڕی شیعری سۆفیزم (عیرفانی) دەستنیشان بکەین لەمانە:

بابا تاهیر (٩٣٥ - ١٠١٠م)، مەلا پەرێشان (سەدەی چواردەم)، مەلای جزیری (١٥٦٠ - ١٦٤٠م)، سەید ساڵحی نیعمەتوڵلاهی (١٨٣٤ - ١٩٠٥م)، مەحوی (١٨٣١ - ١٩٠٦م)، هەروەها تاکە تاکە لە شیعری شاعیرانی وەکو کوردی (١٨١٢ - ١٨٥٠)، پرتەوی هەکاری (سەدەی نۆزدەم)، حەریق (١٨٦٥ - ١٩٠٩)، وەفایی (١٨٤٤ - ١٩١٤)، و هی تریش دەبینرێ.

**٢- شیعری وەسفیی سۆفیزم**

شیعری وەسفیی سۆفیزم وەسفێکی ڕووکەشی خووڕەوشت و کردەوە پراکتیکییەکانی دەستووری سۆفیزمە، هەندێ جار خەریکی لێکدانەوە و شیکردنەوەی ڕاستی و زانیارییەکانی سۆفیزمە و تیۆری و دەستوورەکانی دەخاتە ڕوو. هەندێ جاریش دەم لە مێژووی سۆفیزم دەدا، بۆ ئەم ئامانجە پەنا دەباتە بەر زاراوە و تەعبیر و لێکسیکۆنی سۆفیزم، وە بەشێوەی شیعری تەعلیمی (دیداکتی) بیروڕاکانی دەگەیێنێتە خوێندەواران.

شیعری ئایینی لای یارسانان «ئەهلی حەق» کە بەشێوەی گۆرانیی زمانی کوردییە دەچێتە ناو ئەم جۆرە شیعرەوە[1] چونکە ڕێباز و دەستوور و مێژووی مەزهەبی یارسان و گەورە پیاوانیان هەموو بەشیعر هۆنراوەتەوە، ئەوەی شایەنی باسە لەم ڕووەوە ئەوەیە کە بەشێک لە گێتیی پیرۆزیان سەرەنجام شیعرە و بەشەکەی تری پەخشانە.

ئەم جۆرە شیعرە لە بەرهەمی هەموو ئەو شاعیرانەدا دەبینرێ کە شیعری بابەتی عیرفانیان هەیە جگە لەمانە لە بەرهەمی ئەم شاعیرانەشدا دەبینرێ:

عەلی هەریری (١٥٣٠ - ١٦٠٠م)، فەقێ تەیران (١٥٦٤ - ١٦٤٣م)، مەلای باتەیی (١٦٣٠ - ١٧٠٠م)، ئەحمەدی خانی (١٦٥٠ - ١٧٠٦م)، خانای قوبادی (١٧٠٠ - ١٧٥٩)، شێخ نوورەدینی بریفکانی (١٧٩١ - ١٨٥١)، مەولەوی (١٨٠٩ - ١٨٨٣)، مەلا

عوسمانی فایەق (١٨٠٦ – ١٨٨١)، تاهیر بەگ (١٨٧٨ – ١٩١٨) و هی تریش.

**٣- شیعری دژی دەروێشیزم**

دەروێشیزم لایەنی پراکتیکی ڕەشبینیی سەلبی سۆفیزمە، خەریکی لاپەڕە تاریکەکانیەتی، دەروێشیزم بوو بەدیاردەییێکی کۆمەلآیەتی دەسەلآت (بەتایبەتی عوسمانی) بەکاری هێناوە بەوەی کردوویەتی بەداردەست بۆ ڕاووڕووت و بەنجکردنی خەلکی ناو کۆمەل. شیعری دژی دەرێشیزم دوو شێوازی وەرگرتووە، یەکەمیان پەنجە درێژکردن بۆ هەندێ کار و کردەوەی خراپی دەروێشیزم و بەراورد کردنی لەگەل کەموکوڕی و ناگزووربی کۆمەلآیەتی بەشێوەیەکی هونەری، وەکو لە هەندێ لە شیعرەکانی نالیدا دەردەکەوێ، دووەمیان هێرش بردنە بۆ سەر خووڕەوشت و دیاردە پراکتیکییەکانی دەروێشیزم وەکو ڕووداوێکی دواکەوتوو و کۆنەپەرست لەناو کۆمەلی کوردەواریدا.

ئەم بابەتە شیعرە بەتێکڕایی لە بەرهەمی گەلێ لە شاعیرانی قۆناغە کۆنەکانی کوردیدا دەبینرێ بەتایبەتی لە شیعری نالی (١٨٠٠ – ١٨٥٦) حاجی (١٨١٥ – ١٨٧٩) شێخ ڕەزا (١٨٣٨ – ١٩١٠)، لە سەرەتای سەدەی بیستەمیشەوە ئەگەرچی شیعری عیرفانی و وەسفیی سۆفیزم بەمانا کلاسیکییەکەی کزبوو بوو، بەلآم شیعری دژی دەروێشیزم لە پەرەسەندن و گۆڕان و پێشکەوتندا بوو[٢] و تا ئێستاش شاعیرانی کورد دەمی لێدەدەن چونکە پێوەندیی بەژیانی کۆمەلآیەتی و سیاسییەوە هەیە.

## بەشی دووەم

## مەحوی (١٨٣١ – ١٩٠٦)

مەحوی یەکێکە لەو شاعیرانەی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا لە کوردستانا دەوری شاعیرانی سۆفیزمی نەتەوە موسلمانەکانی نواندووە کە لە سەدەی سێزدەمەوە دەستی پێ کردبوو. دیارە مەحوی یەکەمین شاعیری ئەم بابەتەی کورد نییە لەوانەیە دوامین بێ[٣].

گەلێ جار لێکۆلینەوە لە شیعرەکانی مەحوی و ڕەوشت و بیروباوەڕی تایبەتی خۆی ئەگەر لەژێر ڕووناکی و شێواز و فەلسەفەی سروشتییەکان (ناتورالیزم: الطبیعیون) بێ تووشی تەنگوچەلەمە و سەر لێ شێوان و تێک ترنجانی بیروڕاییێکی وا دەبێ کە ڕێگەمان نابێ بۆ گەیشتن بەهیچ ئەنجامێک. چونکە تەنگوچەلەمە و پێچەوانە و ناوەکییەکی لە شیعری مەحوی دا وەکو شاعیرانی تریش ئەوەندە زۆرە پێویستە لە لێکۆلینەوەدا کە خەریکی «مەبەستێک» دەبێ مەبەستەکانی ترمان لەبەرچاو نەبێ.

**هەندێ ڕاستی لە بابەت مەحوییەوە**

١- مەحوی وەکو ڕێبەرێکی ئایینی باوەڕی تەواوی بەئیسلام هەبووە، ئایینە ئاسمانی و

زەوییەکانی کۆنی بێش ئیسلامی ڕەتکردۆتەوە بەهاتنی ئیسلام ئەو ئایینانە هەموویان بەتاڵ بوون.

٢- مەحوی وەکو شێخێکی تەریقەتی نەقشبەندی باوەڕی بەتێکەڵکردنی تەریقەت بەشەریعەت بووە ئەمەش بەمانای تەریقەت لە پێناوی شەریعەتدا نەک پێچەوانە[٤].

٣- شیعری دژی دەروێشیزم لە پێناوی چاک کردنی باری کۆمەڵایەتی بووە.

٤- وەکو شاعیرێکی چاک سوودی لە سۆفیزم یاخود شیعری سۆفیزمی ئیسلامی پێش خۆی وەرگرتووە، هەندێ شیعری دەچێتە ناو بیروباوەڕی سۆفیزمی کۆزمۆسی لە ڕووی تیۆرییەوە لەگەڵ سۆفیزمی ئیسلامیش دەگونجێ.

٥- لە زاراوە و تەعبیر و لێکسیکۆندا تەئسیری شیعری سۆفیزمی ئیسلامی دیارە بەتایبەتی شاعیرە گەورەکانی عەرەب و فارسی و تورک کە خەریکی سۆفیزم بوون.

لەمەوە دەتوانین بڵێین لەگەڵ ئەوەی مەحوی تەریقەتی بۆ شەریعەت بەکارهێناوە، هەموو ئایینە کۆنەکانی ڕەت کردووە و ڕەفزی کردوونەتەوە، بەڵام لە بەشە شیعرە سۆفیزمییەکانیدا توانیویەتی بەرهەمێکی ئەوتۆ دابێنێ لە ڕووی ڕەمزی سۆفیزمی و ئیستێتیکی ڕۆمانتیزمییەوە بەرامبەر بەرهەمە گەورەکانی سۆفیزمی ئیسلامی بووەستێ و ببێ بە«مطلق» وە لە لایەن هەموو کەسێکیشەوە چێژی لێ وەربگرێ و بەچاوێکی بەرز تەماشا بکرێ.

## شیعری سۆفیزمی مەحوی

١

مەحوی شیعرێکی[٥] بەم دێڕە دەست پێ دەکا:

به نووری باده کەشفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم چبکەم
بەشەمعێکی وەها چاری شەوێکی وا نەکەم چبکەم[٦]

مەبەستی لە زوڵمەتی تەقوا ئیماندار و کوڵکە مەلای ناهۆشیارە ئەوەی «عیبادەت» لەلای بووە بە«عادەت»، نووری بادە «پرتەو» و «ئیشراق»ە، دیارە ئیماندای ناهۆشیار لە کردگارەوە نزیک نییە، سۆفی کە باوەڕی بەپرتەو هەیە لە پێشانا خۆشی ناهۆشیار بووە بەڵام لە دواییدا بەو نوور و چرایە تاریکی عیبادەتی ناهۆشیاری ڕووناک بۆتەوە لەبەر ئەوەیە سۆفی لە کردگارەوە نزیکە نەک ئیمانداری ناهۆشیار.

لە خەزنەی دڵمدا هەرچی هەیە و هەر داغی سەودایە
دەسا ئەم نەقدە دەردی عیشقی پێ سەودا نەکەم چبکەم

دڵی سۆفی لە دەردی دڵداری زیاتر هیـچی تری تێدا نییە، جێی هیچ شتێکی دیکەی تێدا نابێتەوە، ئەو دەردە گەڕان بەشوێن کردگارە برینەکانی پارەیە دەبێ دەردی عیشقی پێ بکرێ واتە ئەم دەردە دەبێ هەر بمێنێتەوە دەردەکە پارەیە و خۆی پێ دەکرێتەوە واتە سارێژ نابێ.

لەگەڵ دەستی مەلا ڕێک ناکەوێ زوونناری زوڵفی یار
وەکو شێخ ئیختیاری مەزهەبێ تەرسا نەکەم چبکەم

لای مەحوی مەلا بەڵگەی ئایین و شەریعەتە، شێخ ڕەمزی سۆفیزم و تەریقەتە ئەم دوو شتە لەگەڵ یەکتریدا ناگونجێن بەڵام شاعیر لەسەر ڕێی تەریقەتە لەبەر ئەوە لاسایی شێخی سەنعان دەکاتەوە چونکە ئەم شێخە کردەوە و جوانیی کردگاری لە کچێکی گاور دیوە، ئەمە بیروڕای سۆفیزمی کۆزمۆسییە.

لە ڕێی ئەو شۆخەدا خۆم کرد بەخاک و پێی پیا نەنام جارێ
دەسا خاکی هەموو عالەم بەسەر خۆما نەکەم چبکەم

بۆ گەیشتنی بەو شۆخە (مەحبووب) مەحوی خۆی دەکا بەخاک بەڵام مەحبووب گوێی ناداتێ دەبێ گوێشی نەداتێ، جا ئەگەر هەموو خاکی زەوی بەسەر خۆی دابکا واتە ببێتە هەموو خاکەکە ئایا لێی نزیک دەبێتەوە؟ ئەم پرسیارەش هەر بێ وەرامە.

دەمێکە شاری پڕ شۆڕی مەحەببەت مات و خامۆشە
بە قانوونی تەجەننون شۆڕشێ ئینشا نەکەم چبکەم

شاری دڵداری (شاری سۆفییان) پڕە لە جموجۆڵی و بیرکردنەوە و داهێنان بەپێچەوانەی ئەو کۆمەڵەی کە «دەستووری سنوورکێشراوی نەگۆڕاو» بەڕێوەی دەبا، لەم کۆمەڵەدا هەموو داهێنانێک قەدەغەیە، هەموو دەرچوونێک لە دەستوور نائاساییە، ئەمە شاری خامۆشانە لەبەر ئەوەیە ئەگەر قانوونی سنوور کێشراو «عاقلی»بێ دەبێ ئەو قانوونە بە قانوونی «شێتی» بەرهەڵستی بکرێ (بالوولی دانا و مەنسووری هەلاج).

## ٢

مەحوی دەڵێ:

بەبێ بەزمی حوزووری تۆ حەرامم کردووە بادە
نەوەک بشکێ بەنەشئەی مەی خوماری دەردی بێ تۆیی

دووری شاعیر لە مەحبووب (کردگار) بۆتە هۆی سەرخۆشیی شاعیر بەبێ مەی، ئەمە جۆرە سەرخۆشییێکی سۆفییانەیە، بەڵام کە یەکێتی دروست دەبێ بەکۆبوونەوە لەو کاتەدا بادەی حەقیقی هەمیشەیی دەخورێتەوە.

هەر لە بابەت یەکێتییەوە مەحوی دەڵێ:

ئەرێ دڵ بێ شەرابێ لەعلی گوڵ ڕەنگت لە گوڵ چبکا
کە جیلوەی گوڵ لە گوڵشەندا نەبێ بلبل لە چڵ چبکا

لێرەدا هیوای گەیشتنی دوو شتە بەیەکتری، مەحوی بەکردگار، دڵ هی مەحوییە، شەرابی لێو هی مەحبووبە، بلبل مەحوییە، گوڵی گوڵشەن مەحبووبە، بەڵام ئەم دوو شتە نەگەیشتوونەتە یەکتری و یەکێتی دروست نەبووە، هەر بۆ دروستبوونی یەکێتییەکە دەڵێ:

کە هەڵگیرسا لە نووری بادە شەمعی حوسنی جانانە
نەچێتە سەر تەریقەی حەزرەتی پەروانە دڵ چبکا

پرتەو هی کردگارە، دڵی شاعیر دەبێ لەناو ئەو پرتەوەدا بتوێتەوە و یەکێتی دروست ببێ، بۆ ئەمە پێویستە بەپەروانە چۆن پەروانە وازناهێنێ تا بەڕووناکی چرا دەسووتێ، شاعیریش واز ناهێنێ تا لە ناوپرتەوی کردگار دەتوێتەوە و دەبن بەیەک.

٣

مەحوی بۆی هەیە وێنەی کردگار لە هەموو شتێکدا ببینێ:

ئیعجازی عیشقە مەنشەئی هەر موعجیزێکی حوسن
مەحموودە بەندە بۆیە بووە بەپادشا ئەیاز

مەحموود سوڵتانە، هەیاسێ غولام و پیاوەتی، بەڵام مەحموود وێنەی کردگاری لە هەیاسی خاس دیوە، لەبەر ئەوە مەحموود بەپێچەوانەیە، خۆی بووە بەندە و هەیاسی خاس بووە بەڕەمزی بوون و، هەوڵ دەدا یەکێتی لەگەڵا دروست بکا.

٤

شاعیر «بوونی » نییە بەبێ مەحبووب:

کە تۆ غایب لەبەر چاوم دەبی چم بێ لە تۆ غایب
قیامەت حازری بەر چاومە خۆمم لە خۆ غایب

«تۆ»ی مەحبووب کە نزیک دەبێ لە شاعیر دوورە، چونکە بەنزیکی مەحبووب شاعیر لەناویدا تواوەتەوە و نەماوە لەبەر ئەوەیە شاعیر لە خۆی دوورکەوتۆتەوە.

هەر لەبابەت توانەوەوە دەڵێ:

کە دڵ دەتوێتەوە بۆ تۆ دەکەی ئەو ڕۆژە تۆ بڕوا
کە خۆ دەرخەی وەکو دڵ وەکو شەونم لە خۆ بڕوا

دڵی شاعیر دەبێ لەناو مەحبووبدا بتوێتەوە، ئەمە بەنزیکبوونەوە دەبێ، کە نزیک دەبێتەوە توانەوەیەک دروست دەبێ وەکو چۆن شەونم لەناو خۆردا دەتوێتەوە. خۆر کردگارە و دڵیش

شاعیره. بەڵام مەسەلەکە دەبێ هەر لە نێوان «دەبێ» و «نابێ» بێ و کۆتایی پێ نەیە. شاعیر دەڵێ:

کـه ڕۆحم تێگەیی تۆ حـەز بەدەرچوونی دەکـەی دەرچوو
دەبێ عـــاشق کـــه دی بێـــزارە یاری بـێ بڕۆ بڕوا

ڕوحی شاعیر لەناو مەحبووبدایە هەر کاتێک ئەگەر خۆشەویست بەم یەکێتییە ڕازی نەبوو دەبێ لە خۆیەوە دووربکەوێتەوە.

٥

«مـەعـریفـەت» و «عـاریف» لە زاراوەکـانی فـەلسـەفـەی سۆفـیـزمی مـەحـوی، بەکـوردی «تێ گەیشتن» و «تێگەییـو»ی بەکارهێناوە، تێگەیشتن لە ئەنجامی هەستکردن بەپرتەوە کە نهێنی ڕووناک دەکاتەوە:

گـــەر تێـــبگەن لە گـــەوهەری دڵدا چ مـــەوج دەدا
ئەم شـــەو چراغـــە لـەم شـــەوەدا کـــەس دەدا بەکـــەس

ئەوەی لەناو دڵی عاریفدا مەوج دەدا دڵدارییە، ئەمە کەس پێی نازانێ خۆی و مەحبووب نەبێ چونکە پرتەوی کردگار نهێنییێکە لەنێوان عاریف و مەحبووب نابێ بیدا بەکەس واتە نهێنییەکە ئاشکرا بکا.

حـەق بێـژییـێک گـوناهیـە مـەنسـوور و حـەقـمـە من
ئەم قـەتعـە گـەر نیـشـانی نەدەم (مـەحـویا) بەکـەس

بەڵام ئەو ڕاستـیـیـەی کـه مـەنسـووری هەلاج وتی کـارێکی ڕاست نەبوو و گـوناه بوو چونکە شتێک بوو نهێنی لە نێوان عـاریف و کردگار و نەدەبوو کەس بیزانێ بۆیە شاعیر ئامادە نەبوو ئاشکرای بکا(٧).

دیسان لەبابەت عاریفەوە شاعیر دەڵێ:

تێگەییـو شـێـوە نیـیـە ئەوڕۆدا سـبـەی شـایی بکا
پێگەییـو دەروێشـە دا سـبـحـەی شـەهنشـاهی بکا

ئەوەی لە نهێنی گەیشتووە ئەمڕۆ لە ناخۆشیدایە بۆ ئەوەی سبەینێ بکەوێتە خۆشییەوە ژیانی ئێستا بەبێ مەحبووب وەختییە ژیانی سبەی لەگەڵ مەحبووب هەمیشەییە.

ئینجا دەڵێ:

نووری عـومری سەرف ئەکا بۆ کەشفی تاریکی لە خەڵق
وەک چرا هەر کـەس بەشـۆخی مـەجلیس ئارایی دەکـا

عـاریف بەرۆشنایی ئەو پرتەوەی کە تەنیا خـۆی هەسـتی پێ دەکا خـەڵکی رووناک دەکـاتەوە واتە ڕێی ڕاسـتـیـان پیـشـان دەدا تا بگەنە پلەی ئەو و ئەوانیش پرتەوی کـردگـار لەناو دڵیـاندا هەڵبێ. ئەو پرتەوە پەردە لەسـەر کـردگـار لادەدا وەکـو چۆن چرا مـەجلیـسی ڕەندان ڕووناک دەکاتەوە.

٦

لە وردەکارییەکانی شاعیر هەندێ وێنەی ڕۆمانیکیی داهێنراو لە ڕەمزی سۆفیزم وەردەگرین:

گـەردی ڕێی هەسـتـاوە جێ داوا دەکـا
بەخـتـە مـاڵی چاوی کێ ئاوا دەکـا

تۆزی ڕێی پێی مەحبـووب کە هەڵدەستێ دیارە جارێکی تریش دەنیـشـێتـەوە جا چاوی ئەو سۆفییە بەختیار دەبێ ئەگەر تێیدا بنیشێتەوە، بێگومان تۆز و گردەکە لە باتی کل دەبێ.

تەنگوچەڵەمەییێک لە نێوان عاریف و مەحبووب خۆی دەنوێنێ بۆ ئەمە دەڵێ:

وەردەگـێـڕی ڕوو کـە سـوجـدەی بۆ دەبەم
هەی دەڵێ: کـەی نـوێژی ڕۆژاوا دەکـا

مەلا دەبێ ڕۆژێ پێنج جار نوێژ بکا بەڵام نوێژی سۆفی کات و وەختی بۆ نییە لەبەر ئەوە هەر کە پێویست بێ «عیبادەت» دەکا و «سوجدە» دەبا.

مەحبووب سەری سووڕدەمێنێ لەوەی کە مەلا بووە بەسۆفی و هاتۆتە سەردەستووری «سوجدە» نەک نوێژکردن.

لە وردەکارییەکانی تری مەحوی:

لە کێ پرسم دڵی پڕ لە خوێنی حەسرەتە یاقووت
عەزا پۆشی چییە و کێیە جلی پیرۆزە بۆ شینە

هەستی شاعیـر وێنەی ئەم دوو بەردە جوانەی دۆزیەوەتەوە یاقـووت و پیـرۆزە یەکەمیـان دڵی بریندار و دووەمیـان بەرگی تازیەی پۆشیوە بۆ یەکێکیان سوور و ئەویتریان شینە؟ وەرام دانەوەی ئەم پرسیارە ئەوەندە درێژە ماوەی نێوان عارف و کردگارە!

٧

مەحوی دەڵێ:

لە پاداشی قسەی سەردا هەمە ئاه و هەناسەی گەرم
کەسێ شێتانە بەدەم تێ بگرێ من بەرقی تێدەگرم

لای مەحوی شاری سۆفیزم مەڵبەندی جموجۆڵی و داهێنان و گەڕان بەشوێن ڕاستی و دروستکردنە، بەرامبەر ئەو شاری دەستوور و دەسەڵات و فەرمانڕەوایی و زۆر و ستەم هەیە. قسەی سارد و تانەلێدان و شێت و بەرد تێ گرتن لە ئەدگاری دەستوور و دەسەڵاتە بەڵام مەحوی باوەڕی بەمە نییە بەڵکو باوەڕی بەشاری سۆفیزم هەیە کە هەناسەی گەرمی تێدایە. ئەمە وەکو بروسک و هەورە تریشقە وایە بۆ وەرام دانەوەی قسەی سارد و بەردی دەستی شێتان. ئەوەی مەحوی زۆر و ستەمی تێدا نییە ئەوەی ئەوان دروشمی زۆر و ستەم و خراپەیە. بەرقی مەحوی هەناسەیەتی ئەمە ئاشتی خوازانەیە، هێمنی و نەرم و نیانی تێدایە، بەپێچەوانەوە بەردی دەستی شێت شەڕ خوازانەیە و شەق و ئێش و ئازاری تێدایە. بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە مەحوی دەڵێ:

شوکور هوشیارە (مەحوی) تێ دەگا دنیا خەراباتە
کە بەد مەستی بکا ئەهلی خراپەی بۆچی لێ دەگرم

دنیا شاری دەستوور و دەسەڵاتە، مەیخانەیە خەڵکەکەی بەدمەستن نووستوون، بێ ئاگان بەڵام مەحوی شاری سۆفیزم مەستی بادەی کردگارە، هوشیارە ئاگادارە نانوێ ئیتر چۆن دەبێ یەکێکی هوشیار ناهوشیارێک تاوانبار بکا!

مەحوی لەم بەشە شیعرەیدا خۆی وەکو سۆفییێکی سۆفیزم (ئیسلامی و کۆزمۆسی) پیشان دەدا، داهێنان و وێنە شیعرییەکانی دەچنە ناو ڕەمزی ڕۆمانتیکیی ئەدەبی گێتی و شێوەییێکی مرۆڤایەتی وەردەگرن.

## شیعری وەسفی سۆفیزمی مەحوی

**١**

مەحوی ئەگەر لە بەشی «شیعری سۆفیزمی» دا نوێنەری داهێنانی سۆفیزم بێ. لە شیعری سۆفیزمدا تەریقەت و شەریعەت تێکەڵ بەیەکتری دەکا بۆ چاکەی شەریعەت، وەکو لەم شیعرەدا دەردەکەوێ:

ڕێگەی هودا تەریقەتی عیشقە دەمە حویا
وەرن پیا بڕۆن و (صلوا علی الرسول)

لێرەدا مەحوی خۆی وەکو واعیزێک پیشان دەدا نەک وەکو سۆفی، کارەکەی ئاسان کردووە ڕێگەی ڕاست خۆشویستنی پێغەمبەرە دەبا سەڵەوات لە دیداری پێغەمبەر بدەین و بەو ڕێگەیە بۆی بڕۆین.

**٢**

مەنسووری هەلاج جێگەییێکی دیاری داگیر کردووە لە شیعری مەحویدا و بەڵگەی

خۆبەختکردنە لە پێناوی بیروباوەڕ و ئیدیۆلۆجی، مەحوی لێرەدا وەکو سۆفییێکی ڕاست مەنسووری هەلاجی کردووە بەڕەمز بۆ خۆی بەپێچەوانەی هەندێ مەلا و پیاوی ئایینی موسڵمان کە مەنسووری هەلاجیان بە«بەدخوو» لەقەڵەم داوە. لەم بابەتەوە دەڵێ:

موحەققەق هەر کەسێ مەسلەکیە حەقق و حەققییە مەنزوور

سولووکی چوونە سەرداره تەریقەی پیرییە مەنسوور

گەڕان بەشوێن ڕاستیدا کردنەوەی سۆفییە، کۆمەڵی قانوون و دەستوور ڕاستیی ساغ کردۆتەوە و باوەڕی بەداهێنان نییە لەبەرئەوەیە مەنسووری هەلاج لە سێدارە دەدا چونکە دان بەداهێنان و ڕاستییەکەی ئەو ناهێنێ. بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە مەحوی دەڵێ:

لە ئولکەی عیشقدا هەر کەسێ سەرداریيە مەنزوور

عولووی مەرتەبەی سەرداره بۆتە پەیڕەوی مەنسوور

لە وڵاتی عیشقدا کە سۆفی لە مەحبووب دەگەڕێ ئەنجامی سێدارەیە، بەمە لە ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە پلەی بەرز دەبێ. لەکاتی هەڵواسیندا لەشی دەکەوێتە سەرووی ئادەمیزاد و وەکو مەعناش لەشی لەناو دەچێ لە پێناوی بیروباوەڕدا، دیارە ئەمە دەبێتە ئیدیۆلۆجی و تەریقەت کە بەناوی مەنسووری هەلاجەوە خۆی دەنوێنی.

«حەق»ی مەنسوور هەلاج بووە بەڕەمز و بەڵگە و پێڕەو و قوتابخانە بۆ مەحوی:

بەحەق هەر حەق بەناحەق ناحەقم وتووە لە ڕۆژی بووم

وەکو مەنسوور ئەگەر بیشمکوژن ناکەم لە حەق لادەم

شاعیر لە حەق لانادا ئامادەیە بۆ ئەوەی ئەنجامی ئەویش وەکو ئەنجامی مەنسوور بێ.

لە حەق بێژی بووە بەحری (انا الحق) هەر قەسیدێکم

لەباتی جائیزە واجیب گەڕا قەتڵم بکەن واجیب

دیارە شاعیر ئەوەش دەزانێ کە ئەوەی حەق بڵێ دەبێ پاداش بکرێ بەڵام نەک پاداش ناکرێ و لێی دەگەڕێن بەڵکو لەناویشی دەبەن، ئەمەیە زۆرانبازی و چوونە مەیدان لە نێوان دەستووری خاوەن دەسەڵات و ڕاستی و داهێنان و دۆزینەوەی سۆفیزم.

### ٣

لەم ماوەیەدا تەنیا مەنسووری هەلاج یاری مەحوی نییە بەڵکو یاری دیکەش دەدۆزێتەوە، ئەمانە ڕەمز و بەڵگەی تری سۆفی و دەروێشانن بەشێکیان پێوەندیان بە دەروێشیزمەوە هەیە، لەبەر ئەوەیە لە چوارچێوەی شیعری وەسف ناچنە دەرەوە و ئەو وێنە داهێنراو و ڕەمزییانیان نییە. شاعیر دەڵێ:

قــاتی پیــاوه لەســەر ئەم ئەرزە دەبینێ مــەنســـوور
بــەســـــــــــــەری دارەوە زەنــنــوونــە لــەبــن زیــنــدانــا

لێرەدا شـاعـیـر ئەو ڕاسـتـییـە دەخـاتە ڕوو کـە چۆن لەسـەر بیـروڕا و ئـیـدیۆلۆجی تـایبـەتی دژ بەدەسەڵات مەنسووری هەلاج لە سێدارە درا و زەننوونی میسری[٨] خرایە زیندانەوە.

نەگــــەیمە ئـەو جـــوانـە و گـــــەیمە پـیـــــری
مــــــەدەد یـا پـیــــری پـیـــــرانی بـوخــــــارا

واتە لەسەردەمی ئەلاوە (مەنسووری هەلاج) نەژیام بەڵکو کەوتن پاش سەردەمی پیری پیرانی بوخارا کە بەهائەدینی نەقشبەندی شێخی تەریقەتی نەقشبەندییە کە مەحوی خۆشی ئەندامێکی ڕێکخراوی ئەو تەریقەتەیە. لە شیعری تریدا دەڵێ:

خـۆشی فــەرمــوو چ مــەجنوون و چ مــەنســوور
بـەشـی عـــــــــــاشق درا هـەر بـەرد و هـەر دار

«لەیلا»ی مـەجنوون و «حـەق»ی مـەنسـووری هەلاج یەک شـتـە لە پێناوی نزیک بوونەوە لەو شتە و تووانەوە لە ناویدا، مەجنوون بەردە باران کرا و مەنسووری هەلاجیش لە سێدارە درا.

## ٤

هەمـوو تازە کـەرەوە و داهێنەر و شـۆڕشگـێـڕێک کـە دەیەوێ گـۆمی مـەند بشلەقـێنی تاوانێ گـێـرەشـوێنـێ و تێکدانی شـیـرازەی کۆمـەڵ و شـتی دەدرێتـە پاڵ. ئەوەی لە شاری دەسـتـوورا لە قانوون بچێتە دەرەوە بەشێت دادەنرێ. بالوولی دانا شێت بوو مەحوی باس لە شێتێکی سلێمانی دەکا:

ڕەحە بەو شێتییە ئەلحەق قسێکی عاقلانەی وت
منم عاقڵ لە بەرگی عارییە خۆمم کە عاری کرد

ئادەمیزاد بەڕووتی خولقاوە، جلوبەرگ جەوهەری ئادەمیزاد دادەپۆشی کەچی ئەوەی بگەڕێتەوە سـەر ئەسڵـەکە و وەکـو ڕەحە بەڕووتی بگەڕێ بەشـێت لە قـەڵەم دەدرێ بەڵام دیارە هەر ڕەحەش ڕاست دەکا چونکە خۆی لە شتێکی سەپێنرا و بەسەریدا (کە جلوبەرگە) ڕزگارکرد. دیسانەوە لە بابەت شێتییەوە دەڵێ:

جونوونی نەو زوهوورە (مەحویا) دێوانەگی مەنسوور
کە دێوانەن هەموو مائیل بەبەرد ئەو مەیلی داری کرد

شـێـتـیـی مـەنسـووری هەلاج لەبەرئەوە بوو بەرهەڵسـتی کـۆمـەڵێ قـانوون و دەسـتـووری کـرد ئەنجامی گەیاندە سەر قەنارە کەچی شێتی تر بەرد کۆ دەکەنەوە و دەیگرنە یەکتری.

مەحوی لەو دێرانەیدا ئەگەرچی لە رووی ئیستێتیکییەوە نەگەیشتۆتە پلەی شیعرەکانی تری لە بابەت سۆفیزمەوە بەڵام گیانێکی فێرکردن (تعلیمی)ی داوەتێ و هەندێ لایەنی مێژووی سۆفیزم و نەریتی تەریقەتی روون کردۆتەوە.

**شیعری دژی دەروێشیزمی مەحوی**

مەحوی لەم جۆرە شیعرەیدا زیاتر وەکو دادپەروەرێکی کۆمەڵایەتی و دڵسۆز، مرۆڤایەتی و لایەنگیری مافی ئادەمیزاد خۆی پیشان دەدا. بێگومان ئەم جۆرە شیعرانە شێوەی شیعری فێرکردن (تەعلیمی)یان وەرگرتووە، لێرەدا شاعیر تەماشای لایەنی ڕەشبینی بزووتنەوەی دەروێشیزمی کردووە بەتایبەتی لە سەردەمی ئەودا دەورێکی گەورەی بووە لە دواکەوتنی کۆمەڵ لەبەر ئەوە هێرشی بردۆتە سەر ڕەوشتیان و ڕەخنەی لە کردەوەیان گرتووە لەم جۆرە شیعرانەیدا زاراوەکانی شێخ سۆفی[٩] دەروێش واعیز زاهید... بەکاردێنێ. لە شیعرێکیدا دەڵێ:

که شێخ و واعیز و سۆفی بەجەننەت بەن گەد و گیپاڵ
دەبێ ئەمساڵی ئێمە بۆ جەهەننەم بەن سروسیپاڵ

شێخ و واعیز و سۆفی ڕاست گەد و گیپاڵی نابێ بەپێچەوانەوە لەڕولاواز سروسیپاڵی لەبەرا دەبێ کەوابێ ئەمانە ڕاست نین و درۆ دەکەن، ئیتر کە ئەمانە جێگەیان بەهەشت بێ پێویستە هی وەکو مەحوی جێگەیان دۆزەخ بێ، بەڵام مەحوی بەهەموو جۆرێ ئەنجام بەپێچەوانەی ئەمە دەزانێ.

ڕیش و پرچ هێشتنەوە کە ڕەمزی دەرەوەی سیمای دەروێشانە دەبێتە هۆی ئەوەی مەحوی پەیکەری دەروێش لەگەڵ پەیکەری جوولەکە بەراورد بکا:

ڕیشێکی پان و تووکی بناگوێ درێژ و لوول
سۆفی لەدینی لادە بەدیمەن لە جوو دەکا

ئێمە دەزانین نەوەکو تەنیا جوولەکە بەڵکو هەموو موسوڵمانێک نرخیان لای مەحوی وەکو مەلا و شێخێک چەندە!

لە بابەت واعیز و زاهیدەوە مەحوی دەڵێ:

لالغاوەی واعیزا ئەمڕۆ مەوج ئەدا دەم پڕ لە کەف
ریشی قیروسیا کتێبی وەعزەکەی بوو بەتەرەف

مەحوی گاڵتە بەواعیز دەکا بەوەی ئەوەی دەیڵێ هەر دەیڵێتەوە، دەمی کەفی کردووە و بەڕیشیدا هاتۆتە خوارەوە، کتێبی وەعزەکەشی هەر ئەوەیە نەگۆڕاوە، بەدرێژایی ڕۆژگار نەکەمی کردووە نەزیاد، دوورە لە داهێنان و گۆڕان.

ئینجا دێتە سەر زاهید و سۆفی وەکو دوژمنی یەکتری و دەڵێ:

زاهیــد و ســۆفی بەشــەڕهاتن لەســەر تەزویر و شــەید
خــێــری ڕەندانە خــودا کــا بەتەرەف بێ هەر تەرەف

ئەمانە لەسەر کاری قەلب و چرووکێ خۆیان بەشەڕهاتن دیارە ژێرکەوتنی هەرلایێکی ئەم بێ بارانە قازانجی پیاوچاکانی تێدا دەبێ، ئەگەر هیچ کامێکیشیان سەرنەکەوێ باشتر.

لەبابەت زاهیدەوە دیسانەوە دەڵێ:

زاهیــــد خــــودا لە ناوی بەرێ ناوی عــــاشـــقــــان
بــۆچــی دەبـا ئــەوەنــدە خـــــــودایـا بــەبــێ ئـەدەب

زاهید بەڵگەی درۆیە عاشق بەڵگەی ڕاستییە لەبەر ئەوە زاهید ناوی عاشقان بەخراپە دەبا، ئنجا شاعیر ڕوو دەکاتە واعیز:

واعــــیــــــز لـەمـن بلّـێ بـەنـەزەر تـەعـنـە بەس بـدا
دیـنـی بتــــانە دیـنـی مـن ئـەو مـــــەزهەبی زەهەب

واعیزیش دیسانەوە لە عاشق دەدا بەڵام دەبێ ئەوە بزانێ کە عاشق مەحبووب (کردگار، بت، جوانی) دەپەرستی بەڵام واعیز زێڕ و سامان دەپەرستێ.

شاعیر دێتە سەر واعیز و دەڵێ:

بەدەفـعی سـیـخـنی کـردن لە زاهیـد ڕاغیـبی مـەی بوو
کـەچی سـاقی وتی: نادەم بەکـەم فـام ئەزمـەیی گـوڵ فـام

ئەگـەر زاهیـد بیـەوێ بێـتـە سـەر ڕێی ڕاست و داوای مـەی بکا سـاقی دەوران بادەی ناداتێ چونکە بەفێڵبازی داناوە و باوەڕی پێ ناکا.

ئەم بابەتە شیعرەی مەحوی دەچێتە ناو شیعری چاککردنی باری ژیانی کۆمەڵایەتی و زیاتریش بۆ فـێرکـردن و ڕێ پیـشـاندانی خـەڵکی بەکـاردەهێنرێ لە ڕووی ئیـسـتـێـتـیکیـشـەوە لە پلەی شیعرەکانی تری نییە.

***

ئەنجـام ئەوەیە کـە مـەحـوی شـاعـیـرێکی گـەورەیە، شـاعـیـریەتی زاڵە بەسـەر بیـروباوەڕ و ئیدیۆلۆجیەتی، لەبەرئەوەیە وەکو شاعیرێک کەوتۆتە ناو تەنگوچەڵەمەی بیرییەوە، لە ڕوخساردا هونەرەوە، ڕێکوپێکە بۆیە ئەگـەر دوو ڕای پێـچـەوانەی یەکـتـریشی بووبێ وەکـو ناوەڕۆک لە دەربڕینی هەردووکیاندا سەرکەوتووە.

**پەراوێزەکان**

(١) یارسانەکان (ئەهلی حەق) لە سەر ئەو باوەڕەن کە لە دەوری ئیسلامدا لە سەدەی دووەمی هیجری بالوولی دانا یەکەمین کەس بووە کە بیروباوەڕی یارسانی لە هەورامان تازەکردۆتەوە. هەندێ شیعری کوردیشیان بەناوی ئەوەوە لە بلاوکراوەی «دەورەی بالوول»دا نووسیوەتەوە بڕوانە: (صدیق صفی زادە، بزرگان یارسان،

تهران، ١٣٦١، ص٧ - ١٦).

(٢) هەندێ لە شاعیرانی سەدەی بیستەمی کورد کە شیعری دژی سۆفیزمیان هەیە ئەمانەن: شێخ محەمەدی خالیسی (١٩٢٥)، مەلا محەمەدی کۆیی (١٩٤٣)، بێکەس (١٩٤٣)، دڵدار (١٩٤٨)، شێخ سەلام (١٩٥٩)، مارف بەرزنجی (١٩٦٣) قانیع (١٩٦٥) جگەرخوێن (١٩٨٤)، هێمن (١٩٨٦).

(٣) مەبەستی ئەم باسە دەربڕینی بیروڕایە لە بابەت کارکردنی سۆفیزم بۆ سەر ئەدەبی کوردی بەگشتی و شیعری مەحوی بەتایبەتی لەبەر ئەوەی باسێکی مەیدانی پراکتیکییە لە دیوانی شاعیر بەولاوە هیچ کەرەستەیێکی تر نەبووە بەسەرچاوە بۆ ئەم باسە. بەڵام ئەگەر بەتیروتەسەلی لەسەر مەحوی بنووسرێتەوە پێویستە ئەو ڕاستییە بزانێ کە بەزمانی کوردی نزیکەی سەد سەرچاوەمان لەبەردەستدایە لە وتار و باس و لێکۆڵینەوە لە بابەت و مەحوییەوە لە ڕۆژنامە و گۆوارە کوردییەکان بلاو کراونەتەوە ئەگەرچی بەشێکی ئەم نووسینانە سەرپێیی و ڕۆژنامەگەریانەیە، بەڵام بەشەکەی تری نرخی خۆیان هەیە. ئەوەی شایەنی باسە ئەوەیە لەسەر داوای ئێمە دۆستی بەڕێز عەبدوڵڵا عەزیز ئاگرین بیبلۆگرافیای مەحوی پێشکەش کردین.

(٤) یەکێ لە ڕێبەر و شێخە گەورەکانی سەردەمی ئێستای تەریقەتی نەقشبەندی شێخ مستەفای نەقشبەندی هەولێرییە. بیروڕای ئەم شێخە تەریقەتی نەقشبەندی دەوردەکاتەوە لە شێخ بەهائەدینی بوخارییەوە (دامەزرێنەری تەیرقەتەکە) تا ئێستا ئەم بیروڕایە تەریقەتی لە پێناوی شەریعەتی ئیسلام داناوە بڕوانە: (الشیخ مصطفى النقشبندي، الطريقة النقشبندية طريقة محمدية، الطبعة الأولى، بغداد، ١٩٧٣ رسالة جوابية عن الطريقة النقشبندية (المحمدية) من حضرة الشيخ مصطفى النقشبندي في اربيل الي احد احبابه في مكة المكرمة).

(٥) بەڵگەکانی ئەم باسە هەموو بابەتەکانی سۆفیزم لە دیوانی مەحوی نەگرتۆتەوە، بەڵکو بەشێکە و بۆ نموونە هەڵبژێراون، ئەگینا بابەتی سۆفیزم لە دیوانی مەحویدا گەلێ لەمە زیاترە.

(٦) سەرچاوەی شیعرە هەڵبژاردەکانی ئەم باسە ئەمانەن:

١- دیوانی (اشعار محوی) سلیمانی ١٩٢٢.

٢- سۆزی نیشتمان شیعری چەند شاعیرێکی کوردستان دەسنووسی نەجمەدین مەلا سلێمانی ١٩٤٥ (ل٥٧٤).

٣- دیوانی مەحوی لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مودەریس و مەحمدی مەلا کەریم بەغدا ١٩٧٧.

بۆ ساغ کردنەوەی بەڵگەکانی ئەم باسە بەراورد لە نێوان تێکستی ئەم سەرچاوانە کراوە و ئەوەی بەڕاست زانراوە ئەویان بلاو کراوەتەوە.

(٧) ئەم شیعرەی مەحوی شیعرێکی شاعیری میسری سەلاح عەبدولەبوور (١٩٣١ - ١٩٨١)مان دێنێتەوە یاد کە بەداهێنانێکی بەرز بۆی لە قەڵەم دراوە. شاعیری میسری لە شانۆگەری «تراجیدیای هەلاجە»کەی دا لە گفتوگۆیێک لەگەڵ کردگار، کردار بە مەنسوور دەڵێ:

کوڕم تۆ هێشتا هەرزەی ئەو پێوەندی و کۆبوونەوانەی لە نێوان من و تۆدا هەبوون شتی نهێنی بوون بۆ ئاشکرات کردن!.

(٨) زوننوونی میسری سۆفییێکی گەورەی میسرییە یەکەمین کەس بووە زاراوەی (الوجد والحب)ی هێناوەتە ناو

سۆفیزمی ئیسلامییەوە. لەبەغدا بەزندیق تاوانبار کرا و خرایە بەندیخانەوە لە پاشانا موتەوەکیل ئازادی کرد و لە ساڵی (٢٤٥هـ-٨٥٩م) لە جیزەی میسر کۆچی دوایی کرد.

(٩) ئێمە لەم باسەدا «سۆفیزم» و «دەرویشزم»مان لەیەکتری جیاکردۆتەوە و بۆ مەبەستی لێکۆڵینەوە. بەڵام لەناو کوردەواری خۆماندا کە هەردوو تەریقەتە دەرویشییەکەی «قادری» و «نەقشبەندی» باوە، زاراوەی «دەرویش» بۆ ئەندامی ڕێکخراوی تەریقەتی قادری بەکاردەهێنرێ هەروەها «تەکیە»ش بۆ جێگەی کۆبوونەوەیان کەچی لای نەقشبەندییان «سۆفی» بۆ ئەندامی ڕێکخراوەکە و «خانەقا» بۆ جێی کۆبوونەوەیان بەکاردەهێنرێن.

***

## کە دڵ دەتوێتەوە

کــە دڵ دەتوێتــەوە بۆ تۆ، دەکــەی ئەو ڕۆژە تۆ بڕوا
کە خۆ دەرخەی وەکو خۆر دڵ وەکو شەونم لەخۆ بڕوا
کە ڕۆحم تێگەیی تۆ حەز بەدەرچوونی دەکەی، دەرچوو
دەبێ عــاشق کـــە دیی بێـــزارە یاری، بێ برۆ بڕوا
وتم: با لەم دەر و لەم کـۆیەدا ئانێ ســوکــوونەت کــەم
وتی: عــاشق دەبێ هەر دەربەدەربێ، کــۆ بەکــۆ بڕوا
ڕەقیبت دەرکا، ئەم بەردەرکا پاکە پیس ئەکا، فەرمووی:
کــە بەم بەرقــاپیــیــە لازم ســەگــێکی وایە، بۆ بڕوا!
وتی: «مــەحوی» من و تۆ ئافتاب و سایە تیمثالین
جــەنابی من کــە دەرکــەوتم، دەبێ تەشــریفی تۆ بڕوا

**مەحوی**

# مەحوی لە خوێندنەوەیەکی بەکاوەخۆی دیوانەکەی و چەند دێڕێکی بەرچاوکەوتووی کتێبی ژیانیا

**نووسینی: محەمەدی مەلا کەریم**

## پێشەکییەکی پێویست

چوار کۆڵەکەی گەورەی تائێستا ناسراوی تەلاری شیعری کوردی لەسەر شێوازی بابان وتراو، واتە بەدیالێکتی کرمانجیی خواروو و لەسەر سەنگ و ئاواز و بەترازووی شیعری عەرەبی و شیعری فارسی پاش هاتنی ئیسلام دانراو، بە ڕۆژگار و، بەبۆچوونی زۆرێ لەلێکۆڵەرەوان و توێژەرەوان بە پلەیش، کوردی و نالی و سالم و مەحوین. هەرچەندە بەر لە پێشترینی ئەمانەیش، کەم و بێشێک، شیعری بەم دیالێکتە و، بەم بەسەنگ و ئاواز و ترازووە -وتراو، لێرە و لەوێ، دۆزراوەتەوە، بەڵام هێشتا ئەوەندە و لەو چەشنە نییە ڤیزای پێ بەهیچ کام لە خاوەنە تاکوتەراکانی هیچ یەکێ لەو پارچە شیعرە تاکوتەرایانەی لەم جۆرە- بدرێ تابێتە ریزەوە و، ناڵێم ململانێ لەگەڵ ئایەختری، چ جایە لە پێشتری، یەکێ لەو چوارپایەیە بکا، بەڵکو تەنها بێ ترس و بێ پەروا، تەنانەت ئەگەر لە دوایشیانەوە بووە، بوەستێ. هێشتا مێژووی لێکۆڵینەوەی شیعری کۆنی کوردی و تاوتوێ کردنی لاپەڕە زەرد و پرتووکاو و تۆزاوییەکانی، دەرفەتی ئەم حەق و ئیددیعایەیان بۆ هیچ پارچە شیعرێکی تری کوردی بە شێوازی بابان وتراو، نەڕەخساندووە.

لەم چوارە، تا ئێستا، نالی و مەحوی و، بەتایبەتی نالی، چەردەیێ هەقی خۆیان دراوەتێ و، پاش لە چاپدانی تێروتەسەلی دیوانی ساغکراوە و لێکۆڵراوەیان بەدەست پێشخەریی جەنابی باوکم و یارمەتی فاتیحی ڕەحمەتی برام و بەندەی لە خزمەتتانا ئامادە و وەستاو و، نووسینی ژمارەیەکی باشی لێکۆڵینەوەی هەمەجۆرە و فرە بابەت لە شیعر و لە کەسایەتییان لە لایەن هەندێ لە ڕۆشنبیران و قوتابییانی ماجستێر و دوکتۆرای کوردەوە و، بەستنی گەلێ کۆڕ و کۆمەڵ و فیستیڤاڵ و سیمینار لە بارەیانەوە، پێم وا بەباشتر و لەجێتر ئەوەبوو کەوا بەش بەحاڵی ئەم دوو کەڵە شاعیرە، نالی و مەحوی، جارێ لەم ئاستەدا ڕاوەستابایـن و، لایەکمان بەلای براکانیانەوە، کوردی و سالم و، بەتایبەتی بەلای یەکەمیانا بکردایەتەوە. بەڵام وا دیارە زیاتر بەهۆی لەبەر دەستدا نەبوونی هێشتای نوسخەیەکی ساغکراوەی دیوانی هیچ یەکێ لەم دوو پایەی سێهەم و چوارەمەی شیعری بە شێوازی بابان، کەس پرکێشیی ئەوە ناکا بێتە ئەو مەیدانەوە. ئەم ئەڵێم بێ ئەوەی تۆسقاڵێ قەدری ئەو چەند بابەتەم کەم کردبێتەوە تا ئێستا،

زیاتر لە بارەی سالمەوە، نووسراون و بلاو کراونەتەوە(*).

ئەمجارە بابچینە کورۆکی مەبەستی سەرەکیمانەوە کە دوانە لە بارەی مەحوییەوە.

من کە لەکاتی خۆیا ماوەیەکی باشی تەمەنم بەخەریکبوون بەشیعری مەحوییەوە بەسەر بردووە و شەرەفی بەشداری کردنم لە ساغکردنەوە و لەسەر نووسینی دیوانەکەدا، پێ براوە، ئەمەوێ دەربارەی بۆچوونێکی خۆم سەبارەت بە مەحوی بدوێم کە لە پێشەکی دیوانەکەیشیا وردە هێمایەکم بۆ کردووە. بۆچوونەکەیشم ئەوەیە کە بەپێچەوانەی زۆر کەسەوە لەوانەی کەم و زۆر لە مەحوی دواون و لە بارەیەوە نووسیویانە، ئەم شاعیرە گەورە و جێگا دیارەی نەتەوەکەمان بەسۆفی و شاعیری سۆفییەتی نازانم و، لەم باسەدا ئەمەوێ بۆچوونی خۆم تا ڕادەیەک ڕوون کەمەوە.

ڕەنگبێ بەڵگەی ئەوانەی مەحوی بەشاعیری سۆفییەتی ئەزانن، ئەوەبێ کە هەم باوکی مەحوی خەلیفەی شێخ عوسمان سیراجەددینی تەوێڵە بووە و هەم خۆیشی خەلیفەی شێخ محەمەد بەهائەددینی کوڕی بووە. لە شیعرەکانیشیان لە دژی شێخ و سۆفی و زاهید و واعیز دوان، خۆی لە جیهانی سۆفییان ئالاندووە و لەوانەیە ئەوە بکرێ بەبەڵگە کەوا لای وا بووە سۆفییەتی ڕاستەقینە و نابێ کە ئەوانە ئەیکەن و، پشت بەپێوەندی خۆی و باوکی بەشێخانی نەقشبەندیی تەوێڵەوە، ئەوە بەنیشانەی سۆفییەتی بەڕاستی خۆی دابنرێ. لە دیوانەکەیشیا قسەی سۆفییانە و بەکارهێنانی ئیستیلاحاتی ئەهلی و تەسەووف لێرە و لەوێ بەدی ئەکرێ و، ئەمەیش بۆچوونەکەی ئەو برادەرانە بەهێزتر ئەکا.

من لە ئەنجامی خوێندنەوەیەکی وردی نوێی دیوانی مەحوی و چاوگێڕانێکی توێژەرەوانەدا بەژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی ناو شاری سلێمانی و دەوربەریدا و، بەهەڵسووڕانی ڕۆژانەی مەحوی خۆیا، ئەوەندەی چەردەیەکیمان ئاگا لێ بێ، هاتوومەتە سەر ئەو باوەڕە و، ئەمەیشم، با زۆر بەکورتیش بێ، لە پێشەکی دیوانی مەحوی خۆیدا درکاندووە. باوەڕەکەیشم ئەوەیە کە مەحوی خەباتکەرێکی سیاسیی ڕاستە ڕێگا دەرنەکردووە، لە دژی ئەو توێژاڵە کۆمەڵایەتییەی بەواقیعێکی دەرەبەگانە و لەژێر پەردەیەکی ئایینیدا بەسەر سلێمانیدا زاڵ بووە. من ئەمەوێ بێ پێچوپەنا قسە بکەم و باکەسیش لە خۆڕاییی لەمە زویر نەبێ و نەیهێنێتە سەر خۆی و، کەسیش ناچێتە گۆڕی کەس و تاوانی کەسێکی تر لە ئەستۆ ناگرێ و، مێژووی میللەتیش نابێ لەبەر بەرژەوەندی کەس گڵمژ بکرێ و بشێوێنرێ. خەباتی کۆمەڵایەتیی سیاسیی مەحوی لە پلەی یەکەما لە دژی کەسانێکی دەس ڕۆیشتوو لە بنەماڵەی شێخانی سلێمانی و داروەستەیان بووە، کە لە دێهاتا دەرەبەگ و لەناو شارا پیاوماقووڵی بەرگی ئایینی لەبەربوون و بەسەر شارا زاڵ بوون و چییان ئارەزوو لێ بووبێ توانیویانە بیکەن. سەرانسەری ژیانی تیووری و کرداریی مەحوی، پاش بوونی بەجێنشینی باوکی، بەم ڕاستییەوە بەندە.

سۆفییەتی بەواتا گشتییەکەی، کە دەروێشان و سۆفییانیش ئەگرێتەوە کە لە کوردستانی

ئێمەدا لە دێر زەمانەوە بە قادری و نەقشبەندی ئەناسرێن، لە وڵاتی ئێمەیش وەک لە هەر لایەکی تری جیهانی ئیسلام، لەمێژە، ئەگەر هەر لە دووهەم کەسی بنەماڵە شێخەکەیشەوە نەبووبێ، پاش دوو سێ وەچە لە ڕێی خۆی لایداوە و لەگەڵ چینی حوکمڕانی ناوخۆ و بیانی و دەوروبەریان لێک ئاڵاون. چینی حوکمڕان لەسەرانسەری جیهانا، هەزاران ساڵە لەسەر خوێنمژینی جەماوەری ڕەشوڕووت پەروەردە کراوە و ئەکرێ و، هەموو ئایین و مەزەب و ڕێبازێکی بۆ خزمەتی ئەم مەبەستە تەسکە چینایەتییەی خۆی دەسەمۆ کردووە و بەش بەحاڵی ئەو سۆفییانەی ڕێبازەکەیان نەکردووە بەمیراتی بنەماڵەی خۆیان، کە بۆ خۆی جۆرێ بووە لە ئایدیۆلۆژیی بەربەرەکانێ کردنی جەوروستەمی حوکمڕانان و، مێژووی خوێناویی چەوساندنەوە شایەتێکی دەنگ هەڵبڕیوە کە زۆریان لەسەر حەقبێژی لێکراوە بەدارا وەک هەموان باسی مەنسووری حەللاج و سەدای (انا الحق)ەکەییان بیستووە، یا لەژێر ئازار و جەزرەبەدا بەسزا کوژراون وەک عیمادەدینی نەسیمی و شێخ بەدرەددینی کوڕی قازیی سیماونە و دەیانی ناسراو و نەناسراوی تر، بەداخەوە لەبەر ناهاوسەنگیی تەرازووی هێز، لە بەشی زۆری حاڵەتەکانیا، تێکۆشانەکەی تێکۆشانێکی سەلبی و دوورە پەرێزانە بووە و ویستوویە پەیڕەوانی خۆی نەک هەر لەدەوربەری حوکمڕانی، بەڵکو لە سەرانسەری مایەکانی خۆشیی دنیایش دوورخاتەوە و، ئەمەی بەشێوەیەک لە دەربڕینی بێزاری لە دەستگرتنی حوکمڕانان بەسەر هۆیەکانی هێنانە بەرهەمدا داناوە، لەکاتێکدا کە ئەبوو، لە جیاتی ئەو جۆرە تێکۆشانە، بۆ داماڵینی دەستی حوکمڕانان لە هۆیەکانی هێنانە بەرهەم و خستنە دەستی جەماوەری ڕەشوڕووت هەوڵ بدا و تێبکۆشێ... لەگەڵ ئەمەیشا سەرەنجام حوکمڕانان زەفەریان یەک لە دوای یەک بەبەشی زۆری ئەڵقەکانی بردووە و دەستی خۆیان تێکێشاوە و کردوویانە بەلقێکی ئایینیی ڕژێمە خوێنمژەکانیان... سەرانسەری مێژووی بەشی هەرەزۆری بنەماڵە سۆفییەکان -بەواتا گشتییەکەی زاراوەی سۆفییەتی، واتە دەروێش و سۆفی-، وەک وتمان، پاش وەچەیێ دوانیان، بەم ڕێچکەیەدا ڕۆیشتوون، تەنها ئەوانەیان لێدەرکەی کە لەبەر بارودۆخی شوێنیان ڕێیان وا نەڕۆیشتووە و بەخاوێنی ماونەتەوە، لەبەرئەوەی بەخاوێنی ماونەتەوە و لەگەڵ جەماوەرەکەیان پێک شێلراون، ڕێگای تێکۆشان بۆ میللەتیان گرتووەتە بەر و توخنی چینی حوکمڕان نەکەوتوون.

لێرەدا ئەبێ ئەوەیش بڵێین کە دیارە هی وایشیان بووە پاش ئاڵان لە دنیا و لە حوکمڕانانەوە، ئەوەندە جێ پێیان پتەو بووە بەکەڵک وەرگرتن لەو وەزعەی بۆیان لواوە و لەو بارودۆخەی گەلەکەیانی تیا ژیاوە، بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ سەربەخۆ هاتوونەتە مەیدانی دنیا و سیاسەتەوە و بوون بەسەرکردەی نیشتمانی و شۆڕشگێڕی میللی. مێژوی نوێی کورد نموونەی هەردوو جۆرەکەی تیایە کە بۆ جۆری یەکەمیان بنەماڵەی شێخانی بارزان و بۆ دووەهەم ڕاپەڕینی شێخ مەحموودی نەمر ئەکەین بەنموونە.

عوسمانییە بەدرۆ موسوڵمانەکان لە کوردستانیشا، وەک لە هەر لایەکی ئەمپەراتۆریەتە پان و

بەرینەکەیانا ، بەتایبەتی لەو سەردەمەوە کە گلۆڵەیان کەوتبووە لێژی و گەلان لە هەموو لایەکەوە لێیان ڕاست بووبوونەوە و پایەی کۆمەڵایەتییان شەق و شڕ بووبوو ، سیاسەتی خانەقا و تەکیە کردنەوە و دێهات و جۆگا و زەویوزار تەرخان کردن بۆیان و بۆ شێخەکانی سەرپەرشتی کەریانیان بەناوی درۆزنانەی وەقفەوە ، بەبەرفراوانییەکی بێ ئەندازەوە گرتبووەبەر. خەباتی مەحوی لە بەشێکی زۆری شیعرەکانیا لە دژی ئەم توێژاڵە کۆمەڵایەتییە دژ بەبەرژەوەندی جەماوەری گەلە بووە.

بێینەوە سەر کۆڵینەوە لە مەحوی:

مامۆستا شێخ موحەمەدی خاڵ لە کتێبی (مفتی زەهاوی)دا ئەیگێڕێتەوە کە مەحوی لە ساڵی ١٨٧٤دا لەگەڵ چەند مەلایەک لە سلێمانی دوورخراوەتەوە و نەفی کراوە بۆ بەغدا. شێخی خاڵ هیچی تری لە بارەی ئەم نەفی کردنە و هۆیەکەی و چۆنیەتیی گەڕانەوەی لەوەپاشیەوە بۆ سلێمانی نەنووسیوە. مامۆستا سەجادیش ئەیگێڕێتەوە کەوا مەحوی لە ١٨٨٣دا سەفەری حەجی کردووە و لە ڕێگای (هەندێ) لە پیاو ماقووڵانی کوردەوە لە ئەستەمووڵ چاوی بە سوڵتان عەبدولحەمید کەوتووە و سوڵتان زۆری حورمەت گرتووە و فەرمانی داوە خانەقایەکیان لە سلێمانی بۆ کردووەتەوە کە ئەوەیە ئێستا بەخانەقای مەحوی بەناوبانگە و ، مەعاشێکیشی بەناوی خزمەتکردنی هەژارانەوە بۆ بڕیوەتەوە و ، کە گەڕاوەتەوە بۆ سلێمانی، تا کۆچی دوایی کردنی لە ١٩٠٦دا بەدەرز وتنەوەی فەقێیان و خزمەتکردنی موسوڵمانانەوە خەریک بووە.

من، پشت بەو خەباتە سەختەی مەحوی لە دژی ئەو بەشە شێخانەی سلێمانی کە شێخایەتییان بۆ مەبەستی دوور لە سۆفییەتی ڕاستەقینە خستووەتە کار و ، لە دیوانی مەحویشیا نیشانە و بەڵگەی بەزەقی لەبەر چاوە و ، ئەو ئەندازە پێوەندییەی پاش سەفەری ئەستەمووڵی بەدەربار و بارەگای خەلیفەی عوسمانییەوە بوویەتی و ، ئەو ئەندازە زانیارییەی لەبارەی وەزعی ناو شاری سلێمانی و دەوروبەری و کێشەی کۆمەڵایەتیی نێوان دانیشتوانی شار هەمانە ، ڕێگە بەخۆمان ئەدەین نەخشەی ڕەوت و گەشەکردنی چالاکیی کۆمەڵایەتی و سیاسیی مەحوی بەم جۆرە بکێشین.

مەحوی لە سەرەتای هاتنە مەیدانی مەلایەتی و خەلیفەیەتیی شێخ بەهائەددینا ، وەک مەلایەکی بەرجەستە و خەلیفەی شێخێکی بەرجەستەی تەریقەتی نەقشبەندی، بەرەو ڕووی چەندین کێشەی گەورە بووەتەوە. لەلایەکەوە کێشەیەکی مێژوویی لە نێوان بەشێکی زۆری مەلایانی شەریعەت ڕاگر و شێخانی قادریی تێکڕا لەم بارەوە ساردداا بووە و گەرم بووە و ، هەروا لەو سەرەمەدا هێشتا کێشەی نێوان شێخ مارفی نۆدێی باپیرە گەورەی شێخانی سلێمانی و مەولانا خالیدی نەقشبەندی پیری شێخ عوثمان باوکی شێخ بەهائەددینی پیری مەحویدا، کە یەکەم واتە شێخ مارف نامیلکەیەکی لەبەر کافر دەرکردنی دووهەم واتە مەولانادا نووسیوە و ، مەسەلەکە بووە بە هەرا و کێشەیەکی گەورە لە نێوان مەلایانی کوردستان و بەغدا و مووسڵ و

تەنانەت حەلەب و شام و ئەستەموولیشا و، بەشی زۆری مەلایان، ئەوانەیان نەبێ لە دیدگای میریییەوە مەترسییەکیان لە مەولانادا هەست پێ ئەکرد، کە ئەویش بۆ خۆی بابەتێکە بۆ کۆڵینەوە لەو بیرەی مەولانا لە مێشکیا پەروەردەی کردووە و، من یەکەم جار لە ۱۹٦۷دا کورتە وتارێکم لە تەئاخیدا لەسەری بڵاو کردەوە و تووشی گێرە و کێشەیش هاتم لەسەری و، ئێستاش باسێکی قووڵم لەبارەیەوە هەیە چاوەڕوانی دەرفەتێکم لەبارم تا بڵاوی کەمەوە، هێشتا ئەو کێشەیەش لە ئارادا بووە. دیارە ئەبوو مەحوی، چ وەک مەلایەک و چ وەک خەلیفەیەکی نەقشبەندی، جێی خۆی لەو کێشەیەدا لەبەرەی مەولانادا بدۆزێتەوە.

ئەمەی وتمان، تێکڕا، زەمینەیەکی لەبارە بۆ سەرهەڵدانی کێشە لە نێوان مەلایانی سەر بەشێخانی نەقشبەندی و شێخانی قادریدا، بەتایبەتی دوای ئەوەی سەردەمی تەریقەتدرایی شێخانی قادری لە سلێمانی بڕایەوە و شێخان ڕوویان کردە دنیاداری و دەوری نەقشبەندییەکان کەوتبووە گەشەکردنێکی زۆرەوە.

ئاشکرایە مەحوی کە مەلایەکی گەورە و پایە بڵند بووە و ئیجازەی مەلایەتیی لەسەر دەستی زانای کوردی بەناوبانگ مفتی زەهاویدا وەرگرتووە، لە سۆنگەی نەقشبەندییەتەکەی خۆیەوە و بە کۆنە قینی نێوان شێخ مارف و مەولانای پیری شێخ عوسمانی مورشیدی باوکییەوە لە بەرانبەری ئەو بەشە شێخزادانەی سلێمانیدا شیری ڕەخنەی بەشیعری هەڵنەبڕیوە، نەخوازەڵا کە تەنانەت شێخ مارفی نودێ خۆیشی پاش هەڵاتنی مەولانا لە سلێمانی و نەمانی ئەو مەترسییەی کە وەک خاوەن تەریقەتی نوێ بۆ قادرییانی بووە و لە بارچوونی ئەو هیوا و ئاواتانەی لە دڵیابوون لە کوردستانا خەریکی هێنانەدییان بێ، لەو تاوانبارکردن و بەکافردانانەی مەولانا پەشیمان بووەتەوە و مەعزەرەت نامەی بۆ نووسیوە و دانی بەهەڵەی خۆیاناوە. تاقانە هۆی ئەو ناڕەزاییییەی مەحوی لە دڵ و دەروونی خۆیا بەرانبەر بەو جۆرە کەسانەی هەست پێکردووە ڕاستگۆیی و پاکیی خۆی بووە بەرانبەر بەخواوەند و ئەو ئایینەی باوەڕی پێ بووە و دڵسۆزی بووە بۆ ئەو خەڵکە چەوساوە و ڕەشورووتەی شار و دەوروبەری. مەحوی ڕەوشتی دوور لە شێخایەتیی ڕاستەقینەی ئەو هەندە کەسە بەدەسەڵاتانەی دیوە و لە نزیکشەوە وەک ڕۆڵەیەکی ڕەسەنی شاری سلێمانی و خاوەن پێوەندییەکی قووڵ لەگەڵ جووتیاران و ڕەزەوانانی لادێ خۆی لەبەرەی ئەو جەماوەرەدا دیوەتەوە و کەوتووەتە پەردە هەڵماڵین لە ڕووی ئەو ئایین بۆ سوودی خۆخستووە کارانە و کوتانیان بەکوتەکی شیعرە توند و توون وتیژەکانی.

بەڵگەیەکی تریشمان بۆ ئەم ڕاستییە کە ئەوەتە مەحوی هەرگیز لەسەنگەری نەقشبەندیگەرییەوە نا بەڵکو لە سەنگەری مەلایەتی و موسوڵمانەتییەوەی ئەم ئەرکەی لە ئەستۆ گرتووە، ئەوەتە لە دژی هەموو توێژاڵە چەوسێنەوە و مفتەخۆرەکانی لای وایە ئەوەی حەق پەرستە و لە حەق ئەگەڕێ لەبنەوەیە و ناکەس و ماستاو ساردکەرەوە کاروباری دنیا ئەگێڕێ... تەنانەت سڵ لە بەدوتنی کاربەدەستان و حوکمڕانایش ناکاتەوە و شانازی بە هەڵوێستی مەنسووری

حەللاجەوە ئەکا کە لە پێناوی حەق بێژیدا چووەتە سەردار و خۆی بەپێڕەوی ڕێگای ئەو ئەزانێ.

بەڵام ئەوەی لەم مەیدانەدا سەرنج ڕائەکێشی ئەوەتە لەناو ئەو هەموو شاعیرانەدا، بە مەلا و نامەلایانەوە، بەدەگمەن کەسێکی وەک حاجی قادری کۆیی دەسگیر ئەبێ هەست بەپێوەندی ئۆرگانیی نێوان ئەم توێژاڵە خەڵک خەڵەتێنن و چەوسێنەوە و مفتەخۆر و ناحەق پەرستانە و ڕژێمی حوکمڕانیدا بکاو تێبگا کەوا ئاو لە سەرچاوەوە لێڵە و هێڵی لار لە هینی گای پیرایە.

ئەبێ ئەو نەفی کردنەی مەحوی لە سلێمانی لەگەڵ کۆمەڵێ لە مەلایانی شاردا بۆ بەغدا کە مامۆستا خاڵ بەداخەوە بەکورتییەکی ئێجگار کورتەوە باسی لێ ئەکا، ئەنجامێکی ئەو تێکۆشانەی مەحوی و هاودەنگەکانی بووبێ و، میری لەبەر ڕاگرتنی پێوەندی خۆی لەگەڵ ئەو دەسەڵاتدارانەی شار لەلایەکەوە و، لەبەر مەترسیشی لە کارایی شیعر و چەندین جار زۆرتر و زیاتر قسەی مەحوی لەناو کۆمەڵدا لە دژی ئەوانە لەلایەکی ترەوە، خۆی بەناچار زانیبێ مەلایەکی گەورەی وەکو مەحوی و کۆمەڵە مەلایەکی هاودەنگی بەزۆر لەشار دوور بخاتەوە و لە بەغدا نیشتەجێیان بکا، ئەو مەحوییەی کە ئەوەندە پایەبەرز بووە خەلیفە خۆی پاش چەند ساڵێک پێشوازیی لێکردووە و هێناویەتە حوزووری خۆی و مانگانەی بۆ بڕیوەتەوە و خانەقای لە سلێمانییە لێ نەفی کراوەکەیا بۆ کردووەتەوە.

ئاشکرا نییە سەفەری حەجی مەحوی پاش گەڕانەوەی بووە بۆ سلێمانی لە نەفیی بەغداوە، یا لە بەغدا ماوەتەوە تا سەفەرەکەی حەجی کردووە. بەهەرحاڵ، لە هەر کوێوە چووبێ بۆ حەج، پاش لێبوونەوەی لە حەجەکەی لە مەککەوە ڕێگەی ئەستەموولی گرتووەتەبەر و، زۆرتریش لەوانەیە کەسانێک هانیان دابێ بۆ ئەم سەفەرە و هەر ئەوانیش لە ئەستەموول دیدارێکی سوڵتانیان بۆ ڕێکخستبێ و، لەوەیش ئەچێ ئەم کارە بەلێکۆڵینەوە و بڕیاردانێکی پێشتر ڕێکخرابێ و، بە هۆی ئەوەیشەوە بوو بێ کە ئالۆزیی وەزعی ناوشاری سلێمانی بەهۆی لە جڵەوگرتن دەرچوونی ئەوانەوە بووبێ کە باڵی دەسەڵاتی ڕاستییان بەسەر ناو شارا کێشابوو و بەڕێوەبەرێتیی میرییان ئیفلیج کردبوو. بۆیە ئەستەمۆڵ پێویستی بەدژە هێرشێک بووە بۆ سەر ئەوانە و، یەکێ لەوانەیش کە بۆ ئەم کارە پەنجەیان خراوەتە سەر مەحوی بووبێ و هەر بەم مەبەستەیش بووبێ خەلیفە چاوی پێ کەوتووە و پێشوازی لێکردووە و وەک وتمان فەرمانی داوە خانەقایان بۆ کردووەتەوە و مانگانەیان بۆ بڕیوەتەوە و پشتیوانی لێکردنی مەعنەویشیان پێ بەخشیوە.

ئەمجارە ئیتر مەحوی بەگوڕێکی نوێوە و بەدید و بۆچوونێکی نوێوە ئەگەڕێتەوە بۆ شار و پەرە بەخەباتی قۆناغی یەکەمی ئەدا و لە جاران بێ ترستریش پێیەوە خەریک ئەبێ. لەم بارەوە بە دووری نازانم مەحوی پارچە شیعری:

خەڵاصی بوونی قەت ناوێ ئەسیری زوڵفی زنجیرت
لەبەر تیرت، مەلەک بێ، هەڵفڕینی نەبووە نەخچیرت

وتبێ، کە لە دوا بەیتیا ئەڵێ:

فەضیلەی ئەصل و فەصڵ ئینسانی پێ نابێ بەصاحیب فەضل

کە تۆ کۆسەی، بەتۆ چی، مامە، ڕیشی باب و باپیرت!

ئەگێڕنەوە گوایە یەکێ لە شێخەکانی شار کە بۆ خۆی کۆسە بووە، کە ئەم شیعرە ئەبیسێ، هەڕەشە ئەنێرێتە سەر مەحوی کە واو وای لێ ئەکەم. ئەویش لە وەڵاما هەر ئەوەندە ئەڵێ: من بەرگدوورم، جبە ئەبڕم هەرکەس جبەم بەشایانی قەد و باڵای خۆی ئەزانێ با لەبەری کا! بەڵگە هێنانەوەکەیشم بەم شیعرە لەوەوەیە بێ پێچووپەنا توانجی تیا گیراوەتە ئەو کەسەی بۆی وتراوە و ئەمە زۆری جیایە لەوە گاڵتە بە بەناو خواناسێکی درۆزن بکرێ بێ ئەوەی کەس بەزەقی بزانێ مەبەست لەو خواناسە درۆزنە کێیە. ئەمەیش دیارە بەرهەمی قۆناغێکە شاعیر لەو قۆناغەدا بەتەواوی پشتی قایم بووە.

بەم جۆرە مەحوی درێژە بەم خەباتەی خۆی ئەدا و تەنها بە بەناو شێخانی ئایین فرۆشەوە ناوەستێ، بەشێکی زۆری تریش لە توێژاڵە مفتەخۆرەکانی شار لە بازرگانانی سوود و سەلەم خۆر و لە کەسانی ساختەچی و ماستاوکەر و خۆ لە حوکمڕانان هەڵسوو، هەروا لە ناتەواوییەکانی ناو کۆمەڵ و لە توێژاڵە دەسەڵات بەدەستە ستەمکارە لە خۆبایییەکان و، بەڵکو لە هەر کەس بەشایانی ڕەخنە لێگرتنی بزانێ، هەموویان ئەگرێتەوە و پەردەیان لە ڕوو هەڵئەماڵێ...

بەداخەوە من لێرەدا لەبەر تەسکی مەودا دەرفەتم نییە، ئەگینا هەندێ لە شیعرە تاڵ و بەگەرووداکەر وگورچکی ناپاکان بڕەکانیم بۆ ئەخوێندنەوە. ئەوە زۆر خۆشتر و بەجێژتر ئەبوو تا ئەوەی یەکێ بچێتەوە بۆ ماڵەوە دەست بەرێ دیوانەکەی مەحوی، ئەگەر هەیبێ، لە تاقی کتێبخانەکەی بهێنێتەوە خوارەوە و بگەڕێ پارچە شیعرێ هەڵبژێرێ و بۆ خۆیی بخوێنێتەوە.

***

شتێکی ئاشکرایە بۆ ڕەوایی هەر ڕەخنەیێ لە هەر کەسێ یا لە هەر لایێ ئەبێ ئەو ڕەخنەیە بەگوێرەی سەنگ و ترازووی باوی ئەو سەردەمە ڕەوابێ کە ئەو کەسە یا ئەو لایەنە ئەو کارەی تیاکردووە کە ئەویستری ڕەخنەی لێ بگیرێ، ئەگینا کەس بۆی نییە کەسێ لەسەر هەڵەیێ تاوانبار بکا کە لە سەردەمی ژیانی ئەوکەسەدا هەڵەیەتیی هەڵەکە، مەگەر بۆ کەسانی دووربینی پێش سەردەمی خۆیان کەوتوو، لەوانە نەبووبێ بەبیر و خەیاڵی تێکرای خەڵکەکەدا هاتبێ. جا ئاخۆ ئێمە بەم پێودانە دروستە و بۆمان هەیە ئەمڕۆ، لەگەڵ هەموو قەدر لێگرتن و شانازییەکمان بەهەڵوێستی ڕەخنەگرانە و پەردە لە ڕوو هەڵماڵانەی مەحوی لە ئاستی گشت ئەو توێژاڵانەی کۆمەڵدا بوویەتی کە لەگەڵ بەرژەوەندی جەماوەر و ڕێبازی ئینسانی و ئیسلامی ناجۆر بوون، ڕەخنەی لێ بگرین؟... ئاخۆ لە ژیانی مەحویا مایەیەک ئەدۆزینەوە بۆ ئەوەی پەنجەی ڕەخنە و گلەیی لە ڕووی خۆیشیا هەڵبڕین؟

مەحوی، مەلای گەورە و خەلیفەی شێخی بەهائەددین کە خاوەنی دەیان پارچە شیعری شاکارە لە دژی زۆر لە نارەواییەکانی ناو کۆمەڵ... کە ئاگاداری دەنگوباسی دنیابووە و، هەواڵی شەڕی رووس و ژاپۆنی زانیوە و، خەبەری کوژرانی ناسرەددین شای قاجاری بیستووە و، بەچاوی خۆی ئەستەموولی بینیوە و ماوەیێ لەوێ ماوەتەوە و زۆر لە کۆچکردووانی سلێمانی لەوێ دیوە و گەلێ جۆرە قسە و باسی لەوێ بەرگوێ کەوتووە، عەقڵ نایبڕێ ئاگای لە دەنگوباسی خەباتی ئازادیخوازانی هەر هیچ نەبێ ولاّتانی ئیسلام نەبووبێ لە پێناوی سنوور دانانا بۆ حوکمی خودسەرانە و تاکە کەسیی سوڵتان و دانانی بنەمای حوکمێکی نامەرکەزی لە ولاّتە ئیسلامەکانی ژێر دەسەلاّتی عوسمانیدا، کەچی لەم بابەتەوە تاقە بەیتێک چییە لە دیوانەکەیا بەدی ناکرێ. بابلێین ئەو باوەڕی بەو نامەرکەزییەتە نەبووە کە ئەو ئازادیخوازانەی ولاّتانی ئیسلامی ژێر دەستی عوسمانی بۆ ولاّتەکانی خۆیانیان ویستووە و، بەپیلانێکی ولاّتە ئیمپریالییەکانی ئەوروپای داناوە بۆ شەقوپەق کردنی خەلافەتی عوسمانی... ئەگەر وایە ئەی بۆ تاقە وشەیەکی لە دژیان و بۆ پەردە هەڵماڵین لە روویان نەوتووە؟ ئەمەیش هەموو، وەک ئەڵێن، بەر تەرەف. ئەوێ کە بێگومان ئاگای لەوە بووە تورکان چییان پاش رووخاندنی میرایەتیی بابان بەخەڵکی سلێمانی و دەوربەری کردووە و هەر بەردەوامیش بوون، لە جیاتی ئەوەی وەک نالی کە دەریش نەکرابوو، بۆ خۆی چاوی بەرایی نەدا لە سلێمانی بمێنێتەوە و ئەو جەور و ستەمەی عوسمانییان بەچاوی خۆی ببینێ و هیچی لە بەرامبەریانا پێ نەکرێ. لە سەفەری حەجەکەیا، وەک ئەو، چەکامەیەک لە دژی ئەوانە بلێ لە سلێمانییان دوورخستبووەوە، وەک نالی لە شامەوە بۆ سالمی نووسی لە سلێمانی. رێی ئەستەموولی گرتەبەر و سوڵتانی گەورەی ستەمکارانی سلێمانی بینی و بەفەرمانی خانەقا بۆ کردنەوە و مانگانە بۆ بڕینەوە و بەخەلاّت و بەراتەوە گەڕایەوە! کەچی نالی، تامردیش، لە ئەستەموول مایەوە و قایل نەبوو تا رۆژی حەشر پێ بنێتەوە خاکێ پۆستاڵی جەندرمەی تورکان پێشێلی کردبوو. کەسیش نەیگێڕاوەتەوە بلێ هەوڵی داوە، نەک سوڵتانی تورکان، کار بەدەستێکی تورک چییە، ببینێ، بەڵکو، بەپێچەوانەوە، پێوەندی بەرۆشنبیرانی بێگانەوە کردووە و، ئەوەی ئێمە، لەم بارەوە، زانیومانە، ئەوەیە باسی زمان و ئەدەبی کوردی بۆ کردوون و، لەمانەیشە شتی زۆری تریشی لەبابەتی جەور و ستەمی عوسمانییان و ژیانی گەلەکەی لەژێر زەبری جەندرمەکانیانا بۆ کردبن.

دیمەنێکی تری هەڵسوکەوتی مەحوی لەگەڵ ئەم جۆرە بابەتانەدا ئەوەیە لە دیوانە شیعرەکەی بەولاوە نیشانەیەکی کوردایەتی، بەواتا نەتەوەییە رووتەکەی، لەپاش خۆی بەجێ نەهێشتووە. بێگومان ئێمە بەهیچ جۆرێ مەبەستمان کەم کردنەوەی قەدری مەحوی و دیوانە بەرز و بالاّکەی نییە، بەلاّم کە مەسەلە هاتە سەر هەڵسەنگاندنی مەوزووعی، ئەبێ چی ڕاستە ئەوە بوترێ و بنووسرێ.

کە دێینە سەر دیوانەکەیشی تاقە پارچەیێ چییە شیعری نەتەوەیی تیا نییە و، ئەو

چوارینەیشی کە کردوومانە بەکلیلی دەرگای دیوانەکەی و ئەڵێ:

بنووسە، پیری دڵم ئەمری کرد، ئیطاعەم کرد
لە ئیبتیداوە کە بەیتێ موناسبی دیوان
گەدایەکی وەکو (مەحوی)، قەلەندەرێکی کورد
میسالی پادشەهی فورسە ساحێبی دیوان

ئەم چوارینە، لەگەڵ جوانییە بێ هاوتاکەیشی، کە خاوەکەی بەدیوانە شیعرێ بەهاوتای شای ئێران و، دیوانە شیعرەکەی بەرامبەر بەدیوەخانی شای ئێران دائەنێ کە پادشاهان و گەورە پیاوانی وڵات و دەرەوەی تیا کۆ ئەبنەوە و، بەلای ئێمەوە خۆی گەلێ لە هەموو شاهانی جیهان و دیوانە شیعرەکەی لە هەرچی دیوەخانی شاهانە مەزنترە، لەم بوارەدا کەلێنێکی گەورەمان بۆ پڕ ناکاتەوە. ئێمە لەم مەیدانەدا هەر ئەوەندەمان ئەوێ بڵێین ئەگەر لە بابەتی شیعری نەتەوەیی و هەڵوێستی نەتەوەییەوە بەراوردی مەحوی لەگەڵ حاجی قادری هاوچەرخی نا، لەگەڵ نالیی مامۆستا و پێشینەیشی بکەین، ئێجگار زۆر کورتی دێنێ.

مەحوی، بێگومان، هەواڵی خەباتی گەلانی ولاتانی باڵقانی بۆ ڕزگاربوون لە داوی عوسمانییان بەر گوێ کەوتووە. بۆیە، ئەبوو ئەگەر نەشیتوانی پشتیوانیی خۆی بۆ ئەوان دەرببڕێ، چونکە ئەم مەلایەکی موسوڵمان و ئەوان مەسیحین و لە دژی خەلیفەی موسوڵمانان ڕاپەڕیون، ئەڵێم ئەبوو ئاواتی ڕاپەڕینێکی وا بۆ گەلەکەی خۆی بخوازێ کە ئەمانیش چاو لەوان بکەن، کەچی لە جیهانی ئەستەموولی دەلاقەی ولاتانی ئیسلامدا کە بەسەر هەموو کیشوەری ئەورووپادا ئەڕوانێ، لە بارەی ئەو هەمووە دیمەنە سەرسام کەرانەی جیهانی شۆڕشی پیشەسازی و دیموکراتی بۆرژوارییەوە کە حاجی قادری هاوچەرخی ئەستەموول نشینی دەیان چامە و چەکامەی تیاوتوون و هانی کوردانی داوە چاویان لێ بکەن، ئەم هەر ئەوەندە دێتە گۆ شادمانی لە زاڵبوونی لەشکری سوڵتان بەسەر خەڵکی ڕاپەڕیوی یۆنانا دەرببڕێ و، سەرکەوتنی ژاپۆن بەسەر ڕوسیادا نەگێڕێتەوە بۆ نوێکاری و پیشەسازی و شارستانەتی لە بەرانبەری دەرەبەگی و زەبروزەنگ و حوکمی خودسەری و پاشکەوتوویی ڕوسیادا، بەڵکو بەنیشانەی گەورەییی ئیسلامی بزانێ گوایە خواوەند بەدەستی ژاپۆن تۆڵەی عوسمانیی لە ڕووس سەندووەتەوە، لە کاتێکدا کە ڕووسیا چەندین موستەعمەرەی دەیان ملیۆن موسوڵمان نشینی لەژێر دەستا بووە و بەشێ لە لەشکرە بەزیوەکەی لە ڕۆڵەکانی ئەو موستەعمەرانە بوون، وەک بڵێی ئەگەر خوا بییەوێ تۆڵەی عوسمانی لە ڕووس بکاتەوە، نەتوانی خۆی ڕاستەوخۆ لەشکری خەلیفە لەیەکێ لەو چەندین شەڕەی نێوانیانا بەسەریانا زاڵ بکا!

ئازیران!

قسە زۆرە و کات تەسک و کەم. هیچیشمان لە بارەی هونەری شیعری مەحوییەوە نەوت.

بەڵام نەچووە بچێ! با بمێنێ بۆ کۆڕێکی تر ئەگەر ماین و، جارێ خوا حافیز.

**پەراوێز**

(*) بەش بە حاڵی سالم، باوکم، ئەوەندەی پێی کرابێ، کاری خۆی لەسەر دیوانەوەکەی کردووە و، فاتیحی ڕەحمەتی برایشم پێیدا چووەتەوە و دەسکاریی تا نزیکەی دواییی دیوانەکەی کردووە و، ماوەتەوە سەر من. ئەگەر عومری ئەمانەت باقی بێ، ساڵانی (٢٠٠٢ و ٢٠٠٣) ئەکەم بە ساڵی (کەشکۆڵی مەحموود پاشای جاف) و (دیوانی سالم) و لەو دوو ساڵەدا ناتەواوییەکانی هەردووکیان تەواو ئەکەم و ئەیانگەیێنمە ناو مەکینەی چاپخانە.

ئەمێنێتەوە سەر دیوانی کوردی کە بنووسی ناسراو کاک حەمەبۆر، پشت بەچەند دەسنووس، کارێکی زۆری تیاکردووە و بۆ خۆی لێی کۆڵیەوەتەوە و لەسەری نووسیوە و پاشان کارەکەی خۆیی خستووەتە بەردەستی دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری عێراق بە هیوای لە چاپدانی، کۆڕیش بڕیاری داوە لیژنەی ئەدەبیاتی کوردی پیا بچێتەوە بەمەرجێ حەمەبۆر خۆیشی ببێ بە ئەندامی ئەو لیژنەیە. لیژنەی ناوبراو کە هەشت نۆ ئەندامی هەبوو و گەلێکیشیان مرۆی شایان و لێهاتوو بوون، دوو ساڵ بەپیاچوونەوەی دەسنووسەکەی حەمەبۆرەوە خەریک بوون و هەموو هەفتەیێ لەسەری کۆ ئەبوونەوە. سەرەنجامیش کە لێبووەوە لێی. نەک هەر لە چاپ نەدرا، کەسیش نەیزانی نوسخەکەی لیژنە خستبوویە دوا قاڵبییەوە چیی لێ هات و لە گۆشەی کتێبخانەی کێدا گیرسایەوە. ئێستاش حەمەبۆر عەوداڵی دوای وەڵامی ئەم پرسیارەیە و تەنانەت پاش نائومێد بوون مەسەلەکەی گەیاندە شکات و شکاتکاری لای کۆڕی زانیاری. لە خوالێخۆشبووان دوکتۆر کامیل بەسیر و مامۆستا مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی و ئەوانیش هیچ گوێیان نەدایە و گاڵتەیان بەقسەکانی ئەهات و، بەڕێوەبەر و ئەندامانی تری لیژنەی ئەدەبیات و دەستەی کوردی کۆڕی زانیاری لە مەسەلەکەدا نەهاتنە دەنگ و بیریشیان لەوە نەکردەوە لەوە بکۆڵنەوە ئەو کتێبە کەوتە لای کێ و، بۆ لە چاپ نەدرا و، کەی لە چاپ ئەدرێ؟

لێم ببورن لە باسی شێوازی شیعری بابان و دیوانی شیعری مستەفا بەگی کوردییەوە، هاتمە سەرباسی ئەم ڕیس و گوریسە، بەڵام لای خۆمەوە بەپێویستم زانی ئەم هەلە ڕەخساوە بەکاربێنم و ئەم ڕازە بدرکێنم تا خوێندەوارانی کورد پێی بزانن، تا ئەگەر ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەو دیوانە لە کونێکەوە سەری هەڵدا، بزانن سەر گوزەشتەکەی چۆن بووە.

## مەحوی
# میراتگری پەیام و هەڵوێستی جوامێرانەی مەولانا خالید

محەمەد حەمە باقی

سەرنج: ئەم نووسینە دوو بەشە و ئەم چەند لاپەڕەیە بەشی یەکەمیانە.

ئەگەر داگیرکردنی میرنشینگەلە نیمچە سەربەخۆکانی کورد-ی قەڵەمڕەوی عوسمانی، لە کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا، شەقڵێکی بێزاری و تووڕەبوونی بە شیعری نالی و سالم بەخشیبێ، ئەوا ئەم بێزاری و تووڕەبوونە، لە سەرەتای نیوەی دووەم و دواتری هەمان سەدەدا، بەشێوەیەکی جیاواز و هەڵکشاوتر و تا ئاستی یاخیبوون، بەمیراتیی بۆ شاعیرانی وەک: مەحوی (١٨٣٢-١٩٠٦)، حاجی قادری کۆیی (١٨٣٥-١٨٩٧)و شێخ ڕەزای تاڵەبانی (١٨٣٧-١٨١٠)، بەجێدەهێڵێ.. کە ئەگەر ئەم هۆیە (هۆی داگیرکردن و لەناوبردنی میرنشینەکانی کورد)، شێوازێکی نیمچە یەکسان و لەیەکچووی بەکەش و هەوای شیعری نالی و سالم دابێ؛ بەڵام شەقڵێکی سەرومڕ جیاواز و لە یەک نەچووی بەشیعری مەحوی و حاجی قادر و شێخ ڕەزا بەخشیوە؛ کە هەر تەنیا و تەنیا هۆیەکانی داگیرکردنەکە، ڕایەڵی هاوبەش و ناوکۆیی ئەم سێ شاعیرەی دواییە و لەم بوارەشدا هەریەکەیان لە چەندان بۆنەدا، شیعری حەسرەتئامێزیان بۆ لە دەستدانی ئەو میرنشینانە بەگشتی و میرنشینی بابان بەتایبەتی هەیە (کەتیایدا چاویان هەڵهێناوە).. ئەگینا جگە لەوەی بناوان و داروپەردوو، واتە: ستراکچەری شیعریی هەریەکە لەم سێ شاعیرە، تایبەتمەندیی و بۆن و بەرامە و دەنگ و ڕەنگ جیاواز و ڕوانگەی سەربەخۆیان هەیە. لە هەمان کاتیشدا میراتیی و هەوێنی تووڕەیی و یاخیبوونی شیعری مەحوی، دەگەڕێتەوە بۆ هۆی تر و بۆ سەردەمی تری پێش داگیرکردنی میرنشینەکانی کورد، کە سەردەمی سەرهەڵدان و بڵاوبوونەوەی بانگەواز و پەیامی مەولانا خالیدی شارەزووریییە، لە دووتوێی تەریقەتی نەقشبەندیدا و مێژووی ئەم تەریقەتەش دەگەڕێتەوە بۆ چەند سەدەیەکی زۆر دێرینەتری پێش سەرهەڵدانی مەولانا خالید و وەک بەڵگەگەلی مێژوویی، پێمان دەڵێن لە پێش پێکهێنانی دەوڵەتی سەفەوییەوە (١٥٠١)، پەلوپۆی لە کوردستاندا زۆر بڵاوبووبێتەوە و لە هەندێ قۆناغیشدا، ڕووناکبیرانی کورد لە ڕابەرە درەوشاوەکانی ئەم تەریقەتە بوون، وەک نموونەی (شێخ عەلی کوردی - ئامێدی)، کە لە سەرەتای پێکهاتنی دەوڵەتی سەفەویدا لە دەوروبەری قەزوین، وەک مریدێکی چالاکی عوبەیدوڵڵای ئەحرار (؟-١٤٩٠ز) ڕابەرایەتیی ئەم تەریقەتەی کردووە و نەیارێکی نەترسی دژی سەفەوییەکان بووە و هەر ئەوانیش لە کاتی هێرشی ڕەشەکوژیانەیاندا، بۆ

سەر سوننی و نەیارەکانیان، گرتوویانە و کوشتوویانە و ئەم کاری ڕەشەکوژییەی سوننیش، زەنگی قەلاچۆکردنی مەزهەبی سوننی بووە لە باکوور و خۆرئاوای ئێراندا؟ کە لەم شاڵاوەدا، تەریقەتی نەقشبەندی، هاوهەڵوێستێکی دڵسۆز و پتەوی مەزهەبی سوننی بوو لە دژی سەفەوییەکان و هەر ئەم هۆیەش، خودی تەریقەتی نەقشبەندی خستە بەر شاڵاوی ڕاستەوخۆی سەفەوییەکان و جێگەی لە مەڵبەندە دێرینەکانیاندا پێ لێژکردن و ناچاری کردن مەڵبەندەکانیان بەرودوا بۆ تەورێز و ورمێ بگوێزنەوە و لەورمێشەوە بە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا بڵاوببێتەوە و لە ئاکامدا بەو هۆیەوە کە سوڵتانەکانی عوسمانی، سوننی مەزهەب بوون و شەڕی بەردەوامی سەفەوییان کردووە، شاری ئەستەموولّ و هەندێ قەڵەمڕەوی عوسمانی بکەنە داڵدە و مەڵبەندی چالاکی و دواتریش لە زۆر جێگەی ئاسیای ناوەڕاست و هیندستاندا بڵاوببنەوە و چالاکییان تێدا بنوێنن، کە دوای چەند قۆناغ و ئاڵوگۆڕێکی فیکریی بەردەوام بەسەر ئەم تەریقەتەدا، یەکێک لە شێوازە سەرەکییەکانی ئەم گۆڕانکارییانە، لە هیندستان، لەسەردەستی شێخ ئەحمەدی سەرهیندی (؟-١٦٢٤ز)، ناسراو بە (المجدد)دا، شەقڵ بگرێ و پەلوپۆی تری بۆ (مەککە)و شوێنانی تر، لێ ببێتەوە.

ئەم شەقڵە (مجدد)ەی لەسەر دەستی ئەم ڕابەرەدا گەڵاڵە بوو، ئایدیۆلۆژیایەکی جیاواز و خوێنێکی تازەی بەبەر ئەم تەریقەدا کردەوە و ئەو تیۆری (وحدة الوجود)ەش، کە پێشتر ئەم تەریقەتەی پێدەناسرا، کردییە (وحدة الشهود) و بەمەش پێچەوانەی بیروباوەڕەکانی محیێدینی عەرەبی (١١٦٥- ١٢٤٠ ز) بووەوە، کە لە دەمێکەوە ئەم ڕێبازەی بە چەقبەستوویی هێشتبۆوە و لە هەمان کاتدا بەرەنگاری ئەو تەقەللایانەش بووەوە، کە دەیانویست لە ڕێگەی تەریقەتی نەقشبەندییەوە، سەروپێوەندی ئایینی ئیسلام، لەگەڵ ئایینەکانی تر دا گرێ بدەن.

هەر ئەم ڕابەرە پێی وابوو بۆ کارکردنە سەر بیروباوەڕی دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایان ڕێنوێنی و ئامۆژگاریی و ڕازیکردنیان، بۆ چاکە و خزمەتی خەڵک، پرد و دیالۆگێک لەگەڵیاندا دابمەزرێنێ و لەم پێناوەشدا نامەیەکی زۆری بۆ ئەو فەرمانڕەوا مەغۆلانە ناردووە کە لە لەو کاتەدا حوکمی هیندستانیان کردووە و لە ئاکامدا بە باری سەرنجی خۆی، قایلی کردوون و بەم هۆیەوە لەسەردەمی ئەمدا، ئەم تەریقەتە، ڕۆڵێکی گرنگ و بەرچاوی بەخۆیەوە دیوە و بەرەو گەشانەوە و کامڵبوون و ڕەگ داکوتان و خۆڕزگارکردن لە سێبەر و جێپەنجەی ڕێبازەکانی تر، هەنگاوی هەڵگرتووە و بەردەوام جەماوەری زۆرتری لێ ئاڵاوە، کە دواتر لەسەردەمی (شاغوڵام عەلی)، ناسراو بە شێخ عەبدوڵلای دەهلەوی (؟- ١٨٢٤ز)دا، خانەقاکەی لە هیندستان بۆتە مەڵبەندێکی درەوشاوە و بەهەزاران ئەویندار، لە وڵاتانی ئاسیا و ئەفەریقاوە زیارەتیان کردووە، کە مەولانا خالیدی شارەزووری، یەکێک بووە لەو ئەویندارانەی لە ساڵی (١٨٠٨)دا، بۆ ماوەی دوو ساڵ بۆتە شاگردی و ئیجازەی تەریقەتی تازەی نەقشبەندی (المجدد)ی لێ وەرگرتووە و ساڵی (١٨١١) بۆ کوردستان گەڕاوەتەوە.

بەڵام مەولانا خالید بەر لەوەی لە کوردستانەوە بچێتە هیندستان و دوای ئەوەش بۆی گەڕاوەتەوە، کوردستان بەگشتی و قەڵەمڕەوی بابان و پێتەختەکەیان (سلێمانی) بە تایبەتی، لەوپەڕی پشێوی و داپڕان و دواکەوتووییدا بوو، چونکە شەڕی شیعە و سوننی نێوان هەردوو دەوڵەتی قاجاری و عوسمانی و شەڕی ئەم دووانەش لەگەڵ دەوڵەتی رووس لە لایەک و شەڕی خوێناوی و بەردەوامی میرنشینەکانی بابان، سۆران و ئەردەڵان و ئاژاوە و ناکۆکی نەپساوی نێوان ئەندامانی بنەماڵەی فرمانڕەوایی بابان لەسەر دەسەڵات، لە لایەکی ترەوە، ببووە مایەی تێکدانی باری ژیانی کۆمەڵایەتی و داتەپینی ئابووری و بارێکی گران بەسەر ئەستۆی جەماوەرەوە، خەڵکەکەی بە جۆرێک وەڕس و بێزار و شپرزە کردبوو، کە بەدوای دەرەتان و چارەسەرێکدا دەگەڕان... بۆیە هەر کە مەولانا خالید گەڕایەوە و بانگەوازی بۆ ڕێبازە تازەکەی بەناو خەڵکدا بلاوکردەوە، خەڵکەکە وەک بانگەوازێکی ڕزگارکەر بە پیرییەوە چوون و پێشوازییان لێ کرد؛ بە تایبەتیش چینی جووتیاران و توێژی بازاڕیی، کە شەڕ و شۆڕی خوێناوی و بەردەوامی ناوچەکە، ژیانی لێ شێواندبوون و زیانی لێ لەبەرژەوەندییەکانیان دەدا.

لەبەر ئەوە لە ماوەیەکی زۆر کورت و چاوەڕواننەکراودا، بە هەزاران کەس، شەپۆل شەپۆل لەهەموو لایەکی کوردستانەوە، لە دەوری ڕێبازەکەی مەولانا خالید ئاڵان.

بەڵام سەرباری ئەو هەموو شەڕ و ململانێ و ناکۆکییەی پێشتر باسمان کردن و لەناوچەکەدا بوون، مێملێکی سەرسەخت و بەربەستێکی تری پتەوی بەردەم تەریقەتی نەقشبەندی، کە پێشتر لەناوچەکەدا بوو، تەریقەتی (قادری) بوو. ئەم تەریقەتەش زانای گەورە و ناودار: شێخ مارفی نۆدێ (١٧٥٣-١٨٣٨) ڕابەرایەتی دەکرد و بەو هۆیەشەوە کە ئەم تەریقەتە لە دێر زەمانەوە، ڕەگوریشەی لە هەرێمەکەدا بووە و لەگەڵ سەران و کاربەدەستانی بابانی و عوسمانیدا، سەروپێوەندیی بەهێزی هەبووە و هاوکاتیش گەڕانەوەی مەولانا خالید و بلاوبوونەوەی خێرا و بەرفراوانی تەریقەتی نەقشبەندی، بە مەترسییەکی گەورە و ڕاستەوخۆ، بۆ سەرخۆی زانیوە، بۆیە هەر زوو کەوتۆتە دوژمنایەتی و زمان لێدان و ڕاپۆرت نووسین لای میرانی بابان و سەرانی عوسمانی و تەنگ پێهەڵچنینی مەولانا خالید و هەڕەشە و تەقەللای تا ڕادەی تیرۆرکردنی... هەموو ئەمانەش بوونەتە هۆی ئەوەی تەریقەی نەقشبەندی لەلایەن جەماوەری دژ بەو سیستەمەوە، وەک تاقانە ئەلتەرناتیڤ و هەڵوێستێکی دژ بە زوڵم و زۆرداریی وەربگیرێ... بە تایبەتیش کە مەولانا خالید هەر لەسەرەتای بلاوکردنەوەی پەیامەکەیەوە، لە ڕێگەی (نووسین)ەوە بۆ سەرانی بابانی و عوسمانی و قاجاری و تەنانەت بۆ خودی شێخ مارفیش، کەوتۆتە سەرکۆنە و ڕەخنە لێگرتنی سیستەمە سەپاوەکە و هوشیارکردنەوەی سەرلەبەری خەڵک... کە بەم کارەی مەولانا خالید، بۆ یەکەمجار لە مێژووی گوتاری ڕووناکبیری کوردیدا، جووڵانەوەیەکی شاریی و شارستانییانە، دیالۆگ و مشتومڕێکی فەرهەنگیی و نیشتیمانییانە، لەناو ڕووناکبیرانی ئەو ڕۆژگارەدا، دێنێتە ئاراوە و زەمینەیەکی بەپیت و بەبڕشت، بۆ هێنانە

کایەی قۆناغێکی نوێی  ڕووناکبیریی دەرەخسێ، کە هەر لەو سەردەمەدا گەورەترین بزووتنەوەی شیعریی، لەسەر دەستی نالی و سالم و هاوڕێکانیان و گەشانەوەی دیالیکتی (سلێمانی) سەرهەڵدەدا کە تا ئێستا بەردەوامە و سەرەتاکانی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ڕۆژگارەی مەولانا خالید، کە لە ڕێگەی تەریقەتی نەقشبەندییەوە، باس و خواستی تازەی فەرهەنگیی دەوروژێنێ و ڕەخنەی توند و تیژ لە ڕابەرانی لە ڕێ لادەری ئایینی ئیسلام و فەرمانڕەوایانی ملهوڕ و سیستەمی گەندەڵبووی سیاسی دەگرێ... کە ئەگەر لە مێژووی بزووتنەوەگەلی  ئایینی ئیسلامدا، نموونەی وەک (ئاتەئیزم- ئیلحاد)، (سۆفیزم) و (تەئویلی) و ڕابەرانی تری وەک (سوهرەوەردی) و (ئیبن ڕاوەندی- ٨٢٥-٨٦٤)، لەناو گوتاری ڕووناکبیریی عەرەبی و ئێرانیدا هەبووبن، ئەوا بزووتنەوەی نەقشبەندی (المجدد)، کە مەولانا خالید لە کوردستاندا پیادەی کردووە، نموونەیەکی بەرجەستەی ئەو بزووتنەوانەیە، کە بە گیانی ڕەخنەی ئایینی و ڕیفۆرمخوازیی و واقیع بینانە کۆمەڵگەی کوردستانەوە، بۆ چارەسەری کێشەکانی ئەو کۆمەڵگایەوە، هەنگاوی هەڵگرتووە و هەر لەم ڕوانگەیەشەوە بووە، کە ئەو کاتەی مەولانا خالید بۆ خوێندن لە هیندستان بووە، شیعری حەسرەتی دیدار و دیتنەوەی کوردستانی نووسیوە و دواتریش هەر ئەم ڕوانگە نیشتمانییە، بۆ شاعیرانی وەک نالی و سالم و هاوڕێکانیان بۆتە سەرمەشق و چاولێکەری.

ئەگەرچی مەولانا خالید هەر تەنیا (٩) ساڵی پڕ لە ململانێ و ڕووبەڕووبوونەوە و دەستەویەخەبوونی ئەو واقیعە گەندەڵەی پێ مەودا دراو لەو (٩) ساڵەشدا، یەک دووجار ڕەنجاندیان و گوشاریان بۆ هێنا، تا پێتەختی بابان (سلێمانی) بەجێ بهێڵێ، بەڵام لە ماوەی ئەو (٩) ساڵەدا، ئەو واقیعەی بەجۆرێک هێنایە جووڵە و جۆش و خرۆش، کە پەیام و بانگەواز و لایەنگرەکانی مەولانا خالید، وەک ئاگروپوشوو، بەئاقاری مەولانا خالیددا، بەرین و بەرینتر دەتەنێتەوە. بەڕادەیەک کە تەنیا لە تازە شارێکی وەک (سلێمانی)دا و وەک کلۆدیوس جێمس ریچ (١٧٨٧-١٨٢١)، خۆی لەو ڕۆژانەدا لەناو واقیعەکەدا بووە و دەیگێڕێتەوە، ئاماری مرید و لایەنگرانی گەیشتوونەتە (١٢) هەزار و لە دەرەوەی کوردستانیشدا گەیشتوونەتە (٢٠) هەزار مرید و (٣٤) خەلیفەی کورد و (٣٣) خەلیفەی سەر بەنەتەوەکانی تر کە ئەم ئامارە زۆر و جوگرافیا بەرینە، بۆ ئەو ماوە کورتەی مەولانا خالید بۆ کوردستان هاتۆتەوە (١٨١١)و تا کوردستانی جێهێشتووە لە (١٨٢٠)، جێی سەرنج و لێ ڕامان و بەڵگەی ئەوەن، چەند لەو سیستەمەی ئەو ڕۆژگارە بێزارن و لەسەروو ئەمەشەوە توانای ئەم ڕابەرە ڕووناکبیرە دەردەخەن، کە چۆن لەناو ئەو واقیعە گەمارۆدراوەی بەململانێ و بەگژداچوونەوەی سەرانی بابانی و عوسمانی و تەریقەتی باڵادەستی (قادری)دا، توانیویێتی ئەو واقیعە سەرکوت و بێدەنگ کراوە، بهێنێتە دەنگ و جووڵە و ڕاپەڕین و ئەو بزووتنەوە فیکری و ڕووناکبیرییە شارییە هەڵایسێنێ و لەناو گوشار و تەنگ پێهەڵچنینێکی بەردەوامدا، مشتومڕ و ململانێیەکە بەخرۆشاوی بۆ دوای

خۆی بەجێ بهێڵێ و بەیەکجاریی کوردستان بەجێ بهێڵێ؛ کە خودی بڕیار و سەرهەڵگرتن و جێهێشتنەکەی کوردستانیشی، هەڵوێستێکی تری خوێندەوارانە و شارییانەی مەولانایە و کاتێ دەبینێ ئاستی ململانێ و ڕووبەڕووبوونەوەکە خەریکە بگاتە بەکارهێنانی زمانێکی تری جیا لە نووسین و مشتومڕ، کە زمانی باوی چەک و یەکتر کوشتنە، ئەوسا بەو بڕیاری سەرهەڵگرتن و جێهێشتنەی کوردستانی، دەیسەلمێنێ کە ئەو بڕوای بەدیالۆگی شاریی و شارستانییانە هەبووە.

مەولانا خالید لە دوای کۆچی کتوپڕی بۆ بەغدا (١٨٢٠)و دواییتر لەوێوە بۆ شام و مەرگی ناکاوی هەر لە ئاوارەییدا (١٨٢٧)، دوو کەس لە خەلیفەکانی، لە هەموو ئەوانیتر چالاکتر و بەنفووزتر بوون و خانەقاکانیان بوو بەناوەندی گرنگی ئیرشاد و ڕابەرایەتی بڵاوکردنەوەی تەریقەت، کە یەکەمیان: شێخ عوسمانی سیراجوددینی بیارە (١٧٨٠-١٨٦٠)و ئەویتریان شێخ تەهای شەمزینی (؟-١٨٣٥) بوون، کە ئەگەرچی ناوەندی هەردوو خانەقاکە لە دەرەوەی قەڵەمڕەوی بابان، واتە: لە دەرەوەی مشتومڕ و ململانێ بەردەوامەکەی مەولانا خالیدا بوون، بەڵام ئەمی دواییان بە هەمان گەرمایی و جۆشی ڕیفۆرمخوازانەی مەولانا خالیدەوە، درێژەی بەزیندوو ڕاگرتنی بیروڕاکانی تەریقەتی (مجدد) دا و کەوتە سەرکۆنەی هەردوو سیستەمی حوکمی عوسمانی و قاجاری و لە ئاکامیشدا لە ڕۆژگاری شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری (١٨٣٠-١٨٨٣)دا، بۆ چاکترکردنی باری ژیانی خەڵک، ڕاپەڕین و شۆڕشی بەربڵاوی ساڵی (١٨٨٠)ی لە دژی ڕژێمی قاجاری لێ کەوتەوە و دواتریش هەمان ڕێڕەو، لە شۆڕشەکانی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی و شێخ سەعیدی پیران و دواتری بەرزاندا بەردەوام بوون و باڵی دووەمیشیان، باڵی خانەقای بیارە و شێخانی هەورامان بوو، کە هەر ئەوەندەی لە مەڵبەند و جەرگەی ململانێ و مشتومڕەکە دوورکەوتەوە و لە نێوان سنووری هەردوو دەوڵەتی قاجاری و عوسمانی جێگیر بوو، ئیتر مۆرکە (ڕووناکبیری و ڕیفۆرمخوازی)یەکەی لە دەست داوە و مۆرکی فێرکردنی ڕۆتینی نوقسان جێی گرتەوە[1].. کە ئەم هەڵوێستەی ئەم خانەقایە، جێی سەرنج و وردبوونەوەیە، چونکە هەمان باڵی (مجدد)ی نەقشی، لەسەرتاسەری ناوچەکەدا، بەهەمان گیانی ڕیفۆرمخوازانەی ڕاپەڕیو، لەگەڵ خەم و خۆزگەی خەڵکی ستەمدیدەدا بووە و لە دژی زوڵم و زۆرداریی ڕاپەڕیوە، کە شۆڕشەکانی شێخ شامیلی داغستانی (١٧٩٧-١٨٧١) و (سۆفی ئیسلام)ی هیندی و (خواجە یوسفی قەشغەری) و (عەبدولقادری جەزائیری)، نموونەی بەرجەستەی پەیڕەوانی ئەم باڵە (مجدد)ەی تەریقەتی نەقشبەندین.

بەڵگەشمان لەسەر خۆ نەبان کردنی خانەقای بیارە، لە بەرامبەر پەیامی ڕیفۆرمخوازانەی تەریقەتی نەقشیدا، سەرخوارکردنەوەیەکی خێرا و ڕاگوزارییە، لە جیهانی شیعریی لووتکەیەکی شیعریی ناو کەش و هەوا و تەمتومانی فیکری خانەقای بیارە، کە شیعری مەولەوی تاوەگۆزییە (١٨٨٠-١٨٨٢).

شیعری مەولەوی تاوەگۆزی لەگەڵ ئەوەشدا کە بۆن و بەرامەی نیشتمان بەهەموو کەژ و

کوێستـان و گەرمیان و ڕووبار و قەڵبەز و سروە و درەخت و مرۆڤییەوە، بانگمان دەکەن و پێمان دەڵێن کـە هەمـوو جـوانییـەکـانی کـردگـار، وەک (کـچـە کـوردێکی نازدار، بەبەرگ و پۆیلانەی تەواوەوە)[٢] لە کوردستاندان؛ کەچی لەگەڵ ئەمانەشدا سەرجەمی شیعری مەولەوی، یادێک لە میرنشینی بابان، یادێک بۆ لەدەستدانی میرنشینی بابان، یادێک لە ڕووناکبیران و شاعیرانی پێتەختی بابان ناکات، کـە لەو ڕۆژگارەدا درەوشاوەترین شـاری فـەرهەنگیی کوردستـان بووە. تەنانەت مـەولەوی، کە چەندان جار لە هەورامـانەوە، نامـەی شـیعـریی بۆ بەغـدا بۆ (مەحـموود پاشای جـاف) دەنووسێ، یان کـە مـەولەوی خۆی لە بەغـدا بووە و لەوێوە نامـەی شـیـعـریی بۆ (ئەحمەد پریسی)ی بۆ بناری هەورامان دەنووسێ، بەسەر (سلێمـانی) مەڵبەندی مەولانا خالیدی نەقشـبـەندیدا باز دەدا و لەناوهێنانی ئەو شـار و شـارۆچکە و جێگایانەشـدا، کـە لە دووتوێی شیعرەکـانیدا بەلێشـاو هەن، نـاوی تاقە چیا و گوند و شـارێکیش ناهێنێ، کە لە جوگرافیـای میرنشینی بابان، واتە لە مەڵبەندی مەولانا خالیدان! لەمانەش سەیرتر، لەسەرتاسەری شیعری مـەولەویدا، تاقـە شـیـعرێک و تاقە بەیتێک، بەڵکو تاقـە حەرفێکیش بەدی ناکـەین، کە یادی لەمەولانا خالیدی کردبێت!!

خۆ ئەگەر ئەم ڕێباز گۆڕینەی خانەقای بیـارە و هاوتەریب نەبوونی لەگەڵ پەیامی (مجدد)ی نەقـشـبـەندیدا، ئاوڕدانەوە و لێکۆڵینەوەی تایبـەتی بوێت؛ کـە ئێـرە جـێی نیـیـە، بەڵام خـۆ جیاکردنەوە و جیـاوازبوونی ڕوانگە و کەش و هەوای شیعری مەولەوی، لەگەڵ ڕێبـازی مەولانا خـالیـد و شـیـعـری قـەڵـەمـڕەوی بابان، هۆی ئەوەیە کـە جیـهـانبینی مـەولەوی و داروپەردووی شـیــعـرەکـانی لەسـەرچاوە قـووڵەکـانی عـیـرفـانی ئێـرانی پاراو دەبێ و ئەم سـەرچاوەیەش، تێکەڵەیەکی فرە ڕوانگەیی ئایینە کۆنەکانی ئێرانە، هەر لە بودایی و میترایییەوە، تا زەرتوشت و ئیسلام؛ کە سەرباشقە بەرجەستەکانی ئەم شیعرە، جەلالەددینی ڕۆمی، واتە: مەولەوی ڕۆمییە و پێش مـەولەوی تاوەگـۆزیش هەمـوو شـاعـیـرانی دیالێکتی گـۆران و مـەلای جزیری و دواتریش وەفایی مەهابادییە و کەمێکیش (بێخود)، هەر لەم سەرچاوەیەوە پاراو بوون.

ئەمـە لە کـاتێکدا کـە شـاعـیـرانی هاوڕۆژگـاری مـەولەوی تاوەگـۆزی، وەک نالی و سـالم و هاوڕێکانیـان، کە لە ناوجەرگەی ململانێیـەکـەی و سەرهەڵگرتن و کۆچی مـەولانا خـالیـد، لە سلێمانیدا، سەریان هەڵدا، بێ ئەوەش کە هیچیان سەر بەرێبازگەکەی مەولانا خالید بن، کەچی هەموویان میراتی و هەوێنی بزووتنەوە و ململانێیەکەی مەولانا خالید گرتنیەوە و تاڕادەیەکیش تێوەی گلان و بێ سڵەمینەوە، شیعریان لەو کەش و هەوا جەنجاڵ و خرۆشاوەدا چاوی هەڵهێنا و ناسنامە و مۆرکی سەردەمەکەیان لە شیعرەکانیاندا هەڵگرت.

خۆ ئەگەر نەبوونی سەر و پێوەندیی مەولەوی لەگەڵ نالی و سالم و هاوڕێکانیاندا، بەگریمان و هۆی ئەوە دابنێین، کە نالی و سالم، سەر بەتەریقەتی نەقشبەندی نین، ئەی خۆ شاعیرێکی وەک (مەحوی)، کە خۆی و باوکیشی، نەک هەر سەر بەتەریقەتی نەقشبەندین، بەڵکو هەردووکیـان

بەرودوا، خەلیفەی شێخ عوسمانی بیارە، واتە: خەلیفەی هەمان (پیر)ی مەولەوی–ن!، کەچی مەولەوی تاقە شیعر و تاقە حەرفێکی بۆ (مەحوی)ش نییە!![3] بەڵام (مەحوی)، کە مەبەستی سەرەکی ئەم نووسینەی ئێمەیە و سەر بەشەپۆلە شیعرییەکەی دوای نالی و سالم و دوای ڕووخان و لەناوچوونی میرنشینی بابان و دوای ماوەیەکی درەنگتری کۆچی مەولانا خالید، لەگەڵ شاعیرانی هاوتەمەنی خۆی، وەک: (حاجی قادری کۆیی) و (شێخ ڕەزای تاڵەبانی) و...هتد دا سەرهەڵدەدات؛ ئەگەر چەندان ڕەگەزی شیعریی، لە شیعرەکانیاندا جێی ئاوڕدانەوە و لێکۆڵینەوە بن، ئەوا بەرجەستەترین ڕەگەزی شیعری مەحوی، ڕەگەزی هەڵوێستە، کە سەرومڕی سیماکانی سەردەمی مەولانا خالید لە خۆیاندا کۆدەکەنەوە و بەهەموویان بنچینەی شیعرەکانی مەحوی پێکدێنن.

شیعری مەحوی بەرجەستەکردنی جوامێرانە و ڕاستگۆیانەی ئەو واقیعەیە، کە مەولانا خالید خرۆشاندی و بەخرۆشاویی بۆ دوای خۆی جێهێشت و بەدوایشیدا داگیرکردنی دڵڕەقانەی لەشکری عوسمانی بۆ سەر قەڵەمڕەوی بابان بەسەرداهات و جگە لە مەحوی، کەسی تر نەیتوانی وەک مەحوی، لەناوجەرگەی ڕووداوەکان و ڕووبەڕووبوونەوەدا بمێنێتەوە و بەرگەی ئەو هەموو تەنگ پێهەڵچنین و هەڕەشە و زەبر و زەنگ و گوشار و گەمارۆ ڕۆحییە بگرێ، کە مەحوی لە بەرامبەریاندا سەنگەری شیعری لێگرتن و لەگەڵیاندا دەستەویەخە بووەوە... بەڕادەیەک کە لە تێکڕای شیعری مەحوی و تەنانەت لە زۆرینەی بەیتە شیعرەکانیشیدا، هەست دەکەین: ها ئێستا نا، تاوێکی تر، چەند جەندرمەیەکی داگیرکەری عوسمانی، هەڵدەکوتنە سەر مەحوی و لێی دەنەون و بەدەست بەستراویی بۆ بەر سێدارەی دەبەن و مەحویش لە دەمێکەوە خۆی بۆ ئەم بەرسێدارە بردنە ئامادەکردووە...

چونکە سەرلەبەری شیعری مەحوی، شیعری ڕەخنەی توندوتیژ و پلار و توانج و لاقرتێ و دەمامک هەڵماڵینە، لەسەر ئەو واقیعەی، بەدرۆ و دەلەسە و فرت و فێڵ و چاو و ڕاو، جەماوەر دەچەوسێننەوە و ئایینی ئیسلامیش دەکەنە سوپەر و چەتر!. ئەو واقیعەی مەحوی سەرکەشانە دژی وەستاوەتەوە، ئەوەندە سەخت و دژوار بووە، کە مەحوی بەتەنیا تیایدا ماوەتەوە و بەرگریی کردووە و وەک (نالی) پێناسەی دەکات: ئەگەر شاعیرێک دڵی لەبەرد نەبێت، ناتوانێ تیایدا بژی... بۆیە کە نالی (دوای جێهێشتنی یەکجارەکی ئەو واقیعە، کاتێ لە شامەوە، نامە بۆ سالم)ی بەجێماوی ناو ئەو واقیعە پڕ ترس و بیمە دەنووسێ، پێی دەڵێ: ئەگەر دڵت لەبەرد نەبووایە، چۆن دەتتوانی بەرگەی ئەو هەموو دژوارییە بگریت؟:

حاڵیی بکە بەخوفییە، کە ئەی یاری (سەنگ دڵ)
نالی لەشەوقی تۆیە دەنێرێ سەلامی دوور

کە هەر نالی خۆی، لە جێگەیەکی تری هەمان بەیتدا، ئاماژەیەکی سەیر، بەکەش و هەوا و زەبروزەنگ و دڕندایەتی سەردەمەکە دەکات و بەئەندازەیەک باسی مەترسی و باڵی ڕەشی

داگیرکەرانی عوسمانی دەکات، وەک ئەوەی سیخوڕیان لەسەر هەناسەدانی خەڵکیش دانابێت: (حاڵیی بکە بەخوفییە!)...

بەدوای نالی-شدا، شاعیرانی تری هاوڕۆژگاری مەحوی و هاوتەمەنەکانی، وەک: حاجی قادری کۆیی و شێخ ڕەزای تاڵەبانی و کەیفی جوانڕۆیی و... بەرودوا لە دەوری مەحوی نەماون و کوردستانیان جێهێشتووە، کە حاجی قادر و کەیفی جوانڕۆیی، هەر زوو سەری خۆیان هەڵگرت و لە ئەستەمولّدا گیرسانەوە و هەر لە ئاوارەییشدا سەریان نایەوە. شێخ ڕەزاش لە نێوان سلێمانی و کەرکووک و کۆیە و ئەستەموولّدا، گەڕیدەیەکی نەگیرساوەی بێ لانە و بێ داڵدە بوو.

کەچی مەحوی، بەهەمان گیانی ڕەخنەگرانەی مەولانا خالیدەوە، بەتەنیا و بێ پشتیوان، لەمەیدانێکی پڕ ترس و بیمی ڕووبەڕووبوونەوە کە دەسەڵاتداران بەزەییان بەهیچ زیندەوەرێکی کوردستاندا نایەتەوە و (سالم) واتەنی: دەست لە دار و درەختی پیرۆزەی سەرگۆڕی پیاوچاکانیش دەوەشێنن و (ئەوەندە شوومن، لەشەخیسش دەدەن زەرەر) و... ئا لەو داروبارەدا، مەحوی بەتین و تاوی بەرزی شیعرەوە، بێباکانە و نەترسانە، بەبێ ئەوەی بۆ ساتێکیش لە هەق بێژیی بکەوێت، گیانی خۆی ئامادەی مەرگ کردووە و تەشەری گرتۆتە ناهەق و داکۆکی لە هەق کردووە و لە خەم و خەونی مرۆڤ دواوە... لە کێشەی ڕۆژانەی مرۆڤ دواوە... هەڵوێستی شیعری جوامێرانەی بۆ دەستەبەرکردنی بەختەوەریی مرۆڤ نواندووە و ڕەخنەی توندوتیژی لە دەسەڵاتداران و ئەوانیش گرتووە، کە هاوکاری دەسەڵاتدارانی بێگانەیان کردووە و بەگژ زوڵم و زۆردا چووە. هەمیشە لەبەرەی هەق بێژیدا بووە و هەرگیز سازشی لەگەڵ دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایانی ڕۆژگاردا نەکردووە. تەنانەت ئەو شیعرەش کە بەبۆنەی سەرکەوتنی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦ - ١٩٠٩ز)، بەسەر خەڵکی یۆناندا نووسیویتی و پێخۆشحاڵیی خۆی پێ دەربڕیوە، دەبێ بەچاوی ئەو ڕۆژگارە سەیر بکرێ و لێک بدرێتەوە، کە بەڕای ئێمە، بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە:

١- لە ماوەی (٤٠٠) ساڵی ڕابردوودا و بەسۆنگەی شەڕەکانی نێوان سوننی و شیعەوە، دیدی ئایینی بەجۆرێک تێکەڵ دیدی سیاسی ببوو، هەڵوێستی سیاسی لەسەر دادەڕێژرا و لەمەشدا مەزهەبی سوننی، لایەنگریی لەدەوڵەتی عوسمانی و مەزهەبی شیعەش لایەنگریی لە دەوڵەتی قاجاری دەکرد. بەتایبەتیش وەک پێشتر وتمان: لەکاتی شالاو بردنە سەر ڕابەرانی تەریقەتی نەقشی و لایەنگرەکانیاندا، لەلایەن شاهەکانی سەفەوییەوە، ڕابەران و لایەنگرانی نەقشبەندی، ناچار دەبوون هاوهەڵوێستیی لەگەڵ سوننییەکاندا بکەن و بەو هۆیەشەوە سوڵتانەکانی عوسمانی، سوننی بوون، بۆیە بەهەڵیان دەزانی ئەم شالاوەی سەفەوی بقۆزنەوە و پشتیوانیی لە سوننی مەزهەب و مەزهەبە بەر شالاوکەوتووەکانی سەفەوی بکەن.

٢- ساڵی (١٨٧٨)، لە گەرمەی خۆ ئامادەکردنی گەلی کورد، بەڕابەرایەتی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری و هاوتەریقەتی مەحوی، بۆ ڕاپەڕین و شۆڕش، دژی ڕژێمی عوسمانی، کە

تازە لەدوا جەنگی دۆڕاوی لەگەڵ ڕووس ببووەوە و بەو بۆنەیەشەوە کە گەلی ئەرمەن، لەو جەنگەدا، بەنهێنی و بەئاشکرا، پشتیوانییان لە سوپای ڕووس کردبوو؛ سوپای ڕووسیش بۆ پاداشتدانەوەی چاکەی ئەرمەن؛ لە کۆنگرەی ئاشتی: سان ستیڤانۆ (٣ مارتی ١٨٧٨) و دواتر لە پەیماننامەی بەرلین (١٣ تەمووزی ١٨٧٨)دا، مەرجی بەسەر دەوڵەتی عوسمانیدا سەپاند، کە دەبێ یاسای ئۆتۆنۆمی، بۆ ناوچە ئەرمەن نشینەکان پیادە بکات و لەمەشدا بەشێکی زۆری خاکی کوردستان، بەر ئەو یاسایە دەکەوت و دەوڵەتانی ئەوروپاش هەمان پشتیوانییان لە کێشەی ئەرمەن دەکرد، کە ئەگەر هۆشیاریی شێخ عوبەیدوڵلا و بەتەنگەوە هاتنی گیانی دۆستایەتی کورد و ئەرمەنی نەپاراستبایە، ئەم بڕیارەی ڕووسیا و دەوڵەتانی ئەوروپا، گەلی کورد و ئەرمەنی دەگلاندە شەڕێکی لابەلا و خوێناوییەوە؛ بۆیە مەحوی ئەم ڕووداوانەی بەوردیی سەرنج داوە و هەموو ژێرکەوتنێکی دەوڵەتانی ئەوروپا و سەرکەوتنی سوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی، بەسەریاندا پێ خۆش بووە... کە ڕووناکبیر و شاعیرێکی هەمان ڕۆژگاری وەک حاجی قادری کۆیی، کە لەو کاتەدا خۆی لە ئەستەموڵ بووە و لە نزیکەوە ڕووداوەکانی سەرنج داوە، لەمەدا هەمان هەڵوێستی مەحوی هەبووە لەبەر ئەوە ئەم شیعرەی مەحوی، بۆ ئەم سەرکەوتنەی سوڵتانی عوسمانی، نابێتە مایەی داکۆکی لە دەسەڵاتداران و فەرمانڕەوایان، بەڵکو شیعری ئەو ڕۆژگار و ڕووداوانەیە، کە مەحوی بەلای خۆیەوە، هەڵوێستی سیاسیی لەسەر دارشتوون.

بۆیە شیعری مەحوی، شیعری هەڵوێستی سیاسی و ڕەخنەی ڕووناکبیرانەی شاعیرێکی شارە و لەو ڕۆژگار و سەردەمە بەزۆر داسەپاوانەدا، کە هەموو ئازادییەکی مرۆڤی تێدا پێشێل دەکرێ و لە هەموو زەمان و لە هەموو جێگەیەکیشدا، خەمی مرۆڤ دەلاوێنێ؛ کە ئەم پەیامەی مەحوی، جگە لەوەی درێژەی پەیامی بەپێتترین سەردەمی ڕووناکبیریی کوردییە، کە بانگەوازە ریفۆرمخوازەکەی مەولانا خالید هەژاندی، لەهەمان کاتیشدا ئەزموونێکی دەگمەن و نموونەیەکی ناوازەیە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا، کە ئەگەر (حافزی شیرازی) و (خاقانی) و (عوبێدی زاکانی) لە ئەدەبی فارسی و (ئەبونەواس) و (ئەبوعەلای مەعەڕی)یش لە ئەدەبی عەرەبیدا، هەمان پەیام و هەڵوێستیان بۆ ئازادی مرۆڤ هەبووبێ، ئەوا پەیام و هەڵوێستی شیعریی مەحوی، لە هەڵوێست و پەیامی ئەوان کەمتر نەبووە.

٢٠٠١/٨/٢٧-٢٠

**پەراوێز**

(١) هەڵکەوت حەکیم: ابعاد ظهور الطریقة النقشبندیة في کردستان - في اوائل القرن التاسع عشر - مجلة دراسات کردیة - العدد (١) کانون الثاني ١٩٨٤ - ص ٥٥-٧٦ .

(٢) ئەوانەی ناو کەوانەکە قسەی شاعیری گەورە (گۆران)ن،

(٣) بەڵام مەحوی شیعری بۆ مەرگی مەولەوی هەیە.

## سەر کە جۆشێکی نەبێ

سـەر کـە جـۆشـێکی نەبێ، من زرکـە تالّم بۆ چییـە!
دڵ کـە هۆشێکی نەبێ، شیـشـەی بەتاڵم بۆ چییـە!
دەرد و داغــێکی دەروونی گــەر ببێ، با ڕەنگ و ڕوو
سیس و مـوغبـەڕ بێ، کـەماڵم بوو جـەماڵم بۆ چییـە!
تەجـرەبەی عـاشق بەسـووتانی دەکـرد ئەو ظاڵمـە
سەیری کەن ئێستا دەڵێ: مشتێ زووخاڵم بۆ چییـە!
پێی بەسـەرما نا کە بوومە خاکی ڕێی، گـەردم شوکر
گـەییـە داوێنی، دەلاڵیی بای شـەمـاڵم بۆ چییـە!
داغی سـینە و پێچ و تابی دوودی ئاهم خـۆ هەیە
مـۆر و طوڕڕەی ئینپـەراطۆر و قـەڕاڵم بۆ چییـە!
خەڵق ئەوا مەجبووری دوو خۆ خستنی خەڵقن بەجان
من بەدڵ مـەنفـوورمـە، ڕوتبـەی جـەجاڵم بۆ چییـە!
مـاڵە پیـتکێنێیـە مـاڵ و، گـەینە حاڵی خـۆیە حاڵ
من کـەوا حاڵی بم، ئیـتـر مـاڵ و حـاڵم بۆ چییـە!
پڕ بەپێ زنجیـرەی شێـتـیی، داغی سـەودا پڕ بەسـەر
سـەیری حـاڵی خـۆمـە، سـەیری زوڵف و خـاڵم بۆ چییـە!
دەردەدار ئەڵبـەت زوبانی دەرد و حـەسـرەت تێ دەگـا
چاوی بیـمـاری دەزانێ، ناڵە ناڵم بۆ چییـە!
دڵ گلە و شـەکـوەی لە ئەشکەنجەی عـەذابی زوڵفی یار
کـرد و، ئەو فـەرمـووی: ئەدی زنجیـری زاڵم بۆ چییـە!
حـاڵە بەد حـاڵیی لە شـوێن و، مـاڵە وێرانیی لە دوو
«مـەحویا»! گـەر ئەهلی حاڵی، حاڵ و ماڵم بۆ چییـە!

**مەحوی**

# له نێوان دوو غەزەلی
# شەو و ڕۆژی حەمدی و مەحویدا لێکۆڵینەوە و بەرامبەری

نووسینی: دکتۆر ابراهیم احمد شوان

بەناوی خوای دڵۆڤان

## پێشەکی

مەحوی[1] یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی کە ڕۆڵێکی دیاری لەسەردەمی خۆیدا بووە و شیعرەکانی بەگشتی ڕەنگدانەوەی واقیعی ئەوکاتی شاری سلێمانی بووە و بەپێشڕەوی شیعری سۆفیانە و تارادەیەکیش شیعری ئایینی دادەنرێ، کە دەڵێن تارادەیەک چونکە (نالی) سەر مەشقی ئەم جۆرە شیعرە بووە و لە دوای ئەو بە دڵسۆزییەوە مەحوی دروشمەکەی هەڵگرتووە و شاعیران چاویان لێی کردۆتەوە.

بەبۆچوونی نووسەری ئەم لێکۆڵینەوەیە حەمدیی[2] ساحێبقران ١٨٧٨ - ١٩٣٦ یەکێکە لەو شاعیرە بەتوانایانەی کە تارادەیەک کاریگەریی مەحویی پێوە دیارە لە شیعری ئاینیدا، ئەم کاریگەرییەش زیاتر لە دوو غەزەلی (شەو و ڕۆژ)ی مەحوییەوە سەرهەڵدەدا، چونکە ئاسۆیەکی گیانی و فەلسەفییان پێوە دیارە.

لێکۆڵینەوەکە لە دوو لایەنەوە خۆی دەبینێ:

١- لێکدانەوەی واتای (شەو و ڕۆژ) بەپێی فەرهەنگی سۆفیانە و لێکدانەوەیەکی سۆفیانە بۆ هەردوو غەزەلەکەی مەحوی کە کۆتاییان بە (شەو، ڕۆژ) هاتووە.

٢- بەرامبەریکردنی هەردوو غەزەلی (شەو و ڕۆژ)ی مەحوی و حەمدی، ئەمەش لە دوو ڕووەوە ئەنجام دەدرێت:

ا- لێکچوونیان لە ڕووی ڕوخسارەوە.

ب- لێکچوونیان لە ڕووی ناوەڕۆکەوە.

بەهیوای ئەوەی خزمەتێکی بچووک پێشکەشی ئەدەبی نەتەوایەتیمان کرابێ و مەڵۆیەک خرابێتە سەر خەرمانی ئەدەبی کوردی.

## بەشی یەکەم

**ڕۆژ:**

بەدواداهاتنی نوور پێی دەگوترێ ڕۆژ، هەروەها ڕۆژی پەیمان و ئەلەست و ئەزەلیشی پێ

دەگوترێ. بەلای هەندێ لە سۆفییەکان ڕۆژ پێنج جۆری هەیە:

١- ڕۆژی ونبوو (مفقود): ڕۆژی جیهانە کە دەڕوا و لە دوای خۆی پەشیمانی بەجێ دێڵێ.

٢- ڕۆژی ئامادەبوو (مشهود): ئەو ڕۆژەیە کە تێیدای، ئەگەر کاری چاکی تێدا بکرێ و بەهەل وەربگیرێ ئەوا بەغەنیمەت لەقەڵەم دەدرێ.

٣- ڕۆژی داهاتوو (مورود): ڕۆژی بەیانییە و نابێ دڵی خۆتی تێدا بەند بکەیت و کاتی خۆی بەئومێدی ئەو لە کیس بدەی، چونکە سبەینێ هێشتا نەهاتووە و لە دەست نییە.

٤- ڕۆژی بەڵێندراو (موعود): بەو ڕۆژە دەگوترێ کە تەمەن بەرەو کۆتایی دەچێ و گیان دەگاتە قوڕگ و ئاوی کەسەر لە چاو دەوەستێ و ڕوخسار زەرد هەڵدەگەڕێ.

٥- ڕۆژی درێژکراو (ممدود): ڕۆژی بەپابوونەوەیە کە هەموو مرۆڤی تێدا کۆدەکرێتەوە و دەکرێنە دوو چین، پاک و ناپاک(٣).

**شەو:**

هاتنی شەو لە فەرهەنگی شاعیران هێمای خەم و ترس و تەنیایی و نامۆیی و مردنە، ڕۆیشتنیشی ژیان و هیوا و بەختیارییە(٤).

لای عاریفەکانیش جارێ جیهانی غەیبە و جارێ جیهانی جەبەڕووتە (سنووری نێوان جیهانی هەستی و ناهەستی)، هەروەها بەبنەچەی شتەکان و شەوی مرۆڤی دەگوترێ، تاریکی شەو تاریکیی لەگینەکانە (ممکنات) چونکە لەگینەکان سێبەرن و دەرکەوتەی زۆربی حەقن، مەبەست لە شەوی ڕووناک خودی خوایە، چونکە خوا بێڕەنگە و بەشەو چوێنراوە(٥).

دوای ئەوەی هەندێ لە واتاکانی ڕۆژ و شەومان بۆ ئاشکرابوو، ئێستا دێین لەژێر سایەی ئەم بۆچوونانە هەردوو غەزەلەکەی مەحوی کە لە بارەی (شەو و ڕۆژ)ە شی دەکەینەوە.

شاعیرانی کۆن بەگشتی یارەکانیان بەڕۆژ چوواندووە چونکە هیچ شتێ خۆی لەبەر تیشکی ناگرێ و بەزێنەری هەموو جوانێکە لە جیهانی هەستیدا.

بەڵام لەبەر ئەوەی مەحوی بەگشتی شیعرەکانی لە تەوەری شیعری سۆفیانە دەخولێنەوە بۆیە سروشتی ڕۆژیش گۆڕاوە و لە دولبەرەوە کاڵای دڵداری بەبەردا بڕاوە و بەدوای دولبەری مانگ ئاسادا وێڵە.

لەم غەزەلەی مەحویدا ڕۆژ دڵدارە و شێتی ڕووی یارە کە پێغەمبەری ئیسلامە (د.خ):

ڕووتی دی، لەو ڕۆژەوە، گەر ڕۆژە سەرگەردانە ڕۆژ
گەیییە ئێوارە، وەکو من، ئیشی قوڕ پێوانە ڕۆژ(٦).

واتا: لەو ڕۆژەی کە خوا نووری محەممەدی (د.خ) ئەفراند، لەو نوورە بوونەوەری داهێنا (ڕۆژیش یەکێکە لەوان)، بۆیە ڕۆژ حەز دەکا بەرەو کانگای خۆی بچێتەوە کە نووری محەممەدە و

هەر لەو ڕۆژەوە بەدوایدا دەگەڕێت.

کە ڕۆژ عاشق بێ، دەبێ لە پێناو عەشقەکەیدا سەر دابنێ چونکە ئەوەی بەگەڵ کاروانی ئەوین کەوت ئەمە پیشەیەتی:

ڕەهڕەوی ڕێگەی مەحەببەت وادەبێ، هەرسەعیەتی
تا هەیە لەم ڕێگە ئاخر کاری سەردانانە ڕۆژ(٧)

هەرچەندە لە جیهانی هەستیدا مانگ بەرامبەر ڕۆژ خۆی ناگرێ و تیشکی دەشاردرێتەوە، کەچی لەم هەڵوێستەدا کار ئاوەژۆیە و ڕۆژ کە عاشقە و پەروانە ئاسا لە دەوری مۆمی ئەو مانگە دێت و دەچێ و چاو لە پەروانە دەکا و دەیکاتە مامۆستای خۆی لە سووتاندا هەر وەک سەعدی شیرازی دەڵێت:

ای مرغ سحر عشق ز پروانه بیاموز
کان سوختەرا جان شد و اواز نیامد(٨)

بەم جۆرە مەحوی ئەم واقیعە پێچەوانەیە دەگونجێنێ بەکاریگەری ئەو عەشقەی کە نەشیاوە دەشێنێ:

لاجەرەم کردوویە نووری جیلوەی ئەو ماهە بەچاو
دەوری بۆ ئەو شەمعەیە دایم وەکو پەروانە ڕۆژ(٩)

ئەوەی مەحوی ڕۆژی بەعاشق داناوە و ڕوونی کردۆتەوە کە لە پێناو ئەو عەشقەدا داوێنی هەڵکردووە و لە تەواف دایە، ئینجا داوا دەکا هەر کەسێ کە دەیەوێ بگاتە یار دەبێ ڕۆژ ئاسابێ و ئارامگرتن نەزانێ، کەواتە عەشقەکە دابەزییە سەر زەوی و مرۆڤ بەدوای نووری محەممەدیدا (د.خ) وێڵە:

مەطلەبت گەر یارە، هەر سەعیت بەکارە دائیما
بۆ طەوافی قاپییەک وا پەرزەدە دامانە ڕۆژ(١٠)

دووبارە شاعیر بەرەو عەشقی ڕۆژ دەچێتەوە و ڕوونی کردۆتەوە کە ڕۆژ دەبێ بەشەو پێکی لە دەستی مەیگێڕ (خوا) وەرگرتبێ بۆیە وا بەمەستی لە بەیاندا سەر دەردێنێ و کەوتۆتە مەقامی نەمانەوە (فناء):

شەو دەبێ بادەی لە دەستی ساقییەک وەرگرتبێ
ئەم سبەینێیە لە مەشریق دێتەدەر مەستانە ڕۆژ(١١)

ئەمجارە دولبەر لە شێوەی لەیلادایە، ئەمەش پیشەی گەلێ لە عاریفەکانە کە خوا یان پێغەمبەر (د.خ) لە شێوەی ئافرەتێ بەدی دەکەن، چونکە ڕەگەزی (مێ) لای یۆنانی و میسری و جاهیلی و مەسیحییەکان پیرۆز بووە. بۆیە ڕۆژ کەوتۆتە شاخان و بەدوای یاردا دەگەڕێ، واتا:

هەڵاتن و ئاوابوونی لەودیو شاخەکان لای شاعیر جۆرە گەرانێکە بەدوای جوانی یاردا:

ئەڵبـــەتە مـــەجنوونی ڕۆژی ڕوومـــەتی لەیلایەکــە
موتتەصیل، شام و سەحەر، کەوتۆتە ئەم شاخانە ڕۆژ(١٢)

ئەو عەشقەی مەحوی لەم غەزەلەدا دەستنیشانی کردووە بەردەوام لە جێگۆڕکێ دایە لە نێوان ڕۆژ و مرۆڤ، لەم بەیتەی خوارەوەدا شاعیر خۆی دڵدارە و لەبەر جوانی یار ڕۆژی لەبەر چاو کەوتووە، دوور نییە مەبەستی لەو مانگە نووری پێغەمبەر (د.خ) بێ، بۆیە لەبەر ڕووناکی ئەو پێویستی بەڕووناکی ڕۆژ نییە، چونکە ڕۆژیش لەوەوە ڕۆشنی بۆ هاتووە:

مـاهەکـەم ئەمـشـەو شـوکـر پرتەوفـشـانی خـانەیە
قەت لە دەرگا دەردەچم گەر بێتە ئەم سەربانە ڕۆژ(١٣)

ڕۆژ لە ئەوینەکەیدا بێ ئارامە و تا ڕۆژی بەپابوون کەس چارەی ناکا گەر مەسیحیش بێ، چونکە دەرمانی دڵدار گەیشتنە دولبەرە و ئەمەشی بۆ نەڕەخساوە:

ئەم گـلاراوەی لە عـیـشـقـە تا قـیـامـەت هەردەبێ
صەد مەسیحا چاری ناکا، دەردی بێ دەرمانە ڕۆژ(١٤)

ڕۆژ بەشـەو و ڕۆژ وێڵی بینینی ئەو یارەیە، بەڵام بەو هەمـوو تیـشکەوە پەی پێ نەبرد و بەجیلوەی نووری شاد نەبوو، چونکە ئەو نوورە لە نووری خواوەیە و شەو و ڕۆژی ئاسایش دەمی بینینی ئەو نوورە نییە:

ڕۆژ و شـەو ئەم سـەر زەمین و بن زەمـینەی پشکنیی
نەبووە شوێن هەڵگر لە عەکسی جیلوەی ئەو جانانە ڕۆژ(١٥)

لە سەرەتاوە تا ئێرە عاشق دیارە کە ڕۆژە و وەکو گۆیە لە مەیدان و عەشقیش گۆچانەکەیە، بەڵام هێشتا گۆچان بازەکە بە تەواوی دیار نییە:

ڕۆحی بەفـداکـە بزانە کـێـیـە چەوگـان بازەکـە
«مەحویا» چەوگانە عیشق و، گۆیە لەم مەیدانە ڕۆژ(١٦)

***

لێرە بەولاوە دولبەر بەدیار دەکەوێ و ئاشکرایە کە مەبەستی پێغەمبەرە (د.خ)، چونکە (ڕۆژ)ی عاشق بێ هێزە لەوەی کە نەیتوانی بەڕووناکی خۆیەوە بگاتە خزمەت دولبەر و بەڵکو شەو ئەو مەزنییەی بەنسیب بوو و یار (محەممەد) بەشەو بەرەو ئاسمان ڕۆیشت:

حەقیە ڕۆژ و شەو کە بێ تابی دەکا، وادەی ویصال
شەو بوو، بێبەش ما لە وەصڵی ئەو سەراپا جانە ڕۆژ(١٧)

کەواتە لەم بەیتەوە ڕۆژ بەرەو نائومێدی دەچێ و شەو جێگای دەگرێتەوە لە عەشقەکەدا،

چونکە لە داوێنی ئەو شەوەدا بەرەبەیانی هیوای سەدەها ساڵی لێ دەپشکوێ و هەزاران ڕۆژ خۆیان پەنهان داوە:

شەو چ شەو، لێ پشکواوی قەرەنەها صوبحی ئومێد
هەر لە داوێنی یەکێ صوبحا بەلەک پەنهانە ڕۆژ[18]

بەم پێیە بەبۆچوونی مەحوی هاتن و چوونی شەو و ڕۆژ جۆرە گەڕانێکە بەشوێن دولبەردا، کەواتە عەشق هەموو گەردوونی داگرتووە، بەڵام لەو گەڕانەدا ڕۆژ بەو هەموو ڕووناکی خۆیەوە نەگەیشتە ئەنجام و شەو ئەم شەرەفەی پێ ڕەوا بینرا، بۆیە دەبینین شەو دەبێتە ئۆقیانووسێکی مشت لە عەنبەر و ڕۆژیش لە داخاندا دەسووتێ و دەبێتە خۆڵەمێش:

شەو نەبوو، بەحری موحیطی عەنبەری بوو، ناوی شەو
بوو بەنیسبەت ئەو شەوە، خاکستەری گوڵخانە ڕۆژ[19]

***

دوای ئەوەی بەکورتی لایەنی سۆفیگەری لەم غەزەلە دەستنیشان کرا، ئێستاش وا بەچاک دەزانرێ کە زاراوەکانی سۆفیگەری لەم شیعرەدا نیشان بدرێن بۆ زیاتر پشت ئەستووربردنی بۆچوونەکان، وشەکان بریتین لە مانەی خوارەوە (ئیحسان، بەحر، پەروانە، جیلوە، جانان، چەوگان، خودا، ذات، ڕۆژ، ڕۆح، ساقی، سوجدە، شاه، شەمع، عیشق، گەوهەر، گوڵخان، مەحەببەت، مەست، میعراج، نوور، ویصال، وەصل)، لەم (٢٣) زاراوەیەدا تەنیا یەک زاراوەی حاڵی بەکارهێناوە کە (مەحەببەت)ەو زاراوەیەکی مەقامیشی بەکارهێناوە کە (ئیحسان)ە.

**شەو:**

شەو لای شاعیران بەگشتی نائومێدی و نایەتی (سلبی) دەگەیەنێ، بەڵام لای مەحوی شکۆمەندی و ئایەتی (ایجابی) نیشان دەدا، چونکە ئەو شەوەی مەحوی باسی دەکات شەوی مەرد و خۆشەویستانی خوایە و بەبۆچوونی (شەبستەری)[20] بریتییە لە (خودی تەنیا – خوا) کە لەبەر بێڕەنگی بەشەو دەچوێنرێ چونکە لە شەوی تاریک شت لێک جوێ ناکرێتەوە و ڕۆشنیشەکە بەخودی خۆی ڕووناکە و هەموو شتێ نوور لەو وەردەگرن، بۆیە ئەو شەوەی شاعیر مەبەستێتی شەوی جیهانی جەبەڕووت و مرۆڤییە.

مەحوی بەشەوی جیهانی جەبەڕووت دەست پێدەکا ئەو شەوەی کە لە نێوان جیهانی هەستی و ناهەستی دایە، دەبینین تاکە سوارەی ئەو شەوە پەروانەیە کە لەبەر عەشقی ڕاستەقینەی خۆی دەسووتێنێ، پەروانەش لای عاریفان ئوستادی عەشقە:

شەو کەسێ پرسیی لەخۆ دەرخستنی پەروانە شەو
ئەو وتی: ناتێگەیشتوو! تەجرەبەی مەردانە شەو[21]

مەحوی لەوە ئاگادارە کە شەو لە سەردەمی ئەودا بەسووکی سەیری دەکرا و هێمای ئازار و مەینەت بوو، بەڵام ئەم شەوەی مەحوی بەپێچەوانەی ئەو شەوە زۆر پایە بەرزە و نووری هیدایەتی عاشقانی خوای تێدا دەردەکەوێ و ئەگەر ئەو نەبێ ئەستێرەکان نابینرێن:

هەرسیا بەختانی عیشقە و مەظهەری نووری هودان

شەو نەبێ ئەستێرە مەستوورن، بەکەم مەڕوانە شەو(٢٢)

ئەمجارە شەو دەبێتە شەوی مرۆڤی و پەردەپۆشی گوناهکارانە، سەرەڕای ئەمەش ڕۆژی مەحوی هێندە ڕەشە بۆیە خەڵکی ئاگایان لە گوناهی گوناهکاران نییە، ڕەشی ڕۆژی مەحوی بۆ خۆی نایەتییە و بۆ غەیری خۆی ئایەتییە، بەڵام ڕەشی شەوەکە بۆ هەموان ئایەتییە:

ئەم سیا ڕۆژی منە پۆشیوییە عەیبی کەسان

ئاشکارە سەتری ئەحواڵی گونەهکارانە شەو(٢٣)

هەر ئەم شەوی مرۆڤییەیە لە خزمەتی خۆشەویستانی خوایە نووریان ئاشکرابێ و ڕابەریی دەوروبەریان بکەن، کەواتە هەرچەندە شەو بەشێوە تاریکە بەڵام بۆ ئەهلی دڵان دەمی دەرکەوتنی نووریانە، ئەم نوورەش لەو نوورەوەیە کە لە کێوی توور تەجەللای کرد:

بۆیە ظوڵمەت پۆشە، نووری ئەهلی جەوهەر دەرکەوێ

سەیری حەققیکەن لەسەر ئەم ماه و ئەستێرانە شەو(٢٤)

شەو لای سۆفی زۆر مەزنە، چونکە کاتی ڕازونیاز دەرخستنی دڵدارە دولبەرە و هاودەمی عاشقە و سەرەڕای ئەوەی کە پەردەپۆشیشە و وەک مەحرەمێ خۆی نیشان دەدا و ڕازگر و هاودەردی عاشقانە:

نەبووە، نابینی لە شەو مەحرەمترێ تا ڕۆژی حەشر

پەردە پۆشە، هەمدەمە، هەمدەردی عوشقانە شەو(٢٥)

شەو دڵدارە و بەشوێن ڕۆژی دولبەریدا وێڵە و هەر لە چاوەڕوانیی دەرکەوتنێتی، ئەو عەشقەی شەو هەیەتی ئەزەلییە و بەدیارکەوتنی ڕۆژی دولبەری مەحوو دەبێتەوە لەبەر پێیدا:

شەو هەموو شەو چاوەڕێیە ڕۆژ هەڵێ، هەر ڕۆژهەڵات

مەحوە سەرتاپا لەبەر پێیا فیداکارانە شەو(٢٦)

مەحوی تانە لە عاشقە فێڵبازەکان دەدا و بەخۆ پەرستیان دادەنێ، چونکە لە عەشقێکی ڕووکەشیدان و سەرکزییان بۆ وەدەستهێنانی جیهانی مادەیە، ئینجا ڕوونی دەکاتەوە کە عاشق دەبێ خۆ بۆ مەعشووقەکەی بەخت بکا و پەروانە ئاسا بسووتێ، بۆیە شەو کە دڵداری ڕۆژە هەر کە دەرکەوت خۆی بەقوربان دەکا و بارگەی تێک دەنێ:

خـود پەرسـتـینە! لە شـەو فـێـری پەرستن بن، کـە خـۆر
هەر دیاری دا، بەدەوری سـەریەدا قـوربانە شـەو(٢٧)

ئەمجارە مەحوی خۆی وەکو شەو داناوە و هەردووکیـان لە داخی یاریان دەروونیـان ڕەشبـووە، کەواتە ڕەشیی شەو لە سووتانی عەشقەکەیەوە هاتووە، بەم جۆرە شاعیریش شەو ئاسا بەدوای دولبەریدا وێڵە و کەوەڕێیە:

فـیـــرقــەتی ڕۆژە دەروونی کــردە داغــێکی ســیــا
وەک منی سەودا زەدە ئاتەش زەدەی هیجرانە شەو(٢٨)

لەم غەزەلەدا شەو دڵدارە و ڕۆژ دولبەرە، تاریکی شەو نیشـانەی سووتانێتی لە عەشقدا، هەر ئەم تـاریکیـەیە کـە دەبێـتـە هۆی پەیدابوونی ڕووناکی ڕۆژ، لـەم ڕوانگەیەوە شـەو لای مـەحـوی فەزڵی بەسەر ڕۆژدا هەیە، چونکە لە داوێنی ئەوەوە ڕۆژ دەردێ، دوور نییە مەبەستی شاعیر لە (تیرەگی) پێش ئەفراندن بێ، جا لەم تیرەگییەوە ڕووناکیی ڕۆژ دەرکەوتووە:

تیــرەگــیی وا فــەزڵی بۆ نادەم بەســەر ڕووناکــیــیـا
مەنشەئی ئیظهاری جیلوەی فەیضی سبحەینانە شەو(٢٩)

***

لەمەوبەر شەو وەکو عاشقی ڕۆژ خۆی دەردەخست، لێرە بەدواوە دەگەڕێتەوە سەر بنەچەی خۆی و وەکو شـەوێکی مـرۆڤی خۆی نیـشـان دەدا و ئەوەدەم و کـاتەیە کە عـاشقـانی خوا ڕاز و نهـێنی خۆیانی تێدا نیشـان دەدەن، چونکە عەشقی خوایی نهـێنییەکە و نابێ دەربخرێ، هەروەکو بابا تاهیری هەمەدانی لەم ڕووەوە دەڵێ:

نـەمـــــیـــــدانم کـــــە ڕازم واکـی واژەم؟
غـــــەمی ســــۆز و گــــودازم واکـی واژەم؟
چ واژەم هـەرکـی زوونـە بـنـگـرەفـــــــــاش
دیـگـەر ڕازونـیـــــــــــازم واکـی واژەم؟(٣٠)

کـەواتە ئەهلی نیـاز بەشـەو گـرێی دڵی خـۆیان دەکـەنەوە و ڕێیـان پێ دەدرێ، چونکە شـەو پەردەیەکە لە نێوان چاوی سەر و بینینی ئەو حاڵەتانەی کە لە ژوانی عاشقانی ڕاستی ڕوودەدا، لەم بارەیەوە مەحوی دەڵێ:

هەر لە تـاریکـیی شـــــەوایە ڕێ درێ ئەهلـی نیــــاز
ڕازی دڵ ئیفشا بکەن، خەڵوەتگەهی خاصانە شەو(٣١)

شـەو کـانگـای ڕازونیـازە، شـەو ڕۆیینی پێغـەمبـەر(د.خ) قـەدر و بەرات هەر لە شـەودا بووە، بەلای مەحوی میعراج گەیشتنی دڵدارە بەدولبەر لە شەودا «ثم دنا فتدلی فکان قاب قوسین أو

أدني» (٣٢)، بەم پێیــە دەبینین شــەو لەم غــەزەلەدا دوو ڕۆڵی گــرنگی هەیە، یەکــەم دڵدارە و بەدوای خۆری دولبەریدا عــەودالە، دووەم کـاتێکی پیــرۆزە و سەرچاوەی ڕاز و نهــێنییــەکـانە لە ئەزەلدا، چونکە بوونەوەر لە سەرەتادا تاریک بووە و دوایی لێک جودا بوونەتەوە:

هێندە صاحێب سیڕە، (میـعراج) وشەی (قەدر) و (بەرات)

خـاصەجـاتی ئەون و مـومـتـازە بەم ئەسرارانە شـەو(٣٣)

شەو هەندە پایەیەرزە لای مەحوی کە دەیکاتە دەریایەکی مشت لە دوڕی خواناسین، بەڵام ئەو دەریایەی کە مەترسیی خنکانی لێ ناکرێ، چونکە ئەوەی مەلەوان نەبێ زاتی ئەوە ناکات خۆی هەڵداتە ناویەوە، لێرەدا ئەم دوڕ و دەریایە بۆ سەرەتای خولقاندنی گەردوون دەگەڕێتەوە، کە هەر خـوا هەبووە و نەناسـراوە، هەر وەک لە حـەدیسی قـودسـیـدا هاتووە «كنت كنزاً مـخـفـيـاً مـخلقت الخلق كي أعرف» (٣٤) بەم پێیە شەو دەمکاتی وەدەستهێنانی ئەم مرواریی ناسینەیە:

هەر کــەسێ طالیب بەدوڕڕی مــەعــریفــەت کــۆکــردنە

پڕ لە دوڕ دەریایەکی بێ مــەهلەکــەی خنکانە شـەو(٣٥)

ئێســتــاش دوای لێکدانەوەی غــەزەلەکـە لە ڕوانگەی سـۆفـیـگەرییــەوە، وا بەچاک دەزانرێ زاراوەکانی سۆفیگەری دەستنیشان بکرێن بۆ دەوڵەمەندکردنی غەزەلەکە لەلایەنی عـیرفانییەوە، زاراوەکـانیش ئەمـانەن (ئاتەش، ئاوی حەیات، ئەحواڵ، پەروانە، جان، جـیلوە، جەوهەر، حەق، خـضـر، خـەڵوەتگەهـ، خـودا، داغ، دڵ، دەریا، دەروون، دوڕ، ڕاز، ڕۆژ، سـەودا، سـیـر، شـەو، ظولمەت، عـیشق، عـوشاق، فەیض، فـیراق، فـیرقەت، مەحرەم، مەعـریفەت، مەحوو، میـعـراج، نوور، هیجران).

## بەشی دووەم

### بەرامبەرێکردنی هەردوو غەزەلەکەی مەحوی و حەمدی:

حەمـدی لە چینی سێیـەمی شـاعـیـرانی قـوتابخـانەی بابانە و خـاوەن شێـوازێکی چروپڕە و لە داڕشتنە هونەرییەکانیدا هاوتای کەمە، بەڵام نابێ ئەمە پشتگوێ بخەین کە هەمـوو شاعیرێ کەم تا زۆرێ کاریگەری شاعیرانی تری بەسەرەوەیە، حەمدیش وەکو ئەو شاعـیرانە بە (کوردی و نالی و مەحوی) کـاریگەر بووە و ئەمەشی لە چوارینەیەکدا ئاماژە پێکردووە و وای بۆ چووە کە مەحوی خەرمانی شیعری کوردیی تالانکردووە و دەیەکەکی داوەتە حەمدی وەک دەڵێ:

خەرمانی لەفظی کوردی، کوردی کە کردی پێوان

نـالی کــە نـاڵـی کــاســەیەکی دا بەئەو لێــوان

تاراجی کـرد کە مـەحوییـەفـەندی بەلوطفی خۆی

عـوشریشی دا بە(حەمدی) وتی بیبەرە دیوان(٣٦)

جگە لەم چوارینەیە حەمدی پێنج خشتەکییەکی لەسەر غەزەلێکی مەحوی نووسیوە و[٣٧] ئەمەش بەڵگەیەکی ترە کە حەمدی یەکێکە لە قوتابییە بلیمەتەکانی قوتابخانەی شیعری مەحوی.

لە پێداچوونەوەیەکی ئاسایی دیوانی حەمدی دەرکەوت کە لە دوو غەزەلی (شەو و ڕۆژ) و پێنج شوێنی تر کارتێکردنی مەحوییان پێوە دیارە، بەڵام تەوەری لێکۆڵینەوەکە تەنیا هەردوو غەزەلی (شەو و ڕۆژ) دەگرێتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا سەرەتایەکە بۆ لێکۆڵینەوەی تر لە ئایندەدا گەر خوا یار بێت.

**ڕۆژ:**

گەر بەوردی سەیری هەردوو غەزەلی مەحوی و حەمدی بکرێ دیاردەکەوێ کە هەردووکیان ستایشی ڕۆژ دەکەن و مەزنیەکەی دەستنیشان دەکەن، هەروەها ئاشکرا دەبێ کە غەزەلەکەی حەمدی کاریگەری غەزەلەکەی مەحویی پێوەیە لە دوو لایەنەوە:

**١- لایەنی ڕوخسار:**

أ- هەردوو غەزەلەکە لەسەر عەرووزی عەرەبین و لە بەحری ڕەمەلی هەشت هەنگاویی مەقسوورن.

ب- دوا سەروایان (ڕۆژ)ە و پێش سەروایان مۆرفیمی (انە).

**٢- لایەنی ناوەڕۆک:**

حەمدی و مەحوی لە شیعرەکانیاندا بەدوای یارێکەوە وێڵن و بەرەبەرە ئەوینەکەیان بەرەو قوڵایی دەچێت و لەناکاو بەرەو خۆشەویستی پێغەمبەر (د.خ) دەگوازرێتەوە.

یارەکەی حەمدی خۆشەویستێکێتی کە لە شاری (کوێت) بەند بووە، بەڵام خۆشەویستەکەی مەحوی پێغەمبەرە (د.خ)، ئەوەی زیاتر کاریگەریەکە دەسەلمێنێ ئەوەیە کە مەحوی ئەو غەزەلەی کە لەسەر (ڕۆژ)ە وەک بڵێی دوو پارچەیە و لە پارچەی یەکەمدا ڕۆژ عاشقە و پێغەمبەر (د.خ) مەعشووقە، دوای ئەم پارچەیە دێتە سەر شەوی میعراج، حەمدیش بەهەمان شێوە غەزەلەکەی دوو بەشە و بەشی یەکەمی لەسەر خۆشەویستە بەندکراوەکەی کوێتە و ئەویتری باسی میعراجە. بەم پێیە هەردوو پارچەکەی مەحوی لە چوارچێوەی عەشقێکی سۆفیانە دایە و ئەوەی حەمدی پارچەی دووەمی سەر بەشیعری ئاینییە. ئێستاش وا ئاماژە بەلایەنە لێکچووەکانیان دەکرێ بەنموونەی شیعرییەوە:

حەمدی:

مـن لە پـێکەوتم لە دووی ئەو مـــاهە جـــانۆیەی ئەوە
کـــائیناتی پشـکنیـــوە، وێڵ و ســـەرگـەردانە ڕۆژ[٣٨]

مەحوی:

ئەڵبــــەتە مـــەجنوونی ڕۆژی ڕوومـــەتی لەیلایەکــە
مـوتتـەصیـل شام و سـەحەر، کـەوتۆتە ئەم شـاخـانە ڕۆژ[٣٩]

ئەو ڕۆژەی حەمدی باسی دەکا، ڕۆژێکی ئامادەیە چونکە شاعیر و ڕۆژ هەردووکیان بەدوای یاردا وێڵن، بەڵام ڕۆژەکەی مەحوی ڕۆژێکی ئامادە و ئەزەلییە چونکە تەنیا ڕۆژ عاشقە و بەدوای یاردا کەوەڕێیە.

لەهەردوو بەیتەکەدا ڕۆژ بەدوای بینینی یاردا وێڵە و لە گەڕانیدا بەو کێوانەوە شەکەت بووە و گەردوونی پشکنیوە، جا دەبێ ئەو لەیلایە کێ بێ کە ڕۆژ کەوتۆتە ئەوینییەوە؟ بەپێی بەیتەکانی دوایی ئەو لەیلایە پێغەمبەرە (د.خ) کە خودان پەڕجووی میعراجە.

حەمدی:

گــەر بەئومــێــدی ویصــالی شــامی زوڵفی تۆ نەبێ
ســەر لەکــەل دەرنایەنێ هەر نایەوێ ئەو مــانە ڕۆژ[٤٠]

مەحوی:

ڕووتی دی لەو ڕۆژەوە گــەر ڕۆژە ســـەرگـــەردانە ڕۆژ
گـەییە ئێـوارە، وەکـو من، ئیـشی قـوڕ پێـوانە ڕۆژ[٤١]

حەمـدی لە ڕۆژی ئامـادە دایە، بەڵام مـەحـوی لە ڕۆژی ئەزەل دایە و کـەمـێکیش بەرەو ڕۆژی ئامادە هەنگاو دەنێ. هەردوو بەیتەکە باسی جوانی ڕووی یارێ دەکەن کە ڕۆژیش گیرۆدەی ئەو جوانییە بووە و لە داخاندا خەریکی قوڕپێوانە و گەر لەبەر بینینی ڕووی ئەو یارە نەبێ جارێکیتر سەر دەرناهێنێ.

حەمدی:

ئەو شـەوی مـیـعـراجـە فـەخـری ئەنبـیـا دەعـوەت کـرا
تاقــە نانێ بـوو خـــرایە ســەردەمی ئەوخـــوانە ڕۆژ[٤٢]

مەحوی:

شــەو شــەوی مـیـعــراجی شــاهی ئەنبـیـا بێ، وا دەبێ
بیـپـەرسـتێ، بەڵکی سوجـدەی بۆ ببـا هەر ئانە ڕۆژ[٤٣]

حەمدی و مەحوی هەردووکیان لە شەوی گومبوو دان و یادی میعراج دەکەنەوە، ئەو شەوەی کە (محەممەد) (د.خ) بۆ ئاسمان دەعوەت کرایە سەر سفرەی خوایی.

داهێنانی حەمدی لەوەدایە کە ڕۆژی کردۆتە نان و لەسەر ئەو سفرەیەی داناوە، لێکچوونەکەش لەبەر خڕی و زەردی و گەرمییە، هەرچەندە حەمدی وەکو مەحوی باسی کڕنۆشی ڕۆژی نەکردووە،

بەڵام لەژێرەوە دانانی ڕۆژ وەکو نانێ لەسەر سفرە جۆرە کڕنۆشێ دەگەیەنێ کە لەسەر ڕوو بکەوێ، ئەوکاتە سفرەکە دەبێتە بەرماڵ.

حەمدی:

ئەو شـــەوە ئەو ئیـــحـــتـــیـــرامـــە تا حـــەشـــر نابێـــتـــەوە
گـــەر دەگـــیـــرێ بیکەنە قـــوربانی ئەو قـــوربانە ڕۆژ(٤٤)

مەحوی:

من فـــیـــدای ئەو زاتە بم، بەو، ئەو شـــەوە بوو بەم شـــەوە
تا قـــیـــامـــەت هەر حەسـەد با بەو شکۆهـ و شانە ڕۆژ(٤٥)

هەردووکیان باسی پلەوپایەی ئەو شەوە مەزنە دەکەن و ئێرەیی پێ دەبەن و ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە ڕۆژیش ئێرەیی بەو شەوە دەبا، حەمدی زیاتر لە گەورەیی ئەو شەوە دەکۆڵێتەوە و داوای ئەوە دەکا گەر ڕۆژ بگیرێ ئەوا بیکەنە قوربانیی ئەو شەوە، جا لێرە وشەی قوربانی نزیکبوونەوەش دەگرێتەوە کە لە (قرب)ەوە هاتووە.

**شەو:**

هەروەها لە هەردوو غەزەلەکەی مەحوی و حەمدی کە لەسەر شەویان نووسیوە لێکچوون بەدی دەکرێ و بەگشتی هەردووکیان باسی شکۆمەندیی شەو دەکەن و فەزڵی بەسەر ڕۆژدا دەدەن، لەبەرئەوەی نهێنییەکانی خۆشەویستی هەر لە شەودا بەدیار دەکەوێ، سەرەڕای ئەمەش بەرات و شەوی قەدر و میعراج هەر لەشەودا ڕوویان داوە و یاد دەکرێنەوە.

سەرەڕای واتای گشتی غەزەلەکان لە شێوە و ڕوخساریشدا پێک دەچن و هەردووکیان لەسەر بەحری عەرووزیی ڕەمەلی هەشت هەنگاوی مەقسوورن و دوا سەروایان وشەی (شەو)ە و پێش سەروایان بە(انە) کۆتایی هاتووە. بەڵام لە ڕووی واتاوە جگە لەوێکچوونی واتا گشتییەکەی هەست دەکرێ کە ئەم بەیتانەی خوارەوەی حەمدی کاریگەری بەیتەکانی مەحوییان پێوە دیارە:

حەمدی:

کـــــردەوەی دنیـــــا کـــــە هەر عـــــەریبـــــە ئەبێ داپۆشـــــرێ
پەردەیێکی موختەصەر خاصی بەسەر دادانە شەو(٤٦)

مەحوی:

ئەم ســـیـــاڕۆزیی منە پۆشـــیـــویـــیـــە عـــەیبی کـــەســـان
ئاشکارە ســـەتری ئەحـــواڵی گـــونەهکارانە شـــەو(٤٧)

هەردوو شەوەکان لە خانەی شەوی مرۆڤی دان و باسی کاتی جیهانی هەستی دەکەن، حەمدی و مەحوی لەوە دەدوێن کە شەو تاوانی گونەهباران دادەپۆشێ، لەلای حەمدی پەردەیەکی

بەسەرادەدا، بەڵام مەحوی زیاتر قووڵ بۆتەوە و ڕەشیی شەو بەجوانی و ڕەسەنی دادەنێ چونکە بۆتە پەردەیەک و تاوانبارانی لێوە دیار نابێت، ئەم سیفەتی شەوە ئاماژەیە بەم ئایەتە پیرۆزە «وجعلنا الليل لباساً...» (٤٨)

لێرەدا (لباس) جۆرە داپۆشینێکە.

حەمدی:

بێ سەر و سامان عەجەب دەریایەکی قەترانە شەو
ڕۆژی ڕەشبێ دۆزەخێکی مودەتی هیجرانە شەو (٤٩)

مەحوی:

فیرقەتی ڕۆژە دەروونی کردە داغێکی سیا
وەک منی سەودا زەدە ئاتەش زەدەی هیجرانە شەو (٥٠)

هەردوو شاعیر لە باسکردنی شەوی مرۆڤی دان، لە هەردوو بەیتەکەدا شەو لە داخی دوورکەوتنەوەی یاری ڕەش هەڵگەڕاوە و یارەکەش یا ڕۆژە یار ڕۆژ ئاسایە لە جوانیدا، حەمدی هەر تەنیا ناوەرۆکەکەی دووبارە نەکردۆتەوە بەڵکو لە ڕوخساریش پێی کاریگەرە و هەمان سەروا و پێش سەروای ئەوەی هێناوەتەوە کە (هیجرانە شەو)ە، مەحوی هەنگاوێ لە حەمدی زیاتر ڕۆیشتووە و شەی بەخۆی چواندووە کە لە داخی یاری ئاگری دووری سووتاندوێتی.

حەمدی:

هەر شەوی میعراجە تەنیا کائیناتە قیمەتی
(ليلة القدر)ی موقابیل صەد هەزار ڕۆژانە شەو (٥١)

مەحوی:

هێندە صاحێب سیرڕە (میعراج) و شەوی (قەدر) و (بەرات)
خاصە جاتی ئەون و، مومتازە بەم ئەسرارانە شەو (٥٢)

دیسان شەوەکان مرۆڤین، هەردووکیان باسی ئەو ڕاز و نهێنیانە دەکەن کە لە شەوی قەدر و میعراجدا پەیدا بوونە، هەردوو بەیتەکان لە ئاستی هونەریدا وەکو یەکن و هەر هێندە حەمدی بیرۆکەکەی لە مەحوی وەرگرتووە.

حەمدی:

حەمدی لادە لەم حیسابە کافییە بۆ تێگەیوو
چونکە ڕۆژی ڕۆشنی ئەهلی دڵ و ڕەندانە شەو (٥٣)

مەحوی:

شەو کەسێ پرسی لەخۆ دەرخستنی پەروانە شەو
ئەو وتی: ناتێگەیشتوو تەجرەبەی مەردانە شەو (٥٤)

ئەمجارە شەوەکان شەوی جەبەڕووتن و لە سنووری نێوان جیهانی هەستی ناهەستی دان، هەردووکیان لەوە دەدوێن کەوا مرۆڤی دانا تێدەگا کە شەو کاتی تاقیکردنەوەی مەردانی خوایە و لە شەودا خۆ دەردەخەن وەکو پەروانە کە لە پێناوی عەشقدا خۆی دەسووتێنێ.

هەرچەندە بەیتەکەی حەمدی ئاستی هونەریی نزم نییە، بەڵام هێشتا ناگاتە مەحوی کە زۆر شاعیرانە دایەلۆگێکی لە نێوان دوو کەسی دانا و نادان دروستکردووە لە بارەی خۆ دەرخستنی پەروانە لە شەودا.

## ئەنجام

لەم لێکۆڵینەوەیەدا توانرا ئەم ئەنجامانە بەدەست بهێنرێ:

١- سروشتی ڕۆژ لای مەحوی گۆڕاوە لە دولبەرەوە بۆ دڵدار.

٢- هەروەها سروشتی مانگیش گۆڕاوە و ڕۆژ لە دەوری دێت و دەچێ.

٣- یار لای مەحوی پێغەمبەرە و لای حەمدی برادەرێکێتی.

٤- عەشق لای مەحوی هەموو گەردوونی داگرتووە.

٥- شەو لای مەحوی شکۆمەندی و ئایەتی دەگەیەنێ.

٦- مەحوی و حەمدی باسی هەردوو شەوی مرۆڤی و جەبەڕووتیان کردووە.

٧- حەمدی کاریگەریی مەحویی پێوە دیارە لە هەردوو غەزەلی شەو و ڕۆژدا و کاریگەرییەکەش لە ناوەرۆک و ڕوخسار دایە.

٨- هەردوو غەزەلەکەی مەحوی سۆفیانەن و پارچەی دووەمی شیعرەکەی حەمدی ئاینییە.

٩- هەردووکیان باسی ڕۆژی ئامادە و گومبوو دەکەن، بەڵام مەحوی ڕۆژی ئەزەلیشی بۆ زیاد کردووە.

### پەراوێزەکان

(١) ناوی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا عوسمانی باڵخییە و لە دەوربەری ١٨٣٦ لە دایکبووە، باوکی خەلیفەی شێخ عوسمانی سیراجودینی تەوێڵە بووە و لای ئەو خوێندوێتی و چووەتە سنە و ساباڵاخ بۆ خوێندن و لای موفتی زەهاوی لە بەغدا ئیجازەی وەرگرتووە.

لە ١٨٦٢ بووەتە ئەندامی دادگا لە سلێمانی، لە ١٨٨٣ چووەتە حەج و لەوێوە بەرەو ئەستەمبۆڵ ڕۆیشتووە و چاوی بەسوڵتان عەبدولحەمیدی عوسمانی کەوتووە و ڕێزی لێناوە و لە سلێمانی خانەقایەکی بۆ بنیات ناوە، لە ١٩٠٦ وەفاتیکردووە و لە خانەقایەکەی نێژراوە. (دیوانی مەحوی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، ل٥-٧).

(٢) ناوی ئەحمەد بەگی کوڕی فەتاح بەگی ساحێبقرانە و لە ١٨٧٨ لە سلێمانی لە دایکبووە، لە قوتابخانەی سەرەتاییی ڕۆشدییەی عەسکەری و لە مزگەفتەکانی سلێمانی خوێندوێتی، نازناوی شیعری (حەمدی)

بووە و هەر لە منداڵییەوە حەزی لە شیعرکردووە و مستەفا بەگی کوردی مامی بووە و سالم ئامۆزای باوکی بووە. لە بزووتنەوەکەی شێخ مەحموودا ئازاری دیوە و هەموو سامانی لەو پێناوەدا خەرجکردووە و مرۆڤێکی بەهەڵوێست بووە. لە ١٩٣٦ وەفاتی کردووە و لەگردی سەیوان نێژراوە.

(٣) فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی، ص٤٣١ - ٤٣٢.

(٤) عزف علی وتر النص الشعري، ص٢٩ .

(٥) فرهنگ اصطلاحات و تعبیرات عرفانی، ص٤٩٧.

(٦) دیوانی مەحوی، ل١٣٧.

(٧) سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٧.

(٨) کلیات سعدی، محمد علی فروغی، ص٦٨.

(٩) دیوانی مەحوی، ل١٣٧.

(١٠) سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٨.

(١١) سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٨.

(١٢) سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٨.

(١٣) سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٩.

(١٤) سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٩.

(١٥) سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٩.

(١٦) سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٩.

(١٧) سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٠.

(١٨) سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٠.

(١٩) سەرچاوەی پێشوو، ل١٤١.

(٢٠) ناوی مەحموودی کوڕی عەبدولکەریمی شەبستەرییە لە (٦٧٨ ک - ١٢٨٨ع) لە ئازربایجان لە دایکبووە و لە (٧٢٠ ک - ١٣٢٠ع) وەفاتی کردووە. خاوەنی دیوانی (گلشن راز)ەو لە بارەی ڕێبازی یەکێتی بوونە، گلشن راز، شێخ مەحمود شبستری، چاپ اول سنندج ١٣٦٩ هـ.ش، ص٤ - ٦.

(٢١) دیوانی مەحوی، ل٢٥٦.

(٢٢) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٧.

(٢٣) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٧.

(٢٤) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٧.

(٢٥) دیوانی مەحوی، ل٢٥٨.

(٢٦) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٨.

(٢٧) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٨.

(٢٨) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٨.

(٢٩) سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٩.

(٣٠) ديوانی بابا تاهيری عوريان، ل١٧.
(٣١) ديوانی مەحوی، ل٢٥٩.
(٣٢) النجم/ ٨ .
(٣٣) ديوانی مەحوی، ل٢٥٩.
(٣٤) الكشف الالهي، محمد الطرابلسي، مكتبة الطالب الجامعي، مكة المكرمة، ١٩٨٧، ص٥٧٤.
(٣٥) ديوانی مەحوی، ل٢٦٠.
(٣٦) ديوانی حەمدی، جەمال محەممەد محەممەدئەمين، ل١٦٩.
(٣٧) ديوانی حەمدی، ل٧٤ .
(٣٨) ديوانی مەحوی، ل١٣٨ .
(٣٩) ديوانی حەمدی، ل٧٥ .
(٤٠) ديوانی مەحوی، ل١٣٧
(٤١) ديوانی حەمدی، ل٧٦ .
(٤٢) ديوانی مەحوی، ل١٤٠ .
(٤٣) ديوانی حەمدی، ل٧٦ .
(٤٤) ديوانی مەحوی، ل١٤١ .
(٤٥) ديوانی حەمدی، ل٧٧ .
(٤٦) ديوانی مەحوی، ل٢٥٧ .
(٤٧) النبأ/ ١٠ .
(٤٨) ديوانی حەمدی، ل٧٧ .
(٤٩) ديوانی مەحوی، ل٢٥٨ .
(٥٠) ديوانی حەمدی، ل٧٧ .
(٥١) ديوانی مەحوی، ل٢٥٩ .
(٥٢) ديوانی حەمدی، ل٧٨ .
(٥٣) ديوانی مەحوی، ل٢٥٦ .

## سەرچاوەكان

### كوردييەكان:


١- ديوانی بابا تاهيری عوريان، كيتابفرۆشی ڕەجەبی، تەهران.
٢- ديوانی حەمدی، چ١، جەمال محەممەد محەممەد ئەمين، چاپخانەی ئۆفيێستی سەركەوتن، سلێمانی، ١٩٨٤.
٣- ديوانی مەحوی، چ٢، مەلا عەبدولكەريمی مودەڕيس، چاپخانەی ئۆفيێستی حيسام، بەغدا ١٩٨٤.

فارسییەکان:
٤- فرهنگ اصطلاحات تعبیرات عرفانی، چاپ چهارم، د. سید جعفر سجادی، چاپ افست گلشن، تهران، ١٣٧٨.
٥- كليات سعدی، محمد علی فروغی، انتشارات نشر طلوع.
٦- گلشن راز، چاپ اول، شیخ محمود شبستری، سنندج ١٣٦٩ هـ. ش.
عەرەبییەکان:
٧- عزف على وتر النص الشعري، د. عمر محمد طالب، دمشق، ٢٠٠٠.
٨- الكشف الالهي، محمد بن محمد الطرابلسي، مكتبة الطالب الجامعي، مكة المكرمة، ١٩٨٧.

# کێش و سەروایەکانی شیعری مەحوی

نووسینی: شوکور مستەفا

ڕەنگە بەهەڵەدا نەچووبم کە دەڵێم، کەڵە شاعیرێکی وەکو مەحویی بەهەشتی، هێندەی لە مەڕ نووسراوە بەشی من و ئی وەکو منی بەبەرەوە نەمابێ، لە ئەردەو و فەزڵی، لە هونەر و شاعیرییەتی، لە دنیای سۆفیگەری و عیرفانیدا، کەم کەس لە کورد دەسکی لە دوو کردبێ...

ڕاستە مەحوی، بەچەشکەی قوتابخانەکەی نالی و سالم فریشکی هەڵدراوەتەوە، بەڵام بۆ خۆی، خێوی شەقڵ و مۆرکی سەردەقی خۆیەتی و زۆر بەسانایی و بەکراست دەتوانی، لە شەقڵ و مۆرکی شاعیرێکی دیکەی هەڵاوێری و تەنانەت کەسانێکی دیکەی پاشە وی کە بەو ژەکی عیرفان و سۆفیگەرییەی ئەو گۆش کراوە، دەستەپاچەی سەر خوانی وین. مەحوی زێتر لە دنیای عیرفاندا- بەمانا ئەقلانییەکەییم مەبەستە- باسکەمەلە و سۆبایی کردووە، تا عیرفانێکی میتافیزیکانەی بەحەواوە مۆلەق، مەحوی، بۆ هیچ واژەیێ، بۆ هیچ زاراوەیێ، بۆ هیچ مەجازی لێکچوواندنێ، بۆ هیچ مەجازی ئەقڵییەک، بۆ هیچ کینایەتێ، بۆ هیچ جۆرە ئیستیعارەیەک، لە موسەڕڕەحە، لە مەکنیە، لە تەخییل، لە تەمسیل، بۆ هیچ یەکێ لە وردەکارییەکانی بەدیعی لەفزی و مەعنەوی، دانەماوە. بەوپەڕی لە خۆڕا و بێ هیچ زۆر لەخۆ کردن و داتاشینی واژە و ڕستەی ئێسک گران و ناقۆڵا، بەسەلیقە و مجێزی کوردەوارییانە و تەکنیکی بەلاغەتی دەوڵەمەندی عەرەبی و فارسیی بەرەهاوەت و ڕەوانی و زار و پل پاراوی، هەمیشە سوار و سەردەق شکێنە. گزارەی لە دزێوی و بەد فەساڵیی ئاکاری کۆمەڵ کێشاوە، دڵی دەگەڵ بەدەنگ هێنانی هەقپەرستی و بۆ هەقیانەت، لێی داوە، شایبی بەمیر و گزیر و شا و سوڵتانان نەبووە. لە ڕەزای هەق وەولاوە، هێندەی باڵە پێشکەیەکی پەروا بەدنیا نەبووە.

مەحوی خۆی لە قەرەی زۆرینەی کێش و سەروایەکانی لە باوی عەرووزی شیعری دانستە داوە و هێندەی مووبەک، لەنگ و لەواری دە شیعرەکانیدا، هەست پێ ناکرێ ئەوەی لێ بترازێ کە ئەگەر ناشارەزایەک، شیعرێکی بەلەنگیی میزاجی خۆی بەشل و شەوێقی وەخوێنێ، وەینووسێ...

ئەوجا ئەمن، وا بینم بەسەرلەبەر دیوانە شیعرەکەیەوە ناوە و بەش بەوەندەی بۆم هەڵسووڕاوە، شایەتێکم بۆ کێشی هەر چامەیەکی، لە شیعری فارسی، بۆ هێناوەتەوە و ئەگەر وردە سەهوێکم لە کاکە محەممەدی برام، کە دیوانەکەی مەحوی شەرح و شرۆڤە فەرمووە بەسەر گرتبێتەوە، دیارە دوعای خێرم بۆ دەکا و بەر فەحوای "لكل سيف نبوة ولكل فارس كبوة" دەکەوێ...

جا لەبەر وەی باسەکەم زێتر وەک زانستی ئەژماری هیشک و برینگ دەچێ، دیارە

بەخوێندنەوەی سەرتان نایێشێنم، بەڵکو تەنێ ژمارە و جۆری بەحرەکانتان، عەرزی خزمەت دەکەم.

دە باسی سەروادا، دەڵێم، سەروا بۆ خۆی دە بنیچەدا زانستێکی سەر بەبەدیعە و شیعری فارسی و کوردی، هەر چەند هەر لەسەر بنجی سەروای عەرەبی رۆواوە، بەڵام سەروای تایبەتی خۆی هەیە.

جارێ دە هەموو شتێکدا، دە شیعری کوردی و فارسیدا، سەروا و ڕەدیف هەن، سەروا بریتییە لە هێندێ واژەی دواییی بەیت، بەمەرجێ بەهەمان خودی خۆی و بەهەمان مانا دووبارە نەبێتەوە، هەرچی ڕەدیفە، ئەوە واژە بەخودی خۆی و بەهەمان مانا دووبارە دەبێتەوە. دیارە کەوشەنی سەروا بەپیتی سەر و بۆر و ژێر (بزوێن) و زەنەدار، دەبێ بەپێنج جۆرەوە:

١- موتەکاویس: واتە سەروایەک کە چوار پیتی بەبزوێن و یەک پیتی زەنەداری هەبێ، وەک: "سەفەربەلک" و "فەرمان فەرما".

٢- موتەراکیب: واتە سەروایەک کە کەسێ پیتی بزوێندار و یەک پیتی زەنەداری هەبێ، وەک: "کەرەمم" و "لەبەرم".

٣- موتەدارەک: واتە سەروایەک کە دوو پیتی بزوێندار و یەک پیتی زەنەداری هەبێ، وەک: "سەحەر" و "هونەر".

٤- موتەواتیر: واتە سەروایەک کە لەپێش دوو پیتی زەنەدارییەوە، پیتێکی بزوێنداری هەبێ، وەک: "کوناوەدەر" و "هوڵواسم".

٥- موتەرادیف: واتە سەروایەک کە دوو پیتی زەنەداری لە دوو یەکدی بەدوادا بێن، وەک: "دەست" و "گەشت". هەرچی بزوێنەکانی پیتەکانی سەروان، ئەوە شەشن:

١- ڕس: واتە بزوێنی پێش ئەلفی تەئسیسە و ئەویش لەسەر "فەتحە" بەولاوە چیدیکە نییە، وەک: بزوێنی"م" لە "ماهیر"دا.

٢- ئیشباع: واتە بزوێنی پێش دەخیل، وەک "ی" لە "سمایل"دا.

٣- حەزو: واتە: بزوێنی پێش پیتەکانی ڕەدیف و قەید، وەک بزوێنی "م" لە "مەست"دا.

٤- تەوجیە: واتە: بزوێنی پێش ڕەویی زەنەدار، وەک: "ش" لە "سەرمەشق"دا.

٥- مەجرا: واتە: بزوێنی ڕەویی پێش پیتی وەسڵ، بەمەرجێ بە "خورووج"ەوە بلکێ، وەک بزوێنی "ن"ی "دوژمنی".

٦- نەفاز: واتە بزوێنی وەسڵ، بەمەرجێ بە "خورووج"ەوە بلکێ، وەک بزوێنی "م" لە "می سپارمت" لە فارسیدا.

هەرچی پیتەکانی سەروان، ئەوانە دەکرێن بە دوو دەستەی پێش ڕەوی و پاش ڕەوییەوە. پیتەکانی پێش ڕەوی:

١- ڕیدف، وەک: "ا"، "و"، "وو"، "ۆ"، "ی"، "ێ"، "وی" کە لەپێش پیتی ڕەوییەوە بێن، و ئەمەش دوو جۆرە:

أ- ڕیدفی ئەسڵی، کە بێ ناوبڕ لەپێش ڕەوییەوە دێ، وەک: "ا" لە "کار" و "و" لە "گوڵ" و "وو" لە دوور" و "ۆ" لە "زۆر" و "ی" لە تیر" و "ێ" لە "تێر" و "وێ" لە "گوێ" و "وی" لە "سویر"دا.

ب- ڕیدفی زێدە، کە لە نێوان ئەم هەشت بزوێنەی پیتی ڕەویدا، زەنەدارەکەی دەبێ بەناوبڕ، وەک: "ش" لە "فرۆشت"دا. لە نێوان پیتی ڕەوەی و پیتە بزوێنەکانی "ا"، "و"، "وو"، "ۆ"، "وێ"، "وی"، "ی"، "ێ"دا، شەش پیتی (خ، ڕ، س، ف، ن) دادەمەزرێن.

٢- قەید. واتە ئەو پیتە زەنەداری کە لەپێش ڕەوەدا دێ. قەید، دە پیتی هەیە: (ب، پ، خ، ڕ، ز، س، ش، غ، ن، ھ) وەک: سەبر، بەخت، سەرو، بەزم، دەشت، دەست، مەغز، ڕەنج، چەپەر.

٣- تەئسیس: واتە: ئەو ئەلفەی کە دەگەڵ ناوبڕی بزوێندارد لەپێش پیتی ڕەویدا، دێ، وەک: "ا" لە "عاشق"دا.

٤- دەخیل: واتە ئەو پیتە بزوێندارەی کە دە نێوان ئەلفی تەئسیس و پیتی ڕەویدا، دێ، وەک: "ھ" لە "ماهیر"دا. ئەوەت لەبیر نەچێ کە دووبارەکردنەوەی پیتی دەخیل، کارێکی ناچاری نییە. هەرچی پیتەکانی پاش ڕەوین:

١- وەسڵە، واتە: پیتی پاش ڕەوییە و، ڕەویی زەنەدار دەکا بەبزوێندار، وەک: "ت" لە "مویت" بەفارسی و "ی" لە "دوژمنی"دا.

ئەوجا لێرەدا من، هەرچەندە ئەم درێژدادڕییەم تەنێ بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست کردووە و ڕەنگە کەم کەس لەم سەر و بەندەدا هێندە بەتەنگ کێش و سەروای شیعرەوە بێ، دەمەوێ بەش بەحاڵی مەحوی ئاماژە بۆ کاربردی هونەرمەندانە و وەستایانەی سەروا بکەم. بەجوانی سوود لە سەروا وەرگرتن لە کەتەگۆریەگەلێکە کە شاعیری توانا و زەبردەست، دەگەڵ کەڵک وەرگرتن لە کار کرد و کارتێکرانی جۆراوجۆری دەروونی ، هونەری، مووزیکی و هتد... پەی بەرێ، بۆ نموونە واژەی "روزگار" هەموو کەسێ، بەهێندێ مایەی کەمەوە، دەتوانێ بیکا بەسەروا، بەڵام هەموو کەسێ ناتوانێ، وەک فیردەوسی بەکاری بەرێ:

"چنان پیش بنشاندت روزگار
کە بە زو نیابی تو اموزگار"

و هەروەها واژەگەلی "زین" و "زرین" و "رهایی" و "روشنایی" و "حق" "رونق" کە بەڕێزەوە دە سێ بەیتی فیردەوسی و نیزامی سەعدیدا بەم تەرزە بەکاربراون:

"بفرمود تا اسب زین کنند

دم انـدر دم نـای زریـن کـنـنـد"
"رها کن کـه در من رهایی نماند
چراغ مــــــرا روشـنـایـی نمانـد"
کـســانی کـه مـردان راه مـن اند
خــــریداردکــــان بی رونـق اند"

هەر بەکەمێ لەم چوار بەیتە وردبوونەوەیە، تێ دەگەین کە هەر چوار واژەی "زین" و "روزگار" و "رهایی" و "حق" و "رونق" کـه لـه سـەروایەکـانی بەرابەری خـۆیان کـورتـتـرن، سـەرلەبەریـان لە دێڕەکانی یەکەمی بەیتەکاندا هاتوون، دە حاڵێکدا ئەم شاعیرانە دەیانتوانی ئەم سەروایانەیان لە دێری دووەمی بەیتەکانیشدا، بەکار بردبا، بێ وەی قسەکانیان زەدەیەکی ئەوتۆی ڕێکەوێ، واتە بەجۆرێ کە ئاسەواری شاعیرە گەورەکانی زمانی فارسی، بەدیاری دێخن کە سەروا بەکاربردن بەمەرجێ لە عەیبەکانی سەروا بەدوور بێ، دە یەکەم دێڕدا شیعر جوانتر و بەئاوازتر دەکا... ئەمانە بەش بەحاڵی سەرواسەراییی مەحوی، کەم کەس بەتۆزی قولەپێیدا گەییوە و دەسکی لە دوو کردووە. ئەگەر هێنانەوەی دوو واژەی عەرەبی لە سەروادا کە دەتوانێ هاوکێشیی دوو دێڕە شیعر ڕاگرێ، وەک: ئەم بەیتەی نیزامی کە دەڵێ:

"اي چاردة ســالة قــرة العين
بالـغ نظـر علـوم كــــــونين"

خۆ مەحوی ئەم کارەی لەکن هەروەک ئاوخواردنەوە وایە، وەک:

"بەجێ نایە دەبێ ڕووکەینە سارا
حەقی ئادابی مەجنوونی لە شارا"

"کـە تێـغت دڵ دەکـا دوو قـەد، دەدا تەبشـیـری (قـد أفلح)
دەنووسـێتن لە صـەفـحـەی سینە تەفـسـیـری (ألم نشـرح)"
"حـەیاتم صـەرفی عـیـشـقت کـرد بەئومـێـدی (فـمن يعـمل)
بەهیـــجـــرت کـــوشـــتـم و نەتکردەوە فکری (ومن يعـــمل)"

ئەمن پێم وایە شـاعـیـرانی وەک نالی و مـەحـوی لەم ڕووەوە لە سـەڵەف سـەڵەفـێنەی سەرواپەرادازیدا لە شاعیرانی فارسی زمان کەم پایەتر نەبوون.

**هێندێ نموونەی عەرزووی شیعری مەحوی**

**یەک**: بەحری هەزەج موسەممەن سالم

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن    مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

---u /---u/---u /---u    ---u /---u /---u /---u

وەک:

اگــر آن ترک شــیــرازی بدست آرد دل مــارا
بخــال هندویش بخــشم ســمــرقند و بخــارا"
(حافز)

١- بەیادی ئەو لەبە، ئەی شۆخی ڕوومەت ڕۆژی مەه غەبغەب
لەبا لەب مـــا لە ناڵەم ســینە، هەروەک کـــۆتری لەبلەب
٢- کــە تۆ غــایب لەبەر چاوم دەبی، چم بێ لە تۆ غــایب!
قـــیـــامـــەت حـــازری بەر چاومــە خـــۆمم لەخـــۆ غـــایب
٣- دەپرسی بۆچی مـن دەرکـــــەوتم و دڵ بـۆ لە تۆ غـــــایب
کـە وەخـتێ ڕۆژهەڵات، ئەڵبــەت دەبێ شــەونم لەخــۆ غـایب
٤- خـەلاسی بوونی قــەت ناوێ ئەســیــری زوڵفی زنجـیــرت
لەبەر تیــرت، مــەلەک بێ، هەڵفـــڕینی نەبووە نەخــچــیــرت
٥- خـەرامی ناز ئەگــەر هێنایە لەنجــە ســەروی مــەوزوونت
وەکــو لەیلا، لەســەر ڕێ پرســشێ کــە حــاڵی مــەجنوونت
٦- بەدەم ئەمـــــواجی خـــوێنی ئەشکەوم، بڕوانە چۆنم بۆت
دەروونم کـــــەیلی زووخی دەرد و غـــــەم، بڕوانە چۆنم بۆت

٧- بە (مەوجی)، بەیتەکە لەنگ دەبێ، دەنا دەبێ (خ)ی "خوێنێ" بە کەسرەی موختەلەسە بخـوێنیـیـەوە، بەڵام کـارەکـە بە (ئەمـواجی) پێک دێ و چ پێـویست بەوە ناکـا بە Xiwenی بخوێنییەوە.

٨- خــودا بیــدا، لە هێــڵــێکی دەدا، ســەیری هەیە ڕێکەوت
وەنەوزم دا، نیگارم هاتە خـەو، ئەم شــەو خــەوم پێکەوت
٩- کـە تێـغت دڵ دەکـا دوو قـەد، دەدا تەبشـیـری (قد أفلح)
دەنووسـێتن لە سـەفـحـەی سینە تەفسـیـری (ألم نشـرح)دا بە
١٠- بەسـوورمـە بۆیە دولبـەر خـەنجـەری مـوژگـانی دا پەرداخ
دڵی هەڵ نـاگــرێ ببــینێ لە کــوشــتــەی دەنگی ئۆف و ئاخ
١١- دڵی ســووتا بەحــاڵی زاری تیــفلی دڵم و چاری کــرد
ســـەری زوڵفی لە دەم نا، زەهرەی مـــاری پڕ بەزاری کـــرد

١٢- ئەگەر تۆ ڕوو بەخاڵێکی لە لەیلا شۆخ و زێباتر
منیش ئاشفتە خاڵێکی لە قەیسم شێت و شەیداتر
١٣- موحەققە هەر کەسێ مەسلەکیە حەق، حەققییە مەنزوور
سلووکی چۆنە سەرداره، تەریقەی پیرییە مەنسوور
١٤- ئەوەندەی ئەهلی دنیان ئەهلی دنیا ، تاقە ڕۆژێ گەر
بەقەڕنێ من ئەوەند ئەهلی خودابم دەبمە پێغەمبەر
١٥- شەتێ ئاوی کە زاهید بۆ وزوویەک کردووە زایع
فەقیرە، هەر بەبایەک ئەو هەموو ڕەنگەی چووە زایع
١٦- ئەوی ئەمڕۆ بەدەوری نەختیایە هەلهەلەی مەخلووق
لە دەوری نەعیشا سبحەی دەبینێ وەلوەلەی مەخلووق
١٧- کە شێخ و واعیز و سۆفی بەجەننەت بەن گەد و گیپاڵ
دەبێ ئەمساڵی ئێمە بۆ جەهەننەم بەن سڕ و سیپاڵ
١٨- شنەی بادی بەهاری، هاتەوە خۆشی لە تۆ بولبول
بەشاییی هاتی گوڵ کۆکی کە سازی چەهچەهە و غولغول
١٩- حەیاتم سەرفی عیشقت کرد بەئومێدی (فمن یعمل)
بەهیجرت کوشتم و نەتکردەوە فکری (ومن یعمل)
٢٠- بنازم من بە کوفری زوڵفی تۆ ئەی ئافەتی ئیسلام
کە ئەستۆبەندی جیزیەی خستە مل ئیمانی خاس و عام
٢١- دیارم دەیری عیشقە ، جێ بەسووتن بێ لەوێ دەگرم
کە من مشتێ چڵ و چێوم، بەچی بم کەڵکی چی دەگرم؟!
٢٢- لە ناکەس کارییا ، خاکم بەسەر، ڕۆیی بەبا عومرم
خودا تۆ بمژییێنە تا لەبەر قاپیی کەسێ دەمرم
٢٣- ئەوی دڵدار و دولبەرمە ئەوا دەڕوا لەبەر چاوم
بەدوویا بۆچی دڵ نەتوێتەوە، نەڕوا لەبەر چاوم
٢٤- لە باسی مەینەت و دەردی دەروونی بۆیە دەم نادەم
لە خوێناوی دڵی پڕ غەم کە سینەم مەوج ئەدا تا دەم
٢٥- ئەسیری سەیدی قەیدی کەید و شەیدی نەفسی ئەممارەم
لە دەست ئەم مارە بەد چارە، چییە چارم، خودا چارەم!

٢٦- بەنووری بادی کـەشـفی زوڵمـەتی تەقـوا نەکـەم چبکەم
بەشـــەمــعـــێکی وەها چاری شـــەوێکی وا نەکـــەم چبکەم

**دوو:** بەحری هەزەج موسەددەس مەحزووف

مفاعیلن مفاعیلن فعولن مفاعیلن مفاعیلن فعولن
--u/---u/---u --u/---u/---u

وەک:

"دلـم در جـنـبـش امـــــــــــــد بـاردیـگـر
نـدانم تـاجـــــــــــه دارد بـاز در ســــــــــر"
(فەرۆخیی سیستانی)

١- نەوەک هەر چاوی مـەسـتـە، خـۆشی هەر مـەست
بەلادا دێ، کـــــە دێ، وەک تورکی ســـــەرمـــــەست
٢- دەمت چی؟ پڕ لە دوڕ، دورجـــێکی یاقـــووت
نیـــشـــانەی مـــۆری چی؟ خـــەتتـــێکی زمـــڕووت
٣- شــــوکــــور ڕۆژ ئەو مـــەهە لەو دورە دەرکـــەوت
لە مـــێـــوە ئەشک و ئاهی ئێـــمـــە ســـەرکـــەوت
٤- لە ئۆلکەی عـــیـــشـــقـــەدا، بێ چوونە ســـەردار
بەئـاســـــــانی مـــــــەزانـە بـۆتـە ســـــــەردار

(نووسینی "عیشقدا" بە "عیشقەدا"، کەسرەی موختەلەسە بێ ڕاستترە، چون کیشەکەی پێ لەنگ نابێ).

٥- بپـــرســـە حـــاڵم، ئیــــهــــمــــالی وەفــا بەس
بتــــرســـە تۆ لە حـــەق، جـــەور و جــــەفـــا بەس
٦- بەکــــــــەس نـابێ بتـی مـن ئـاشـنـا قــــــەت
غـــــەزالەی بەڕ نیــــــیـــــە ڕامی وەفـــا قـــــەت
٧- کـــەلامـــێکە لە حـــیکمـــەت کـــەیل و جـــامـــیع
عـــەتاکـــەر هەر یەکـــە، هەر ئەوشـــە جـــامـــیع
٨- چ خـــاکێ کـــەم بەســـەرمـــا، مـــامـــەوە تاک
بەلێــــو ئاه و بەچاو ئەشک و بەســــــەر خـــــاک

٩- زەمـــــانەی پڕ تـەعـــــەب دەیـکاتـە تـیـــــرۆک
لـــەتـــێ نـــانـــت دەداتـــێ دوو بـــەشـــی نـــۆک
١٠- وتـی: بـۆچـی وەهـا بـێ تـین و بـێ ڕەنـگ؟!
وتم: تۆ بۆ چ ئەمـــەندە شـــۆخـــیـی و شـــەنگ؟!
١١- بەپـیـــــر ئەو مـــاهەوە چووم و بەســــەرچووم
پەری بـوو، ئەو نـەبوو، شــــەو بـوو، بەســــەرچـووم
١٢- بەهاری عـــومـــر ئەوا گـــەییـــە حـــوزەیران
کـــەچی وەک کـــوودەک ئێـــســـتـــە دەچمـــە سـەیران
١٣- لە مـــەیخـــانە خـــودا! گـــەر ئێـــمـــە دەرچین
بەکێ بەین ئیلتـــیـــجـــا، بۆ کـــێـــهـــە دەرچین؟!

**سێ**: بەحری هەزەج موسەممەن مەقسوور

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل مفاعیلن مفاعیلن مفاعیل

--u/---u/---u --u /---u /---u

وەک:

"ســـــحـــــرگـــــه بـلـبـلـی اواز مـی کـــــرد
هـمـی نـالـیـــــد و بـا گـل راز مـی کـــــرد"
(سەلمان ساوچی)
١- هەمـــوو عـــالەمـــتـــە پابەند و لە دامـــان
کـــەچی دەســـتـی کـــەشت ناگـــاتە دامـــان

**چوار**: بەحری هەزەج موسەممەن ئەخرەب مەکفووف مەقسوور

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

-- u/u--u/u--u/u-- -- u/u--u/u--u/u--

وەک:

"دیگر بـه کـــجـــا مـی رود این ســـرو خـــرامـــان
چـندین دل صـــــاحب نـظـرش دست بـه دامـــــان"
١- نیـسـبـەت بدرێ حـوور و پەری گـەر بە لە تۆ چوون
بالیــــدە دەبن تـا دەگـــەنە ئەوجی لە خــــۆ چوون

**پێنج**: بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون ئەصلەم

مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن

--/-u-u/--uu/-u-u/ --/-u-u/--uu/-u-u

١- "ز جگر زخم تو مـعــمــور و دل ز عم شــاداست

ئەوەنـدە بابەتی عـــەیشی نەداوە بـۆ شـــا دەست"

**شەش**: بەحری موزاریع ئەخرەب مەکفووف مەحرووف

مفعول فاعلات مفاعيل فاعلن / مفعول فاعلات مفاعيل فاعلن

- u -/ u - - u/ u - u -/ u- - u - -/ u - -u/ u - u -/ u - -

وەک:

"ســاقی بیــا کــەشــد قــدح لاله پر زمی

طامـــات تا بەچند و خـــرافـــات تابکی"

١- لەم بەحــری فــیــتنە بەڵکی نەجـاتت بدا خــودا

داوێـنـی بـاخـــــودا بـگـرە و بـەردە نـاخـــــــودا

(کورد نالێ: "bigire" بە (و)ی عەتفی بۆردار راستترە).

٢- زللەی مـوعـەللیم ئەو گـوڵی رووتیـە خـستـە تەب

"تــبــت یــدا أبـــي لــهـــب"ی بــێ ئــەدەب

٣- یار از وفـــا گـــذشت بر این کـــشـــتـــەء جــفـــا

شـــد مـــشـــهـــدم ز مــقـــدم او روضـــەء صـــفـــا

٤- دڵدۆزە تیـری ئاهی فـەقـیـرانی رووت و قــووت

بۆ کـوشـتنە هەمـیـشــە کـە ئامـادە شـیـری رووت

**حەوت**: ڕەجەزموسەممەن مەخبوون ئەهتەم

مستفعلن مفاعلن مستفعلن فعول مستفعلن مفاعلن مستفعلن فعول

- u/ - u - -/ - u - u/ - u - - - u/ - u - -/ - u - u/ - u - -/

١- زەمزەم چییـە؟ بە زەمـزەمەی ئایات و سەد حەدیس

پابوونەوە لە شـــەئنی نـیـــــە تینەتی خــــەبیس

٢- ئەی ئەو کەسە کە مەستی غوروری بە هاتی کار

بـەردەســــــتی زۆرە بدرە پەرۆیەک لـە کــــاری چار

٣- ئەو عـــیـــشـــوە بازە دەرحـــەقی مـن چارە گــرژە باز
بێـــچـــارە مـــاوە بەندە خــــوداوەندی چارەســــاز
٤- بێ میـهر و بێ مرووەتیی تۆ هەر (علی الخصوص)
دەرحـەق فـیـدائیـیـانی جگەر سـووخـتـەی خـولووص
(پێم وایە، نابێ "سۆختە" بنووسرێ!)
٥- واعـیـز لە ڕەندی مـەیکەدە دەگرێ کە ئیـعـتـیـراض
ڕازی نـیـــیـــە بەســـە نویشـــتـی ئەزەل (إنی لراض)
٦- دۆزەخ لە عـیـشـقە خاڵیی و جەننەت لە دەرد و داغ
عــاشق لە حـەشـریشــا نـیـیـەتی جـێی دڵی فـەراغ
٧- مـەئلووفـە زەوقی زاهیـد ئەوەندە بەتامی نیـسک
بێگانە مـاوە شـەممی لە نەشـئـەی خیـتـامی مـیـسک
٨- پەروانـەیەک بە بولبـولی وا وت کە (بولفـوضـوول)
ســووتانە ئێـشی ئەهلی مـەحـەببـەت نە هوولە هوول
٩- ناڵەم لە ســینە، هەم لە دڵم دەرد و غـــەم حــەرام
بێ، بێ تۆ بەزمی عـوشرەت و عـەیش ئەر نەکەم حەرام
١٠- بڕوانە ســــووتنم، وەرە، بڕوا کـــە مـن نەمـــام
پەروانە ئیـــتـــرم نیـــیـــە پەروا کـــە مـن نەمـــام

**هەشت**: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەحزووف

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن    فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

- u -/ - - u -/ - - u -/ - u -/ - - u -    - u -/ - - u -/ - - u -/ - - u -

وەک:

"باغـبـان گـر پنج روزی صـحـبت گل بایدش
بر جـفـای خـار هجـران صـبـر بلبل بایدش"
(حافظ)

١-دڵ لەســـەر خـــۆ چوونی پەی دەر پەی دەلیلی یارە هات
عـــەقڵ و هۆش ئەی دڵ بکە حـازر، لە پێـشـــە کـارە هات
٢- خـــۆ ئەگـــەر چاوی حـــەیاتی بڕییـــە ئاوی حـــەیات
من لـە خـــاکی دەری جــــانانـەمـــە هەر ئاوی حـــەیات

٣- ئیـتـیـفـفـاقی، ئافـتـاب ئانێ مـوقـابیل بوو بەڕووت
ئافـــەتێکی دی، نەمـــا تابی، بوەســـتێ ڕوو بەڕووت
٤- ساقی، ئەی مایەی ئەدەب لەب، پەرچەمت ڕەیحانی ڕووح
نیم خـەندێ کـە لە غـونچـە، دەرخـە سـەرچاوەی سـەبووح
٥- بەس بکە، ئەی ئەشکی خـوێنینم، بە غـەممازی تەلاش
ڕازی عـیـشق و دەدری دڵ خـۆ هەرچی بوو کـردووتە فـاش
٦- ئەودەمـە ڕۆحم لەسـەر لەب بوو لەبەر دەردی فـیـراق
هاتو زوو کـــردم بەپێ شـــاباشی، (نعم الاتـفـــاق)
٧-ڕووتـی دی، لـەو ڕۆژەوە ســـــەرگـــــەردانە ڕۆژ
گـەییـە ئێـوارە، وەکـو من ئیـشی قـورپێـوانە ڕۆژ
٨-پرســرا حــالم، کــە من کــەوتم لەبەر پێـیـا درێژ
ئەو وتی: هەر سـێـبـەری دیوم بووە سـەرسـام و گـێـژ
٩- لالغـاوەی واعـیـز ئەمـڕۆ مـەوج ئەدا، دەم پڕ لە کـەف
ڕیشی قـیـروسـیـا، کـتـێـبی وەعـزەکـەی بوو بەرتەرەف
١٠- ئاشـتـیی تۆ، تۆری من، بۆ بێ سـەباتی هەردوو یەک
گـەیوەتە حـەددی یەقین، ئەم دوو یەقـینەن هەردوو شـەک
١١- بیـبـیـێ، یا نەیبـیـێ، من داد و بێـدادی دەکـەم
گــوێ بداتێ، یا نەداتێ، ئاه و فــەریادی دەکــەم
١٢- غـونچە دڵ بوونم لە حەسرەت لێوی تۆیە غـونچـە دەم!
غـونچـەکەی تۆ مەر شیـفـادا غـونچـەکەم، ئەی غـونچـەکەم!

**نۆ**: بەحری ڕەمەل موسەممەن مەخبوون مەقسوور

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فعلان فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فعلان

- u u/ - - u -/ - - u -/ - - u -/ - u u/ - - u -/ - - u -/ - - u -

وەک:

"دارم از زلف سـیـاهش گلە چندان کـە مـپـرس
کـە چنان زو شـدە ام بی سـر و سـامـان کـە مـپـرس"
١- کەم بوو وەک ئەو دەمە، سیدق، ئەم دەمە هەم کەم بووە قات
فـەرەحی نەک بە دوا بێ غـەم و هەم هەم بووە قـات

٢- تۆ نەبی مـــەلجـــەئی من بی، ئەبەدەن نیـــمـــە مـــەلاز
لەو دەرە بێت و دەرم کـــەی، بە خـــودا نیـــمـــە مـــەلاز
٣- بۆتە مـونیس، بۆتە مـەئوا، قـەوم و شـاری (ئەلعـەیاز)
دێوی بێـــتێ، جـــێــبـــەجێ دەڕوا بەبارێ (ئـەلعـــەیاز)

**دە:** بەحری ڕەمەل موسەددەس مەحزووف

فاعلاتن فاعلاتن فاعلن          فاعلاتن فاعلاتن فاعلن
- u -/ - - u -/ - - u -          - u -/ - - u -/ - - u -/

وەک: "افـــتـــاب از کـــوه ســـر بر می زند
مـــــــــاهروی انـگشـت بـر در مـی زنـد"
(سەعدی)

**یازدە:** بەحری موجتەس موسەممەن مەخبوون ئەصلەم

مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن          مفاعلن فعلاتن مفاعلن فع لن
- - / - u - u/ - - u u/ - u - u          - - / - u - u/ - - u u/ - u -u

وەک:

"چو مـــست من ز خـــمـــار شـــبـــانە برخـــیـــزد
هزار فـــتـنە و شـــور از زمـــانە بـرخـــیـــزد"
(جامی)
١- بە داوە وەعـــزیی و، خـۆشی بەتاوە (یا حـافـیـز)
لە هەڵقـــوڵانە کـــە لێکی دەم و لچی واعـــیـــز
٢- بەخـــاک پای عـــزیزت کـــە عـــهـــد نشکســـتم
زمن بـریدیی و با هـیچ کـــســی نپـــیـــوســـتم

## کورتەی باسەکە

١- لەم باسەدا لەمەڕ کێش و سەروای سیعری مەحوی قسە کراوە، کە بۆ یەکەم جارە، -بەش بەوەندەی بەندە بزانم- شیعری شاعیرەکانمان لەم ڕووەوە پراکتیکانە، لەسەری نووسرابێ.
٢- نووسینەکە چەند نموونەیەکە لە مەڕ کێش و سەروای شیعری مەحوی، کە دە کتێبێکی بەربڵاودا بۆ لە چاپدان ئامادە کراوە.

٣- وا بەدیار دەکەوێ کە مەحوی خۆی لە زۆربەی کێش و سەروایەکانی لەبار و نالەباردا، تاقی کردۆتەوە.

٤- ئەوەندی من شارەزاییم هەس- ئەتۆ لەوە گەڕێ ئەگەر شیعرێکی بەهەڵە نووسرابێتەوە -لە رووی کێش و سەرواوە، هەستم بەلەنگ و لەوارییی شیعرەکانی نەکردووە.

٥- مەحوی زێتر شیعری بە هەموو جۆرە کێشەکانی "هەزەج"، "ڕەمەل"، "ڕەجەز"، "موجتەس"، "موزاریع" و "مونسەریح" و "موتەقاریب" هۆنیوەتەوە.

## زەمانە

زەمانەی پڕ تەعەب دەتکاتە تیرۆک
لەتێ نانت دەداتێ دوو بەشی نۆک
پیاڵەی دیدە لەبڕێزە، دڵا تۆش
بجۆشە، سازی ناڵە هەم ببێ کۆک
بەنووکی تیری شۆخێکی کەوا چۆخ
لەبەرما تەن بووە جامەی برنجۆک
بەکوڵمی ئاڵیا ئاڵا خەتی سەبز
ترنجی کەوتە بەر پەنجەی ترنجۆک
گەر ئەم ڕیش و سەرەی زاهید لەگەڵ بێ
دەبێ جەننەت بەدەشتی شەنگ و پیشۆک
ڕەقیبە لەعنەتی، عاشق دەکەی ڕەجم
لە باتیی سەگ دەکەی شێرێ سەمەندۆک
بەخۆڕایی لە «مەحوی» بەس بڕەنجە
نەجیبی، مەگرە وەک هۆکڵ، بەگم، هۆک

**مەحوی**

# دەقی کراوە لە هۆنراوەکانی مەحویدا

**ڕەئوف عوسمان**

شیتەڵ کردن(١) و خوێندنەوەی دەقە کۆنەکان بەدید و پێوانە و سیستمی ڕووناکبیریی نوێی سەردەمی ڕۆبۆت و ئینتەرنێت هەر لە خۆیەوە جۆرە سرکی و سڵەمینەوەیەک دینێتە گۆڕێ، دیارە ئەم هەوڵە موغامەرە ئامێزە دەشێت چەپکێ بنەما و مەرجی تایبەتی خۆی هەبێت، کە هەندێکیان پەیوەندی بەخودی خوێنەر و ڕەخنەگرەوە هەیە، وەک ئاست و بەهرە، هەندێکی تریان پەیوەندی ئۆرگانی بەسیستمی فۆرمەڵەبوونی دەقەوە هەیە:

هەندێک مەرجی تری ئەو خوێندنەوەیە بەندە بەڕەگەزی بابەتەکەوە، دەقی ئەدەبی کراوە ئەو تێکستە دەوڵەمەندەیە کە دەتوانێت هەموو تاقیکردنەوە و دەوڵەمەند و ئەبستمۆلۆژیەکانی ڕەخنەگر هەڵمژێ و پەنجەرەی دەوڵەمەندکردنی دەق لەبەردەم خوێنەردا بخاتە سەرپشت، پێدەچێت هەندێک جار هێند ڕاوبۆچوونی بەهێز و فرە لک لەسەر دەقێک لە خودی دەقەکە وروژێنەرتر بێت، دەقی کراوە، هەموو خوێندنەوەیەکی نوێی ژیرانە دەوڵەمەندتری دەکات و نهێنی داهێنانەکانی باشتر واڵا دەکات، مەرج نییە دەقی کراوە لەبەردەم هەست و بیری خوێنەردا پابەند بێت بەتەنیا لایەنی هونەری و بەدیهاتنی مەرجە پۆزەتیفیەکانی میتافۆر؛ بەڵکو ناوەڕۆکە دەوڵەمەندەکانیشی، یان ئەو تێکستانەی کە کێشە مرۆڤایەتی و ئەنتۆلۆژی و ژیارییەکان بەرجەستە دەکات، بەپێچەوانەی دەقی کراوەوە دەقی داخراو هەرگیز ناتوانێت وەڵامی تیورە نوێکانی ڕەخنە بداتەوە و خوێنەریش بخاتە سەر کەڵکەڵەی بیرکردنەوەی قووڵ و چەند لایەنە، جگە لەوەش لە چەقی خاڵێکدا وەستاوە و کونبڕ بووە، قسەکردن لەسەر هۆنراوەکانی مەحویی مەزن، دەشێت پانتاییەکی گەورەی فرە مەودا بگرێتە خۆ، دیارە فرە مەوداییش حاڵەتێکی ڕەهای وا نییە کە شیعرەکانی سنوور بەندیەکی ئەوتۆ بکرێن، وەک ئەوەی کە پەیوەندی ئۆرگانی لە نێوانیاندا نەمابێت و کۆمەڵە کێڵگەیەکی بەیەک نامۆ بن، تێکستەکانی دیوانی مەحوی زادەی بیر و ئەندێشە و عەبقەریەت و دارشتن و ڕێکخستنی خودی مەحوین، بەڵام دەبێت ڕەچاوی ئەوەش بکرێت ئاستی هەموو تێکستەکان چوون یەک نین لەبەر کۆمەڵێک هۆی خودی و بابەتی، چونکە ئەو هۆنراوانە لە کات و تەمەن و ڕووداوی جیاجیادا نووسراون، ئەمە جگە لەوەی کە هەندێک بابەت بۆ شیعر پتر مل دەدا وەک لە بابەتێکی دی.

دیارە ئەم هۆکارانە ڕەنگرێژی تیروزمی داهێنان لە ئاست و بۆن و بەرامەی شیعرا دەکەن، ئەوی ڕاستی بێت کەم تابێشێ فرسەت بۆ لێدوان و توێژینەوە لەسەر مەحوی لە بار و هەڵکەوتووتر بووە وەک لە (سالم و کوردی)، دیارە ئەم دووانەش کەمتر نەبوون لە مەحوی، بەڵام لەبەر ئەوەی

(نالی و مەحوی) زانایەکی گەورەی وەک مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس ڕاڤەی نەکردوون، ئیتر کەمتر خەڵک بە لایاندا دەچێت یان هەر پێیان دەوێرێ! بابەتی دەقی کراوە لای مەحوی تا ئێستا دەستی بۆ نەبراوە و پێویستی بەمیتۆدی هیرمونتیکا هەیە کە ئەویش لە ئاست تاک گەرایی توێژەرەودا پەرت پەرت دەبێت، دیارە تاک گەرایی مەبەست لە دابڕان و ئامرازگەریانەی خود (الآلیة) نییە لە پرۆسەی ڕووناکبیریدا وەک دیاردەیەکی سوسولۆژی، دەقی کراوە لای مەحوی ئەو تێکستە داهێنراوانەیە کە چاوە قرژاڵییەکانی شیعرییەتی تیا ئەدرەوشێتەوە، خورپەی نهێنی داهێنانەکان وەک برووسکە لە مێشکی خوێنەردا بارانی ئەفسوون و تەئویلی سەرتەڵانە دەبارێنێ، پرۆگرامی ئەم نووسینە دەستنیشان کردنی چەند بەیتێکی کراوەیە کە لە درزی نێوانیانەوە دەشێت خوێنەری پسپۆڕ کەشفی گەلێ پانتایی و دورگەی نەبینراو و دلۆڤانی ئەوتۆ بکات کە لە ئەنجامدا شیعرییەت بکاتە دەستە گوڵ و دەستنیشانی عەبقەریەت و جیهانگەرایی دەقە سەرکەوتووەکانی مەحوی پێ بکات.

١-مەحوی دەڵێت:

لەهەر جێیەک هەڵێ خورشیدی عیشقی گوڵ ڕۆخان «مەحوی» (٢)
ئەگەر عەقڵی ببێ، لەو جێگە ئاونگی عەقڵ چبکا؟!

شیعرییەتی ئەم بەیتە بەر لە هەر شت مەئلوف کردنی نامەئلوفە، لە سیستمی باوی داهێنانە جۆربەجۆرەکانی شاعیرانی تر و هەڵفرین ڕووەو لوتکە بەرزەکانی داهێنان، ئەقڵانییەتی نێوبەیتەکە- نەک دەرەوەی- بۆتە ئاونگ و لەگەڵ هەڵهاتنی لیزگی خۆردا دەبێتە هەڵم و لەبەردەم سوپای خۆری عیشقدا دەپرنگێتەوە، مەحوی وەستایانە ئەوەی بەرجەستە کردووە کە پانتاییەکی شێواو (مساحة متوترة) لە نێوان هێزی عەقڵ- بەپێچەوانەی ڕۆشنبیری باوەوە- شکستی لەبەردەم وزە میتافیزیکیەکانی خۆشەویستیدا هێناوە، ئەو شێواوی و دژ یەکبوونە لە نێوان گەرمای خۆشەویستی و ئاونگی عەقڵا داینەمۆی داهێنانەکەیە، ڕولان بارت دەڵێت:(٣) (دەقی لەزەت ئامێز ئەو دەقەیە کە دڵنیامان دەکات، چالاکی و پڕبوونمان پێ دەبەخشێ و دیارە ئەو دەقانەش زادەی ڕۆشنبیریی و ئاسوودەیی خوێنەرن).

مەحوی لە دیوانەکەیدا هێند ئەم واتایە سەرنجی ڕاکێشاوە لە چەند بەیتێکی تردا دووبارەی کردۆتەوە، بەڵام بەبارگەکردنی واتا و دەلالەتی نوێ و لە کۆنتێکستی (سیاق) جیاجیادا.

هەر لەم فەزایەدا مەحوی دەڵێت:

کە دڵ دەتوێتەوە بۆ تۆ، دەکەی ئەو ڕۆژە تۆ بڕوا(٤)
کە خۆ دەرخەی وەکو خۆر دڵ وەکو شەونم لە خۆ بڕوا

دیسانەوە دەڵێت:

دەپرسی: بۆچی من دەرکەوتم و، دڵ بوو لە تو غایب(٥)
کە وەختێ ڕۆژهەڵات ئەڵبەت دەبێ شەونم لەخۆ غایب

دیارە وشەی (غایب)(رد الصدر علي العجزة) و تكراری سواو نییە.

دیسانەوە لە هەمان واتا دەڵێت:

تۆ کە دەرکەوتی، مەپرسە چی بەسەر دێ جان و دڵ(٦)

حاڵەتی شەونم تەماشا کە بەوەقتی ڕۆژهەڵات

دیسانەوە بۆ هەمان بابەت دەڵێت:

بەجیلوەی ئەو، وەکو شەونم، فڕی هەر عەقڵ و هۆشێ بوو(٧)

کە سێبەر مەحوە لەو جێیە هەتاوی لەحظەیەک لێ کەوت

وەک هێمام بۆ کرد ئەقڵ لە کۆمەڵگا و لە بوارە ئەکادیمییەکاندا ڕەمزی مانەوە و لۆژیک و بەرقەراربوونی تاقیکردنەوە سەرکەوتووەکانە، بەڵام سۆز بەپێچەوانەوە دواکۆتا و دوور لە هاوکێشەکانی ئەقڵە، مەحوی هەر دوو تەوەرەکەی (ئەقڵ و سۆز)ی بەوزە نەبینراو داهێنەرەکان جێ گۆڕکێ پێ کردووە و بەهێزی میتافۆری مەرِ( عەقڵی عەقڵ) پەنجەرەی داخراوی مەرِ واتای فەرهەنگی وەستاو لەبەردەم جیهانبینییەکی داهێنراودا کردۆتەوە، دەشێت منی خوێنەر هەوڵی ئەوەش بدەم کە ئایا خودی مەحوی لە ناواخنی بەیتەکانیا هێمای ڕاستەوخۆ هەیە بۆ دەقی کراوە یان نا؟ دیارە ئەم بەیتەی مەحوی جۆرە مۆرکێکی ئەو دەلالەتەی پێوەیە:(٨)

لەهەر شیعرێ لە دیوانت دەجۆشێ نەشئەیێ «مەحوی»

صەدایێکی لە یەکتر جوێ دەدا هەر تاری قانوونت

دیارە (نالی)یش هەمان جەختی لەسەر دەقەکراوەکانی خۆی کردوە و دەڵێت:

نەظمی (نالی) میثلی ئاو و ئاوێنە ڕەنگی نییە(٩)

دوو ڕووە بۆ سەیری خاطر: یەک خەفی و یەک ئاشکار

٢- مەحوی دەڵێت:

ئەگەر ئازادەگییەک بێ لە عەدەمدا بۆمان(١٠)

چی هەیە غەیری بەپێچی پەلەپەل داوی حەیات

مەحوی وەک هەر شاعیرێکی سۆفی و عیرفانی میتۆدی ژیان و عەدەم بەخەستی چۆکی داداوەتە سەر مەبەستە تایبەتێکانی و بەرەنگی جۆر بەجۆر لە هۆنراوەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە، سەرجەم وشەکانی نیوە دێری یەکەم جگە لە (بێ) کراوە و سەربە واتاگەلی جیاوازن، دیارە جیاوازی واتای وشە وەک خودی خۆی لە سیاقدا گۆڕانی چۆنێتی تری بەسەردا دێت، نیوە دێری یەکەم ڕستەیەکی مەرجیە(شرط) و وەڵامەکەشی لە نیوە دێری دووەمدا کۆتایی پێ دێت، بیری سۆفی گەرایی لە هەندێک حاڵەتدا نوقمی ڕەشبینییەکی سەرتاپاگیری دەبێت و فەلسەفەی ژیانیش لای ئەو دەبێتە جۆرێک لە نەهلستیەت، واتە دەسبەردان لە هەموو ئەگەرە

پۆزەتیفیەکانی ژیان، خۆجاریش هەیە لیزگی نوورێکی ئیلاهی دڕ بەتاریکیەکان دەدا و دەڕژێتە سەر پانتایی زامی گومان و دوو دڵیەکان، وشەی (ئەگەر) لە کۆنتێکست (سیاق)ی بەیتەکەدا نەگەشتۆتە بن بەست بوون و لە چەقی دەلالەتێکدا نەوەستاوە، (ئەگەر) دوو ئەنجامی دژیەک لە خۆیدا بارگە دەکا کە بوون و نەبوونە، ئایا لە عەدەمدا وەک مەحوی بەهێما پێمان دەڵێ ئازادی هەیە؟ وشەی (ئازادەگییەک) دیسانەوە وشەیەکی ئێجگار کراوەیە و دەشێت چەندان هیرمۆنتیکای پێ سەنتەر بکرێت، ئایا ئازادەگی لای مەحوی چییە؟ چ جۆرە سەربەستییەکە جەستەیی ڕۆحی؟ ئایا ئازادەگی لە خودی دەقەکەدا ناکاتە جۆرێک لە خامۆشبوونەوە یان پاکژبوونەوەی ڕوح؟

دیارە ورووژاندنی بیری دوای ئازادەگییەکەی مەحوی پەیوەندارە بەو میتۆدە فەلسەفیەی کە پێی وایە مرۆڤ بەر لە هاتنە دنیاوەی لە (لوح المحفوظ)دا مەینونەی خۆی هەبووە وەک نەخش، دیارە ئەم بیری نەهلستتیەی مەحوی ئەنجامی ئەو بێزاری و وەرسیەیەتی بەرامبەر کێشە و کۆسپەکانی سەردەمەکەی، مەحوی وەک شاعیرێکی مۆڕاڵی هەمیشە پابەندی بەها پیرۆزەکانی ژیان بووە و بەمەوو لای نەداوە لە ڕیسواکردن و بەکەم زانینی ئەو سۆسۆلوژیا باوەی کە پشت بەدەسەڵات و بنەماڵە و نێوەندی حوکم دەبەستی و وەک هەر موتەنەورێکی بوێری سەردەمەکەی دژی تەوژمی باو وەستاوەتەوە و کۆی لە هیچ چاوسوورکردنەوەیەک نەکردووە، (ئەگەر) بەهەردوو ئەنجامە پۆزەتیفی و نیگەتیفیەکەیەوە، واتە بەبوونی ئازادی لە عەدەمدا یان نەبوونی، دەشێت هەر لە ئەنجامدا پابەندەمان کات بەدوای پێچەڵ پێچی ژیان و لێی ڕەها نەبین، فەنتازیای بوون (وجود) لای مەحوی و لە نێوان ئەم دێڕەوە کەوتۆتە نێوەندی دووهێزی ئەوتۆ کە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی لە زۆرانبازیدان، دیارە ئەم فەلسەفەی بوون و نەبوونە و سەرەتا نادیار و پرسیار و ورووژێنەکانی قورسترین کێشەی ئەنتۆلۆژیە و تا ئێستا نەهاتۆتە سانابوون! لە عەدەمدا ئازادەگی بەهەمووە ڕەهەندەکانیەوە هەبێ یان نەبێ مرۆڤ هەر دەبێت لە نێوەندی گرێ کوێرەکانی ژیاندا پێ بگیرێ و سەرسام بێت، واتە هەر ئەزەلەوە ئادەمی دەبێت لەبەردەم کەژی سامناکی مردندا چۆک دادا و ئامادەگی هەمیشەیی هەبێت بۆی، دیارە ئامادەیی هەمیشەیی لای سۆفیزم دەکاتە خۆ ئامادەکردن و لە خواترسان و پەیڕەوکردنی بنەماکانی ئاین، وشەی (عەدەم) دیسانەوە چ وەک خۆی و چ وەک سیاق کراوەیە بەڕووی دوو واتا و دەلالەتێکی ئەو دیو دوو واتاکەش، کە یەکێکیان مردنی دوای ژیانە و ئەوی دیش هەر نەبوونە لە ئەزەلەوە، ئەمە جگە لە وشەی(بۆمان) کە چەند دەلاتێک دەگرێتە خۆ، کە هەر یەکەیان پانتاییەکی کراوەیە بەڕووی چەند واتایەکی تردا، (بۆمان) بەواتای بۆ (ئێمە) یان (بۆمانەوە) واتە درێژەدان، یان (بۆ ژیان) کە من ئەمەیان بەستاندەرتر دەزانم لە هەموویان، دیارە مەحوی بەدەر لە شاعیرە کوردەکان بەوە ناسراوە کە سەبکی تێکستەکانی قورسن و پێویستیان بەماندووبون وتەفکیک هەیە، دیارە مەبەستم بەدەر لە لۆژێکی فۆکۆ و ڕولان بارتە لەو بوارە بونیاتگەراییەدا، ئەم گوێ پێدانە

فرەیەی مەحوی بەسنعەت، لای هەندێ بەنەنگی کەوتۆتەوە، خوالێخۆشبوو عەلائەدین سەجادی دەڵێت:(١١) (نازانم مەحوی چی ناچاری کردۆتە سەر ئەوە کە بەم جۆرە عەزیەتی خۆی بدا بۆ ئەوە شیعر دابنێ...) من وای بۆ دەچم ئەو حوکمانە جۆرە تاک ڕەهەندیەکیان پێوە بێت و لەگەڵ فەزای زۆربەی هۆنراوەکانیا نەگونجێن، ڕەخنەگری گەورە جورجانی دەڵێت:(شاعیریەتی دوور لە سنعەت وەک ئافرەتێکی شۆخی نەزۆکە، بەڵام ئەو دەقەی کە بەهرە و سەنعەتی تیا ئاوێزان دەبێت بەسەر تەڵ و نەوازەتر لە قەڵەم دەدرێت، کاتی خۆشی ئەبو تەمام هەر بەهەمان تۆمەتی ئێستای مەحوی پێیان دەوت: بۆ شتێ ناڵێی کە خەڵکی لێی تێبگەن؟ ئەویش لە وەڵامدا دەیوت: ئەی ئەم خەڵکە بۆ تێناگەن؟ مەحوی شاعیری نوخبە و دەستەی گوڵبژێری سەردەمی خۆی بووە و هەمیشە ویستویێتی واتا قووڵ و فەلسەفە ئامێزەکان مۆرکی تایبەتی هۆنراوەکانیی بن، ئەمە جگە لەوەی کە هەندێک جار ئەبولعەلای معەری ئاسا ویستویێتی لە هەندێک چامەدا خۆی بەشتێکەوە ببەستێتەوە کە پێویست نییە( لزوم مالا یلزم) هەروەک کۆتایی هێنانی هەندێک چامە بە(چبکەم، ڕۆژ، شەو...)

٣- مەحوی دەڵێت:

خودا بیدا بەڕەحمەت، داغی دڵ، چاوی دڵە «مەحوی» (١٢)
بەگریە چاو ئەگەر چوو، شک دەبەم چاوێکی بیناتر

مەحوی لەم بەیتەدا کە دەتوانم بە شابەیتی (البیت القصید) قەسیدەکە و تەنانەت دەرەنجامیشی دانێم، مامەڵەیەکی نوێی هونەرمەندانەی بەجۆرێک لەگەڵ پێکهاتەی داهێنانەکەدا کردووە، کە لە حاڵەتە ئاساییی و زەینیە فەرهەنگی و ڕۆژانەییەکەوە گواستویێتیەوە بۆ دۆخی شیعریەتێکی ئەوتۆ کە کۆمەڵێک ئەرک و پێداویستی نوێی خستۆتە ئەستۆی وشە و دەستەواژەکانەوە، دڵی بێ خەم و شاد لە میتۆدی عیشقی عیرفانی مەحویدا بەتاڵ و عەدەم ئامێزە و لە پانتاییەکی بێ بەهادا گڕ دەخوا و دەخولێتەوە، تەنیا سەرچاوە، کە هێزە و گوڕوتین دەدا بەجیهانە بێ بەراییەکەی دڵ، ئاوەدانی دەکاتەوە، ماکی مانەوە و جیهانبینی پێ دەبەخشێت تەنیا و خەم و داخە، ئازار و کسپە بەسوێکان ئەو خوێنە گەشەن کە هەمیشە سیستمی پێکهاتە ئۆرگانیزمیەکانی دڵ وەگەڕ دەخەن، ڕستەی (داخی دڵ چاوی دڵە) هێندکراوەیە بەڕووی بیریی خوێنەردا چەندان تەئویلی جۆر بەجۆر هەڵدەگرێت کام داخوخورپەیەی دڵ و کام چاوەشی؟ بەدواداچوونی وەڵامی ئەو دوو پرسیارە لە تاک ڕەهەندیەوە دەمانباتە فرە مەودایی و گەلێ واتا و مەبەست و سەرەنجام بەدەست دێنێ، شیعریەتی ڕستەکە بریتییە لە فەزایەک تەم و چڕی و وێناکردنی (تصور) جۆر بەجۆر، کە لەگەڵ گۆکردنێکدا پانتاییەک سەر سوڕهاتن دێتە گۆڕێ، با ئەوەش لە یاد نەکەم کە لەم دۆخەدا تاقیکردنەوە خودیەکانی هەر خوێنەرێکیش هێندەی تر گەرم و گوڕیی تەئویلی جۆر بەجۆر ئەڕەخسێنێ، دیارە لەم ڕستەیەدا هەردوو چەمکی شیعرییەت و هێرمونتیکا پێکڕا لکاون و هارمۆنیای ترپەی دڵی خەمبار و چاوی بەفرمێسکی دڵ ڕەنگ

دەڕێژن، (١٣)

(پەیوەندی نێوان شیعرییەت و هێرمونتیکا پەیوەندیەکی تەواوکەرانەی سەرکەوتووە، هێرمونتیکا لای تۆدوروف لەیەک کاتدا دەکەوێتە بەر و دوای شیعرییەتەوە)، مەحوی هەر لە سەرەتای بەیتەکەوە دەڵێت:

(خودا بیدا بەڕەحمەت)، وشەی (بەڕەحمەت) لە ڕەوانبێژیدا هونەرێکی واتاداری گرنگە، کە پێی دەڵێن (إحتراز) و لە هەمان کاتیشدا دژێکی نەبینراوی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە کە خوێنەری وریا دەبێت هەستی پێ بکات کە ئەویش پێچەوانەی ڕەحمەتە و بەباری نیگەتیفیدا دەشکێتەوە، واتە ئەگەر ئەو چاوی دڵە کە لای سۆفییەکان (بصیرة) ەیە، خوا بتداتێ و بەڵام لە بواری دژە ڕەحمەتدا بهێنی تووشی کارەسات دەبی و بەزیان دەشکێتەوە بۆ خۆت و دەوروبەریش، مەحوی لە نیوە دێڕی دووەمدا لە ئەرکی مەعنەوی دڵەوە دەگوێزێتەوە سەر ئەرکی مادی چاو، کە گرنگترین ئامێری مرۆڤە و لەوێوە ئاشنا دەبین بەهەموو ئەو دیمەن و وێنە و توخم و دیاردانەی کە سەراسیمەمان دەکەن و بەهاکانی ژیانمان پێ دەبەخشن، دیارە لە دەستدانی چاو لە ئەنجامی هەڵهێنانەوەی فرەیەتی بەملوانکە فرمێسکی درشت و پیرۆز، کە دەکاتە کوژانەوەی چرای تەمەنی عەشق و خامۆشبوونەوەی هێدی هێدی تا لێوارە بەسوێکانی مەرگ، بەڵام مەحویی وەستا و شاعیری گەورە وەک کوت و پڕیەکی چاوەڕوان نەکراو، وەک وزەی شیعریەتێکی برووسکە ئاسا، چاوێکی جیا لەوەی پێشووتر، بەسیمای ژیاندا هەڵدەهێنێ کە گەوهەری مەعریفەی سۆفیزمە، ڕستەی (چاوێکی بیناتر شک دەبەم) کە ئالتەرناتیفی چاوە ئاساییەکەیە، تێکستێکی ئێجگار کراوەیە و دەشێت گەمەی هونەرمەندانە بەخوێنەر بکات و بیخاتە کەڵکەڵەی بەدواداگەڕان و بیرکردنەوەی قووڵەوە، ئەمە جگە لەوەی کە ئەو ڕستەیە خۆی لە خۆیدا جۆرێک لەسەر سەختی و مل نەدانی مەحویە نەک بەتەنیا بەرامبەر بەنامۆبوونە ئەنتۆلۆژییەکەی ڕووناکبیرە گەورەکان بەڵکو بەکارەسات و ڕووداوە سیاسیەکانی سەردەمی خۆشی، چونکە ئەم شاعیرە نەک شایەتە بەسەر سەردەمەکەیەوە بەتەنیا، بەڵکو ڕۆڵی تایبەتی و بەرچاویشی هەبووە لە وەستانەوەی بوێرانەی بەرووی تەوژم و شەپۆلە باوە نێگەتیفیەکانی دەسەڵاتی سەردەمەکەیدا. لە بواری ئەم جۆرە واتا کراوە و سۆفیزم ئامێزەدا، دوو ڕێباز سەرهەڵدەدا: (١٤)

(یەکێکیان ئەو نووسینە سۆفیزمە تاک ڕەهەندانەن کە تاقیکردنەوە لادەخەن (انزیاح) و بەتەنیا لایەنە زەینیەکان تیوریزمە دەکەن، واتە ئەو پانتایی دڵەڕاوکێ و شێواویەی نێوان نووسەر و وەرگر، یان نووسەر و خودی دەق لەدەست دەدەن، بەڵام ئەو تێکستانەی کە لە ئەنجامی گینگڵدان و تاقیکردنەوەی سۆفیانەدا چاویان کردۆتەوە پرشنگ دەدەن بەگیانی سۆفیزم، گیانی دڵەڕاوکێ و خۆخواردنەوە و پەرت بوون و شێواوی کە ئەم حاڵەتەیان گیانی شیعرییەت دەگرێتەخۆ)

٤- مەحوی دەڵێت:

بەهاریٚ بوو جوانی، بوو بەسوخرەی پایزی پیریی(١٥)

بەسەرچوو باخ و باقی ماوەوەی مشتێ چڵ و چێوە

ئەم تێکستە پێش لە دایکبوونی وەک شیعر لە ویژدانی شاعیر و سروشتی وزەکاندا بە سرکیی، خودی خۆی چاوی هەڵهێناوە، بەر لەوەی دەقەکە گۆش بکرێت شاعیر بەدوایدا وێڵ بووە و ئەڵهای ڕامکردنی کردووە، دیارە زمانی ئەم خیتابەی مەحوی بەفەزایەکی میتافۆر بارگە کراوە، جوانی و لاوی خەوێکی بەهارە و لە دەمەدەمی پایزیی پیریا بەئاگادێت، ڕستەی (بوو بە سوخرە) دەقێکی کراوەیە و لە سیاقی بەیتەکەدا بەیەک واتا داناکەوێت، دەشێت سوخرە، لێرەدا لە(سخریە)ی عەرەبی واتە گاڵتەجاریەوە ،هاتبێ، خۆ دەشێت بەواتای زۆر و توندی بێت وەک بەسوخرەبردن، واتە کێڵگە ڕەنگاڵەیی و سوورمەچنەکەی بەهاری تەمەن لەبەردەم ڕەشەبا و تۆفی پایزدا کزر و پەشمردە بووە، جۆگەلەکانی هەوەسبازی و لەزەت هەڵپرووکان، گەڵا و گوڵ و میوەی زەرد و سووری باخی تەمەن بەرەو بەسەرچوون و خەزان دەڕۆن، جەستەی شەکەتی بەر هەڵەمووتی ژیان بریتیە لە مشتێ چڵ و چێوی ئەوتۆ کە ئامادەگیی هەمیشەی هەیە بۆ لەناو چوون و داڕمان؟ ئەم واتا ئاساییە(١٦)(یان هەندێ زانیاری دیاردەکانی تری ژیان هەرگیز بەفێربوون ناتوانین بیانگەینێ، بەڵام بەچێژ و لەزەت ڕامیان دەکەین)، لە سەرجەم بەیتەکەدا مرۆڤ بەپێی میتافۆری شارراوە (الاستعارة الکنائیة) مرۆڤ درەختێکی ڕووت و قووتە و لەبەردەم زستانی مەرگدایە، دیارە زمانی هێما یەکێکە لە خەسڵەتە درەوشاوەکانی شیعرییەت، مەحوی لە نێوان بەهار و پایزەوە دوو وەرزەکەی تری بۆ خوێنەر جێهێشتووە، بەهار پەڕیوە بۆ پایز بەسەر هاوینەدا، پایزیش پەڕیوەتەوە بۆ زستان بەهێمای مشتێ (چڵ و چێودا)، ئەمە جگە لەڕامکردن و سانابوونی وەرزە دژەکان لە پانتاییەکی تەبا و چینێکی سفت و سۆڵدا، دیارە ئەم دەقە کراوەیە و لەم ئاستەدا مەحوی(١٧) (خستۆتە نێوەندی دەسەڵاتی خۆیەوە و پێشی کەووتوە و کاریگەریشی خستۆتە سەر، ئەمە جگە لەوەی کە دەقەکە بەر لە شاعیر ئامادەگی دەلالی هەبووە و شاعیریش بەدوای ڕامکردنیا وێڵ بووە)، ئا لێرەدا ئەرکی شاعیری گەورە ئەم بەدواداگەڕان و سۆراخ و وێڵ بوونەیە کە تا هەیە لە خاڵێکی مۆلەقەدا بەبێ ئۆقرەیی دەمێنێتەوە. دەستەواژەی (مشتێ چڵ و چێو) ئێجگار کراوەیە بەڕووی هیرمۆنتیکادا، کە دیارترینیان بەکەم و کورت زانینی تەمەنی مرۆڤ و بەهەدەر چوونی ژیان و بێ بایەخی و کاتبەندی تاقیکردنەوەکەیەتی، لەبەرامبەر ژیانە هەتا هەتاییەکەی تر، لە بواری ئەم کێشە ئەنتۆلۆژیەی نێوان بوون و نەبووندا گەلێ بەیتی نەوازە و سەرتەڵ وتراون، کە لێرەدا دوانیان بەنموونە دێنمەوە:

نالی دەڵێت:

شەوی بەهاری جوانی خەوێ بوو پڕ تەشویر(١٨)

لە فەجری پایزی پیریی بەیانی دا تەعبیر

هەروەها مەولەویش دەڵێت:

دڵ بیـــەن وەدار ســەر کــەل لای وەشت(١٩)

چەمـــــە ڕای وایێـن ڕیشــــەش بێ وە دەشت

ئەو خورپە و دڵەڕاوکێیەی مەحوی کە لە ئەنجامی کێشەی وەرزەکانەوە وێنا دەبێت و شاعیر وەستایانە لەبەر ئادەمی کردنیاندا کار دەکات، خۆی لە خۆیدا جۆرێکە لە ڕوانینە شمولییەکان، ئامێتەکردنی دەرهاویشتەی دیاردەکانی سروشت و ژیانی مرۆڤ، هوشیاری زەمەنی بەچڵ و چێوبوون لە ئاست بەهاری هەرزەکاری تەمەندا، خۆی لە خۆیدا تانوپۆی شیعرییەتی بەیتەکەیە و دەرگای جۆرە نامۆبوونێکی لەزەت ئامێز دەخاتە سەرپشت بۆگیانی تامەزرۆ و بێ ئۆقرەی شیعر گەراییمان:

٥- مەحوی دەڵێت:

دڵ لە ئیدراکی حەقیقەت بێ بەشە بێ داغی عیشق(٢٠)

«مـــــەحـــــویا» دانا دەبێ بەم چاوە بینایی بکا

مەحوی لەم تێکستە عیرفانی ئامێزەدا وشە و دەستەواژەکانی لە دەسەڵاتی فەرهەنگیی باو قوتار کردوون و خستوونیەتە نێو پانتاییی میتافۆری نوێوە و لەو ڕێگایەوە پەیوەندی هونەری تازەی چنیوە، لە نێوان کونتێکستە (سیاق)ە نوێکانەوە هەوڵی فرەی داوە بۆ گەیشتن بەحەقیقەت، دڵی مەحوی بۆ گەشتن بەپێکهاتە مەعریفیەکانی حەق، دەبێتە وەهم و مەحاڵ؛ ئەگەر و ئازار و خورپەکانی عیشق پەنجەرەی ئەو حەقیقەتەی بۆ واڵا نەکەن، لای مەحوی و لەم بەیتەدا گەشتن بەکایەکانی حەق لە هۆش و عەقڵەوە دەست پێ ناکات، کە ئەمە خۆی ڕەفزی ئامادەگی (حضور) عەقڵە و پەنابردنە بۆ جیهانە نەبینراو و تەماوییەکانی دڵ، کە چاوگی خورپە و سۆز و کسپە بەسوێکانی عیشقە و هەمیشە دەرزی ئاژنی خەمە گەورەکانە کە بەدژ دەکەونەوە لەگەڵ ئەقڵانیەت و پێکهاتە دەلالییەکانی، دیارە وێناکردنی مەحوی بۆ گەشتن بەو فەزای حەقیقەتە دەبێت بەو چاوە بینایی بکرێت، قەرتاجنی لای وایە(٢١) (بنەمای نامۆکردنی بارە دەروونییەکان هۆیەکە بۆ هەستکردن بەستاتیکای دەق و بزواندنی سەر سوڕهاتن و واق وڕمان)، لەم دەقە کراوەیەی مەحویدا یەکسانیی نێوان وشە و مەدلول تێک دەچێت، تیۆریزەکردنی پێشینەی واتا لەسەر وشە، ڕیتمێکی تر وەردەگرێت، کە ئەویش هێمایە بۆ واتا ونەکان، ئەو واتایانەی کە خودی خوێنەر سەرلەنوێ و لە دەرەوەی دەقدا دەینووسێتەوە و جارێکی دی دەبێتەوە بەداهێنەر بەڵام لە فەزاو کەشێکی تردا.

٦- مەحوی دەڵێت:

کە سینەی ڕێشمی بەو تێغی نازە ئەنجن ئەنجن کرد(٢٢)

وتی پەژمـــــوردەیە ئەم لالەزارە، ئاوی تێ دەگـــــرم

لەم بەیتەدا مەحوی ئێجگار وەستایانە پەنجەرەی هیرمونتیکای لە میتافۆرە خەیاڵ ئامێزەکان کردۆتەوە، زۆر هونەرمەندانە جێ گۆڕکێی بەئامێرەکانی هەست (تراسل الحواس) کردووە، هەر لە سەرەتاوە سینەی زامداری بەئاخ و خەمی خۆشەویستی بۆتە باخێکی سیس و ژاکاو، بەڵام نازی یار دەبێتە تیغ و هێندەی دی دڵی ئەنجن دەکا و بەخوێنی گەش گوڵاڵە سوورە سەر دەردێنێ (تیغی ناز) هێند کراوەیە دەشێت سێبەری کۆمەڵێک دەلالەتی جۆر بەجۆر بخاتە سەر وێنای خوێنەر، دەشێت ناز دەرهاویشتەی قسە، یا نیگا، یان لەنجەولار یان هەڵسوکەوتی ئەفسوون ئامێز، یان... یان... ئەوەی کە دەبێت لەبیر نەچێت ناز لەسەرەنجامدا بۆتە ئاو و باخچەی دڵە ژاکاو و رەنگ پەڕیوەکەی چاو پێکردۆتەوە، واتە لەیەک چرکە داو لە فەزای یەک پانتاییدا، ناز بۆتە زام و دەرمان، گوڵ و رەشەبا، وجود و عەدەم، خوێنەر بۆی هەیە بپرسێ (ناز) و ئاو لە چیا تەبان و لە چیا لێک دادەبڕێن؟!

دەشێت لە وەڵامی ئەم پرسیارە دا پەنجەرەی ئەنجامگیریەکی دی بکرێتەوە، کە ئەویش هۆ و ئەنجام، پەرت بوون و پێکرا لکان، واتە جووت بوونی دیاردە دژەکان و مەئلووف کردنیان لە چوارچێوەیەکی هونەری دا، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا ماکی شیعرییەتێکی بەرچاوە[٢٣]، (دیارە دۆزینەوەی هاوکێشە دژەکان، بەرپرسیارەتیی یەکەمی خوێنەرە بۆ کەشفی ستاتیکا و رەهەندەکانی دەق، لێرەدا دەشێت خودی تێکستەکە ببێتە هاندەر و جووڵێنەر، واتە خوێندنەوە لەو داروبارەدا دەبێتە کارێکی قورس و دەشێت پشت بەبەها ستاتیکی و رەوانبێژیەکان ببەستێ)، مەحویی شاعیر و وەستای بەهرەمەند بەبیری جوانناسی جێگۆڕکێیەکی وردی لە نێوان سیفەتی ئاو و نازدا کردووە کە (تێگرتنە)، دیارە ئاو لە دۆخی شلیدا ناگیرێتە کەس بەڵام مەحوی بەهونەری میتافۆر بەخەسڵەتی (ناز)ی بەخشیوە بەئاو و گرتوویتیە باخچەی ژاکاوی دڵ ئەم کارگۆڕکێیە (تراسل عمل العناصر) دەرهاویشتەی کرانەوەی دەقێکی سەر لێوە لە شیعرییەتدا.

٧- مەحوی دەڵێت:

خەلاصی بوونی قەت ناوێ ئەسیری زوڵفی زنجیرت[٢٤]

لەبەر تیرت مەلەک بێ، هەڵفڕینی نەبووە نەخچیرت

ڕۆحی بێ ئۆقرەی مەل ئاسای مەحوی لە قەفەزی سینگەوە داویەتی لە شەقەی باڵ و کەوتۆتە داوی زوڵفی زنجیر ئاسای یارەوە، لە فەزای زوڵفیا وشەی (زنجیر) بەرووی دوو مەدلولدا سەر دەردێنێ، یەکێکیان جوانییەکەیەتی کە لوولە و ئەوی دی ئەو داوە کرژ و پێچەڵپێچەیە کە مەلی دڵی تیا بەند بووە و قوتاربوونی نییە، هەردوو واتاکە لە کێشەیەکی هامبەریدا (متوازن) ئامبازی یەک بوونەتەوە، مەحوی بەم حاڵەشەوە نەوەستاوە، بەڵکو وشەی (تیرت)ی هێناوەتە فەزای بەیتەکە و دەشێت کۆمەڵێک تەئویل هەڵبگرێت و هنێدەی تر جیهانبینی خوێنەر لەو سیاقەدا فروانترکات، دیارە ئەم گوتارە دەلالەتی نوێ نمایشی دەکات کە ئەویش گواستنەوەی

حاڵە هیومانییەکەیە بۆ قووڵایی ئاسمان و فریشتە، دیارە وشەی (مەلەک)یش دەرگای هێمایەکی تر جگە لە بەئینسان کردنی، کە هەڵفڕین و ئاسمانە ئاواڵە دەکات، لابردنی (أنزياح) واتای فەرهەنگی (مەلەک) و بەستنەوەی بەکۆنتێکستی (سیاق)ی زەوی و بەئادەمی کردنی فریشتە جۆرێکە لەخۆ دەربازکردن لە ئاستەنگی وەسفی ئامرازگەرایییە (الالية)وە بۆ جیهانە بەپیتەکەی شیعرییەت، کە دەکاتە پەی بردن بەفەزا نەبینراوەکانی ڕۆح و وەستانەوە بەرامبەر تەوژمی واتا باو و چەقیوەکان، دیارە دەقی کراوە[٢٥] (هەمیشە هانی خوێنەر دەدات بۆ نووسینەوەی سەرلەنوێ و دەشێت خوێنەریش کێڵگەی دەقەکان ئەم دیوە و دیوکات بیوروژێنێ بۆ پێکهاتە نوێ و تازەکان)، دیارە مەحوی بەم واتایە سەرسام بووە بۆیە لە چەند جێیەکدا هەمان واتا دووبارە دەکاتەوە:

ئەسیری زوڵفە دڵ، ئەی بازی غەمزە، غیرەتێ حەیفە[٢٦]
ذەلیل ئەم عەندەلیبە کەوتووە بەر دەستی قەل چارێ

## ئەنجامگیری

خوێنەری ئازیز دیارە من گەلێک دەقی کراوەم لە دیوانەکەدا دەستنیشانکردووە و تەنیا بەم حەوت بەیتە واز دەهێنم و وەک هەر لێکۆڵینەوەیەکی ئەکادیمی ئەم چەند ئەنجامگیرییە دەستنیشان دەکەم:

١- زۆربەی دەقەکراوەکانی مەحوی لەو قەسیدانەدا بەدەر دەکەون کە تاقیکردنەوە زیندوو و ڕۆحیەکانی شاعیری تیا بەدی دەکرێت و لە پانتاییەکانی ڕێبازی عەشق و سۆفیگەریدا خول دەخۆن.

٢- دیاردەی شیعرییەت و هیرمۆنتیکا (تأويل) لەو دەقە کراوانەدا بەزەقی دەردەکەون و بەهەردووکیان مۆری داهێنانی ڕەسەن دەنەخشێنن.

٣- زۆربەی دەقە کراوەکانی مەحوی لە پانتایی بەهرە و سنعەتدا چاو دەکەنەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە ڕێژەی ئامادەگی بەهرە تایبەتەکە پتر لە سنعەت دەدرەوشێتەوە.

٤- لە دەقە کراوەکاندا مەحوی تەک و زوو خۆی لە شێوازی سەبکی هیندی گرژ و سنعەت ئامێز پاراستوە و گەڕاوەتەوە سەر ڕێچکەکەی نالی و سالم و کوردی.

٥- لە بەرامبەر دەقی کراوەدا مەحوی دەقی داخراوی زۆرە و لە بوارە پەند ئامێز و ستایش و سکاڵاکان و هەجوەکاندا دەردەکەون.

٦- لە دەقە کراوەکاندا هەست بەڕیتمی مۆسیکی ناوەوەی بەیتەکان دەکرێت و جۆرە خوری و گەرم و گوڕیەکی ئاوازەیی تیا بەدی دەکرێت.

## سەرچاوەکان


١- رۆژنامەی هەرێمی کوردستان، ژمارە(٤٠١) دەقی داخراو دەقی کراوە، ڕەئوف عوسمان.
٢- دیوانی مەحوی ل ١٦، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، چاپخانەی کۆڕ، بەغداد، ١٩٧٧.
٣- في الشعرية، كمال أبو ديب ص ٨٤.
٤- دیوانی مەحوی ل ٣٥.
٥- هەمان سەرچاوە ل ٥٢.
٦- هەمان سەرچاوە ل ٥٧.
٧- هەمان سەرچاوە ل ٨٦.
٨- هەمان سەرچاوە ل ٧٥.
٩- دیوانی نالی ل٤٣٩.
١٠- دیوانی مەحوی ٦٤.
١١- هەمان سەرچاوە ل ٥٦٢.
١٢-هەمان سەرچاوە ل ١٢٧.
١٣- الشعرية، تودوروف ٢٤.
١٤- في الشعرية، كمال أبو ديب ص ١٠٣ اا لطبعة الأولى، ١٩٨٧، لبنان، بيروت.
١٥- هەمان سەرچاوە ل٢٩١.
١٦- المشاكلة والاختلاف ص ١٠٠ دكتور عبدالله محمد الغذامي، المغرب، دار البيضاء، ١٩٩٤.
١٧- المشاكلة والاختلاف ٩٧.
١٨- دیوانی نالی ٢٠٤.
١٩- دیوانی مەولەوی ٢٠١.
٢٠- دیوانی مەحوی ١٩.
٢١- المشاكلة والاختلاف ٦٨.
٢٢- دیوانی مەحوی ٢١٩.
٢٣-المشاكلة والاختلاف ١٠٦.
٢٤- دیوانی مەحوی ٦٦.
٢٥- المشاكلة والاختلاف ١٠٢.
٢٦- دیوانی مەحوی ٢٩٩.

# باسێک لە شیعری سۆفیگەری مەحوی

نووسینی: عەبدولوەهاب چروستانی

کە مەحوی ئەسپی خۆی تاو دا لە مەیدانی فەصاحەتدا
بەجێ ما نالی وەک نالی بەجێ ما کوردی وەک گەردی

خۆشم بۆ مەحوی ئەڵێم:

ئەگەر خەڵکی لە مەیدانی عیشقدا میر و سوڵطانە(١)
ئەوا مەحوی لە کۆڕی شاعیرانا میری میرانە(٢)
بەبیری ورد و ئەندێشەی فراوان ئۆقیانووسی
قەسیدەی شیعری ئەو مەردە ڕەنووکی(٣) ئەهلی عیرفانە

دەروازەی والآمان بۆ چوونە مەیدانی باسی شیعری مەحوی ئەبێت شارەزا بوونمان بێت لەبیری سۆفیگەری. لە ڕاستیدا پەرتووکخانەکانی کوردستانی ئەگەر بێ بەش نەبن ئەوا زۆر کەم بەشن لەو سەرچاوە و نووسینانەی کە لە بواری سۆفیگەریدا قەڵەمی تیا خراوەتە گەڕ ئەوەی هەشبێت زیاتر یا بەزمانی عەرەبی یا فارسییە، جا لێرەدا ئێمە ئەم ڕەخنەیە کە لە نووسەرانی کورد ئەگرین مەبەستمان تەنها بەزەیی هاتنەوە نییە بەکەمی زانستی سۆفیگەری لە بڵاوکراوەکانی کوردیدا ئەگەرچی ئەوەش بۆ خۆی خاڵێکی لاوازییە بۆ نووسین و نووسەری کورد بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە ئەوەی شارەزایی تەواو و ڕۆشنبیری لە جیهانی سۆفیگەریدا نەبێت ناتوانێ مافی تەواو بدات بەو ڕاڤەکردن و توێژینەوانەی کە لە بواری هۆنراوەی سۆفیگەریدا ئەیکات، وە ئەوانەی خۆیان بەحەقدار ئەزانن لە لێکۆڵینەوەی شیعرەکانی شاعیرانی سۆفیدا ڕایان ئەکێشێت کە بە ئارەزوو و ویستی خۆیان تەئویل کردنی ناپەسەند و بێ ئاگا بخەنە سەر ڕووی کاغەز و ئەمەش ناهەقییەکی گەورەیە ئەکرێت بەرامبەر ئەم شاعیرانە. هۆنراوەی سۆفیگەری جیهانێکی تایبەتی هەیە و دەریایەکی فراوانە، ئەوەی بیەوێت خۆی لەقەرەی ئەو دەریایە بدات ئەبێت چابووک و شارەزا بێت لە مەلەوانی و دەریاکەشدا، بۆیە کەسێکی وەک (إبن الفارض) ناسراو بە(سلطان العاشقين) شاعیری سۆفی سەدەی شەشەمی کۆچی و هاوچەرخی (إبن عربي) و (سهروردي) و (إبراهيم الجمبري) و زۆر لە سۆفییە گەورەکانی تر بوو کاتێ داوایان لێ کرد ڕاڤەی شیعرەکانی بکات بەتایبەت قەسیدەی (التائية الكبرى) کە ٧٦١ بەیت بوو ئاوێنەی بیری سۆفیگەری ئەو بوو بە بەرامبەرەکەی وت: ئەتەوێت لە چەند بەشدا (جزء) ڕاڤەی بکەیت.(٤)

وتی: لە دوو بەشدا. (إبن الفارض) پێی وت: ئەبێت هەر بەیتێکی لە دوو بەشدا ڕاڤە

بکەیت. جا ئێمە لێرەدا ئەم باسەمان بۆیە هێنایە کایەوە چونکە خاڵی دەست پێکردنمانە لە باسی دەریای فراوانی شیعری مەحوی، من لێرەدا ئەڵێم: ئێمە لەسەر دوو ڕێیانێکین لە بارەی ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی شیعرەکانی مەحوی کە ئەبێت ئاڕاستەی خۆمان لەسەر ڕێیەکی ئەو دوو ڕێیانە دیاری بکەین، لقێکی ئەو دوو ڕێیانەش ناسینی مەحوی وەک شاعیرێکی سۆفی و هەڵسەنگاندنی شیعرەکانی لەبەر ڕۆشنایی بیر و بنەماکانی ژیانی سۆفیگەری لە حاڵێکدا کەسیش نکۆڵی لەو ڕاستییە نییە بەشاهێدی پێنووسی زۆربەی زۆری ڕەخنەساز و مێژوونووس و ئەدەب دۆستانی کورد، لقی دووەمی ئەو دوو ڕێیانەش ئەوەیە شیعرەکانی مەحویش وەک شاعیرە مەزنەکانی تری کورد (نالی و کوردی و قانیع و...هتد) مامەڵەی لەگەڵ بکرێت لە لێکدانەوە و ڕاڤەکردنیدا.

بەڵام سەیر لەوەدایە کە لەگەڵ ئەوەشدا دان نراوە بەوەدا کە مەحوی شاعیرێکی سۆفییە کەچی هەر لێکدانەوەیەکی ڕووکەش کراوە بۆ هۆنراوەکانی، ڕاڤەکەران و لێکۆڵەرەوان نەچوونەتە قووڵایی بیری سۆفیگەری مەحوییەوە، ئەتوانم بڵێم دەست بەخامەکانی ئەو بوارە دەستکورت بوون ئەگەرچی وەک لێکدانەوەی ڕووکەشی کاری باشی بۆ کراوە.

کاتێ مەحوی خۆی دان بەوەدائەنێت کە ئەو هەڵگری بیروباوەڕەکانی ئەمثالی (إبن عربي و حلاج و رابعة العدوية وإبن الفارض)ە و ئەوان بەپێشەوای ڕێبازی سۆفیگەری دائەنێت، ئەوەتا ئەڵێت:

بکە سەیری (فتوحات) ئەر گەرەکتە تۆ فتووحی ڕۆح
کتێبی دڵ موتالاکردنە بڕوانە (مەکتوبات)(٥)

ئەم بەیتە شیعرەی مەحوی هیچ تەمومژێ ناهێڵێت لەسەر ڕووی ئەو ڕاستییە کە چەند مەحوی پابەندی بیری سۆفیگەری «إبن عربي» بووە چونکە بەئاشکرا ئەڵێت: ئەگەر ئەتەوێت مەقاماتی سۆفیگەری ببڕیت و پلە بەپلە پیایدا سەرکەویت ئەبێت پەیڕەوی (إبن عربي) بکەیت و جێ پێی سەرمەشقی ئەو ڕێبازە هەڵگری کە لە کتێبەکەیدا بەناوی (الفتوحات المكية)دا دیاری کردووە.

وە لە شوێنی تریشدا مەحوی دووبارە ئیشارەت ئەکاتەوە بۆ گرنگی فتوحاتی مەکی و بەدەروازەی والای چوونە ژوورەوەی ئەزانێت بۆ جیهانی بێ سنووری ئەو خۆشەویستییە حەقیقییەی کە هەزارەها وێڵ و سەرگەردانی بووە، مەحوی (إبن عربي) لەو ڕێبازەدا بەئیمام و پێشەوای خۆی لە قەڵەم ئەدات بۆیە ئەڵێت:

باسی چیبکەم بێ کەرانیی بەحری تەشویری عیشق؟!
تاقە قەطرێکی (فتوحات)ە، نمێکی (مەثنەوی)(٦)

بەڵێ ئەو لەو دەریا بێ بن و بێ لێوارەدا خۆی بەمەلەوانێکی نەزان و بێ پەل و پا ئەزانێ ئەگەر پەنا نەباتە بەر فتوحاتی مەکی (شێخ محی الدين)ی عەرەبی، با ئەو فتوحاتەش

قەترەیەکی ئەو دەریایە بێت وەیا پەنا نەباتە بەر کتێبی مەثنەوی کە (جلال الدين)ی ڕۆمی بەفارسی دایناوە کە ئەویش هەر چراخانێکی ئەو مەیدانەیە، بەو جۆرە بینیمان چۆن مەحوی ئاگاداری ئەو نووسینانە بووە کە لە بواری سۆفیگەریدا بەفارسی و عەرەبی بڵاوکراونەتەوە خۆ ئەگەر بەوردی شیعرەکانی مەحوی ڕاڤە بکرێن و لێکۆڵینەوەیان بۆ بکرێت زۆر بەئاشکرا بیری (إبن عربي) تیایاندا ڕەنگ ئەداتەوە، ئەوەتا مەحوی بێ چەند و چوون بڕوای بەمەسەلەی (وحدة الوجود) هەیە کە (إبن عربي) داهێنەری ئەو بیرەیە لە شێوەی تەواویدا کە ئەڵێت: «سبحان الذي أظهر الأشياء وهو عينهما»(٧)

واتە: پەنا بەوکەسەی هەموو شتێکی هێناوەتە پێش چاو خۆشی جەوهەری ئەو شتەیە یان کە ئەڵێت:

فـمـا نظرتْ عـيـني إلى غـيـر وجـهـه<br>ومـا سـمـعت أذني خـلاف كـلامـه(٨)

واتە چاوی من جگە لە ڕووی ئەو بەهیچ شتێکی تردا هەڵنەهاتووە گوێشم هیچ دەنگێکی نەبیستووە جگە لە دەنگی ئەو نەبێت.

جا بەڕاستی ئەو هۆنراوەیەی (إبن عربي) ئەگەر کەسێک شارەزای بیری (وحدة الوجود) نەبێت بێگومان لە مەبەستەکەشی ناگات کە هەموو دەنگ و ڕەنگ و ڕوویەک لای (إبن عربي) بیستنی دەنگ بینینی ڕووی خوایە مەحویش لەبارەی بڕوایەوە بە (وحدة الوجود) ئەڵێت:

غەیری وەحدەت لە وجودا نییە، کەثرەت وەهمە<br>سادە تەکراری یەکە، مەنشەئی ئەوهامی عەدەد(٩)

بەڵێ مەحوی بەئاشکرا و بێ هیچ سڵ کردنەوەیەک دان بەو (وحدة الوجود)ەی (إبن عربي) دائەنێت و بڕوای پێ ئەهێنێت و ئەڵێت: «ثنائية الوجود» نییە و یەکبوونی حەقیقی هەیە و بوونەوەرانی تر سێبەری ئەو بوونە ڕاستەقینەیەن و زۆرن لە سیفات و ناویاندا یا وەک وێنە دانەوەی کەسێک کە لە ئاوێنەدا مەحوی ڕای إبن عربی دووبارە ئەکاتەوە و ئەڵێت: پەیوەندی نێوان خوا و بوونەوەر وەک پەیوەندی نێوان ژمارەیەک و ئەو ژمارانەی کە لە چەند جارەکانی یەک دروست ئەبن وایە، ئەوەتا ئەڵێت ژمارەی دە بنچینەی بوونەکەی یەکە و دە و هەموو ژمارەیەکی تریش جگە لەیەک ڕاستی بوونیان لە بوونی ژمارەی یەک پەیدابووە کەواتە مەحوی ئەڵێت: بوونەوەر وەک ژمارەکانی کە لەیەک هەڵدەستن دەچێت و یەک کە خوایە بنچینەی بوونی بوونەوەرەکانە لە شوێنی تردا مەحوی هەمان مەبەست بەکینایە ئەدرکێنێ کە ئەڵێت:

نەقشی خودا ببینە و لە خەڵقی خودا گەڕێ<br>گەر ئەهلی ئیحتیرازی، لە کەس مەگرە ئیعتیراض(١٠)

کەواتە مەحوی لەم بەیتەدا مەخلوق بەسیفات و تجلیاتی خوا ئەزانێ ئاگاداری لۆمەگر و

ڕەخنەگران ئەکاتەوە کە وریا بن دەست هەڵگرن لە لۆمە و ڕەخنەگرتن لەهەر بوونەوەرێک هەیە چونکە ئەوان نەقشی خودا خۆین نابێت کەموکوڕیان بوترێت و بەچاوی بێ بەهاوە تەماشا بکرێت چونکە هەموو بوونەوەرێک لە جەوهەردا یەکە لە شوێنی تریشدا مەحوی هەر لە بواری بڕواهێنانی بەمەسەلەی (وحدة الوجود) هێمای پێ دەکات و دەڵێت:

نە ناوی ڕۆژ و مەه بردن، نەباسی صەدر و شەه کردن[11]

مووەحید هەر دەبێ هەریەک بناسێ، هەر لەیەک دەدوێ

لێرەشەدا مەحوی هەموو بوونەوەرێک ئەخاتەوە ناو بازنەی (وحدة الوجود)ەوە ئەوەتا ئەفەرموێ: ڕۆژ و مانگ شا و وەزیر کە بەحیساب ئەمانە لەسەردەمی خەڵکن و دیارن ئەگینا ئەو ئەیویست بڵێت بەپایەدار و هەژارەوە واتە بەمیر و گزیرەوە هەمووی لە بنەڕەتا لە جەوهەری دا خوایە با لە پلە و پایەو شێوە و ناویشدا جیاواز بن ئەوەتا بە وشەی (هەر) تاکیدی ئەوە دەکات کە ئەبێت موحد هەر خوا بناسێت و دان بەبوونی ڕاستەقینەی ئەودا بنێت موحدیش مەبەستی لە موحدی خاصە واتە موحدی سۆفی و بڕواداران بە(وحدة الوجود) بۆیە ئەبێت ناو و باسی شتێکی تر نەبات چونکە ئەوانە هەمووی ڕووکەشن و لە گۆڕانی بەردەوام دان و مانەوەی هەتا هەتاییان نییە.

جارێکی تریش مەحوی هەر لەو مەیدانەدا ئەڵێت:

هەرچی هەیە موسەبیبە، باقێکە فانییە[12]

بەندی یەکێ بە، بەس ببەرە عەبدی صەد هەزار

«مەحوی» چ کەس مەناسە، بناسە خوداو و بەس

ذیکری یەکێ کە، مارە، مەکە باسی چار و مار

مەبەستی بەڕوونی ئەوەیە ئەبێت ئەو ڕاستییە بزانرێت کە بوونی ڕاستی هەر لە خودایە، بوونەوەرەکانی تر ڕووکەشن و نامێنن، وە کە ئەڵێت بەندی یەکێبە مەبەستی ئەوەیە بڕوات بەو تاک بوونە ڕاستییە هەبێت، وە ئەگەر دان بنرێت بەبوونی ڕاستی بوونەوەرانی تردا وەک ئەوە وایە هاوتاکت بۆ خودا پەیدا کردبێت ئەمەش لە ڕێ لادانە بۆیە دووبارە ئەڵێت: مەحوی چ کەس مەناسە و وای دامەنێ کە بوونەکەی بوونێکی ڕاستییە چونکە ئەوانە سێبەری خوا و سیفاتی ئەون دیارە مەبەستی مەحوی لە ناسینەکە بەڕاستی زانینی بوونەکەیەتی چونکە وشەی ناسینی بۆ خوا و بۆ خەڵکیش دووبارە کردۆتەوە.

بەڵێ لەو چەند نموونانەی باسمان کرد نیشانمان دا کە مەحوی ئاگای لە بۆچوونی (إبن عربي) هەبووە لە بیری (وحدة الوجود)دا کە (إبن عربي) دامەزرێنەر و داهێنەری ئەو بیرە بووە لە شێوەی تەواویدا وە جێ پێی ئەوی هەڵگرتووە بەڵام (وحدة الوجود)ێک کە ناسینی خوایە وەک بوونێکی ڕاست وە بوونی بوونەوەرانی تر بوونێکی مەجازییە خوا خۆشی ئەفەرموێ (کل شيء

هالك إلاّ وجهه) گومان له بڕوای بەهێزی (إبن عربی) و مەحوی ناکرێت لەبەندایەتییانا (إبن عربي) ئەڵێت: «لایجوز لعارف أن یقول (أنا اللّه) ولو بلغ أقصی درجات القرب وحاشا العارف من هذا القول، حاشاه إنما یقول: «أنا العبد الذلیل في المسیر و المقیل».(١٣) بۆ مەحویش شیعرەکانی لەستایشی خوادا و لە پاڕانەوەی خوادا شاهیدی حاڵی ئەوەن چەند بڕوای بەخوا هەبووە و چەند زەلیلی و بێ دەسەڵاتی خۆی پیشان داوە و چاو لە دەستی بەزەیی و سۆزی ئەو بووە.

هەروەک لە سەرەتاوە وتمان کە مەحوی ئاگای لە زانستی سۆفیگەری و ڕابەرانی هەبووە و لێکچوونی (ابن عربي) و (مەحوی)مان لە بواری (وحدة الوجود)دا لە چەند نموونەیەکدا دەستنیشان کرد بەکورتی ئەو باسە زۆر لەوە زیاتر هەڵئەگرێت و مەحوی لە زۆر جێی تردا هێمای بۆ کردووە.

لەلایەکی ترەوە مەحوی ئاگاداری بیروباوەڕی (مەنصوری حەلاج) بووە و لە عاستی دا ئەفەرمووێت:

بەحەق هەر حەق بەناحەق ناحەقم وتوە لە ڕۆژێ بووم(١٤)
وەکو مەنصور ئەگەر بیشمکوژن ناکەم لە حەق لادەم

یان ئەفەرمووێ:

هەتا حەق ناصیرە، هەر حەقمە مەنظور(١٥)
وەکو (مەنصور) ئەگەر بمکەن بەدارا

دیارە بەو جۆرە بەستنەوەی خۆی بەحەقەوە و لانەدان لەسەر وتنی حەق وە ناوهێنانی مەنصوری حەلاج لەو باسەدا دیارە هەر مەبەستی بەحەق زانینی مەنصورە و ئیتر چەند و چۆن ئەوانەش پێویستیان بەلێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زۆر هەیە کە لێرەدا ئەو بوارەمان نییە کە زۆر لەسەری بڕۆین .

مەحوی لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت:

قاتی پیاوە لەسەر ئەم ئەرزە دەبینی مەنصور(١٦)
بەسەری دارەوە، (ذا النون)ە لەبن زیندانا

لەو بەیتەشدا مەحوی بەشان و شکۆی حەلاج و (ذو النون)دا هەڵی داوە و ئەوانی بە مەرد و پیاوی مەیدانی پیاوەتی زانیوە چونکە بەبێ سڵەمینەوە لە پێناوی وتنی ڕاستی و بیری سۆفیگەرییەکەیاندا هەڵوێستیان بووە لە دەرئەنجامی خراپی ئەو هەڵوێستەشیان نەترساون، ئەوەبوو حەلاج سەری خۆی بۆ دانا و (ذو النون)ی میصریش کە ساڵی ٢٤٥ کۆچی وەفاتی کردووە ماوەیەکی زۆر لە زیندانی بەغدا توندکرا. بێگومان مەحوی ئەگەر لە بیروبۆچوونیان ئاگادار نەبووبێ هەڵوێستیانی هەڵنەئەسەنگاند و نەیئەنرخاندن و بەمەردی دانەئەنان.

هەروەها مـەحـوی شـوێن پێی (رابعـة العـدوية)ی هەڵگرتووە کـە یەکـێک بووە لە سـۆفـییـە گەورەکانی سەدەی دووەمی کۆچی لەبەسرە و بیرۆچکەی خۆشەویسـتی خوای خستۆتە مەیدانی سـۆفـیگەرییـیـەوە و وتوویەتی: «خـوایە ناتپـەرسـتم لە ترسی ئاگـر و لە ئارەزوومـەندێتی بەهەشـتـەکەت بەڵام لە خۆشەویسـتیتا و لەبەر خاتری ڕووی پیرۆزی خۆتە بەندایەتیت ئەکەم. دووبارە ئەڵێت:

كلهم يعبدون من خوف نار[١٧]
ويرون النجـــاة حظاً جـــزيلا
أو لكي يسكنوا الجنان فيحظوا
بكؤوس ويشربوا السلسـبيـلا
أو يقيموا بين القصور جميعا
أنا لا ابتـــغي بحـــبي بديلا

دیارە (رابعـة العـدوية) نە لە ئاگـری دۆزەخ و نـە لە خـۆشی بەهەشت بیـریکردۆتەوە ئەوەی مەبەستی ئەوە خۆشەویستی خوایە و ئەو خۆشەویستییە هیچ شتێک بەرامبەری نییە بێگومان لەم خـۆشـەویسـتی خـوایەدا زۆر شـاعـیـری سـۆفی تر ئەسپی خـۆی بەچابووکی تیـادا تاوداوە، مەحویش ئەوەتا لەو مەیدانەدا ئەفەرموێت:

گـەر ئاگـری مـەحـەبـبـەتی شک بەم لە دۆزەخـا[١٨]
ئەو دۆزەخـە بەهەشـتـــمـە، جـەنەت دەکـەم حـەرام

مـەحـویش وەک (رابعـة العـدوية) و ئەمـثـالی ئەو مـەبەسـتی چوونە بەهەشت نەبووە لە خـواپەرسـتـیـیـەکـەیدا هەروەک چۆن لە ئاگری دۆزەخیـشی نەترساوە وە لەوە زیاتریش ئەگـەر خۆشـەویسـتی خـوای لەناو دۆزەخیـشـدا چنگیـر ببێ ئەو دۆزەخـە هەڵدەبژێرێ و بە بەهەشـتی ناگۆڕێتەوە و بەڵکو هەر بەهەشت لە خۆشی حەرام دەکات.

جارێکی تریش هەر لە بواری خۆشەویستی خوادا ڕووبەڕووی زاهید ئەدوێت و پێی ئەڵێت:

کـە ئێـــمـــە چوونە جـــەننەتمان بەتۆ دا[١٩]
لە ئێـــمـــە لادە زاهیـــد ئێـــمـــە هەرچین

لەم بەیتەشدا مەحوی بیروباسی لای بەهەشت نییە و ناشیەوێت و هەوڵ و هەڵپەشی بۆ ناکات بۆیە بەزاهید ئەڵێت: بەهەشت بۆ تۆ، تۆ هەڵپەت بۆ بەهەشتە و ئێمە بۆ شتێکی تر برۆ زاهید تۆ پاداشتی بەرامبەری زوهد و خواپەرستییەکەت کە بەهەشتە وەری بگرە ئێمە کڕین و فرۆشتن لەگەڵ خوادا ناکەین ناپیەرستین بۆ ئەوەی بەرامبەر تاکی تەرازووی پەرستنەکەی بەهەشـتـمان بداتێ چونکە خۆشەویستیمان بۆ خوا بێ بەرامبەرە، لێرەدا بەجوان و شیاوی ئەزانم حیوارێک بگێڕمەوە لە نێوانی ئافرەتێکی سۆفی خواپەرست لەگەڵ کۆڕێکی (حبان بن هلال)دا.

(ئافرەتەکە رووی کردە کوڕەکە و وتی: بۆم هەیە پرسیارێکتان لێ بکەم.
وتیان: بپرسە ئەوەی ئەتەوێت.
ئافرەتەکە وتی: بەخشندەیی چییە بەلاتانەوە.
وتیان: بەخشین و پێشخستنی بەرژەوەندی خەڵکە بەسەرخۆدا.
ئافرەتەکە وتی: ئەوە بەخشندەییە لە دونیادا ئەی لەدینا چییە؟
وتیان: ئەوەیە خواپەرستیت و گیانت لە پێناویدا دابنێیت بەویستی خۆت و حەزی خۆت.
ئافرەتەکە وتی: پاداشتان ئەوێت؟
وتیان: بەڵێ.
ئافرەتەکە وتی: بۆ؟
وتیان: خوا پەیمانی داوە بەرامبەر بەیەک چاکە دەقات پاداشتە.
ئافرەتەکە وتی: پەنا بە خوا ئێوە بەرامبەر چاکەیەک دەقات پاداشتان بدرێتەوە ئەوە بەبەخشندەیی دەزانن.
وتیان: ئەی بەخشندەیی لای تۆ چییە؟
وتی: بەخشندەیی ئەوەیە کە ئارەزوو خۆشیتان لە پەرستنی خوادا دەست بکەوێت بێ بیرکردنەوە لە پاداشت، شەرم ناکەن لەوەی لە کاتێکدا خوا لە دڵی ئێوەدا ئاگای لە هەموو ویست و ئارەزوویەکتانە ئێوە لە دڵتانا چاوەڕوانی بەرامبەر خواپەرستییەکەتان بکەن ئەوە شتێکی ناشیرینە لە دونیادا).(٢٠)
هەو لە بوارێکی تر و لە مەیدانی جێ پێ هەڵگرتنی گەورەپیاوانی سۆفیگەریدا ئەمثالی «إبن عربي» کە ئەڵێت: «إن اللّه سبحانه وتعالی یتجلی أعظم مایتجلی في صورة المرأه»(٢١)
ئەوەتا (ابن الفارض) شاعیری سۆفی سەدەی شەشەمی کۆچی بەئاشکرا و بێ هیچ تەمومژێک ئەڵێت:

وتظهـــر للعـــشــــاق في كل مظهـــر
من اللبس في أشكال حـــسن بديعـــة(٢٢)
فـــفي مـــرة لبنـی وأخـــری بثـــينة
وآونـة تـدعـی بـعـــــــزة عـــــــزَّت
ولسنَ ســــواها لا ولاكنَّ غـــــيـــــرها
ومـــا إن لهـــا في حـــسنهـــا من شـــريكة

مەحویش هەر وەک ئەوان و لەو بوارەدا کینایەی خوای بەئافرەت کردووە و دەڵێت:
ئەوا لەیلا بەرۆژی حەشر ئەدا وادەی لیقا «مەحوی» (٢٣)

هەتا قـامی قـیـامـەت، ئاه و واوەیلا نـەکـەم چیبکەم!

بێگومـان خـوا مـژدەی بینینی خـۆی ئەدا بەئەهلی ئیـمـان لە ڕۆژی قـیـامـەتدا مـەحـویش خـۆی بەشـایسـتـەی ئەو بینینە ئەزانێ بۆیە ئەڵێت: لەیلا کـە کـینایەیە بەخـوا ئەو وادەی بینین و پێگەیشتنەی بەئێمە داوە بەڵام واوەیلا تا ڕۆژی قیامەت مەگەر ئێمە تا پێگەیشتنی ئەو بینین و پێگەیشتنە هەر شین و شەپۆڕ بکەین، لە شوێنێکی تریشدا هەر ئەفەرموێت:

بـەدوویـا ویـڵـم و ئـەشـکـم دەپـرسـێ(٢٤)

لـەهـەر دار و دیـارێ (أيْـنَ سَـلـمْـــــــــاك)

سەلما لە ئەدەبی عەرەبیدا کینایەیە بۆ خـۆشەویست ئیـتر خۆشەویستەکە ناوی هەرچی بێت هەروەک چۆن شیرین یا لەیلا لە ئەدەبی کوردیدا کینایەیە بۆ خۆشەویست، بۆیە مەحویش وێڵ و سەرگەردانی خۆشەویستەکەیەتی بەناوی سەلماوە کە کینایەیە بۆ خوا ئەیەوێت بەڕووی شاد بێت وە بەدوای ئەو ڕاستـیـیـەدا ئەگەڕێ و ئەیەوێت بگاتە (حق الیـقین) بۆیە ئەگـەڕێ و ئەپرسێ لە داروبەرد و هەمـوو شتێک کە پێی بگات بۆ ئەوەی بە سەلما شاد بێت لە شوێنی تریشدا مەحوی کـینایەی خـوای کـردووە بەناوی ئـافـرەتەوە کـە ئێـمـە لێـرەدا لەوە زیاتر بواری لێ دوانمان نیـیـە ئەوەندەی پێویستە بیـڵێین ئەوەیە لەم بوارەشدا هەر لە ڕوانگەی (وحدة الوجود)ەوە سۆفییـەکان ئەو بۆچوونەیان هەیە.

بەڕاستی ئەمەی ئێمە لەسەر ڕووی ئەم چەند کاغەزە نووسیومانە مشتێکە لە خەروارێک باس و لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە شیعرەکانی مەحوی زۆر زۆر بیر و کات و زانیـاری ئەوێت لە بواری بیری سۆفیگەری و سۆفییـە گەورەکاندا هیوام وایە بەم چەند پەڕەیە توانیبێتم تیشکێکی تازەم بەکەمی خستبێتە سەر ژیانی سۆفیگەری مەحوی و ڕێچکەیەکم خۆش کردبێت بۆ کەسانی تر لەو بوارەدا بەهیوای قبوڵ کردنی.

نەمری بۆ گـیـانی مـەحـوی و زیاتر هەوڵدان لە پێناوی زیندووکـردنەوە و لێکدانەوەی ڕاست و پێویست بۆ شیـعری شاعـیرانی گەورەی میللەتەکـەمان کە لە پلە و پایە و مەزنیدا هیچ کەمـتر نییە لە شاعیرانی تری میللەتانی زیندوو لە جیهاندا.

ئیتر سەرکەوتنتان دروشممە

سلێمانی/ زانکۆی سلێمانی

کۆلێجی زمان/ بەشی عەرەبی

**پەراوێزەکان:**

(١) مەبەستمان ابن الفارضة کە لەقەبەکەی (سلطان العاشقین).

(٢) ئەمانەوێت لەقەبی (سلطان الشعراء) بدەین بە مەحوی.

(٣) ڕەنووک: واتە ئاوێنە

(٤) شرح ديوان (إبن الفارض) مطبعة الأزهرية مصر ج١ ص٧.
(٥) ديوانی مەحوی ل٣١٨.
(٦) هەمان سەرچاوە ل٣٦١.
(٧) الفتوحات المكيه ج٢، ٦٠٤
(٨) فصوص الحَكَم أبو العلا العفيفي ص٢٥.
(٩) ديوانی مەحوی ل١١٣
(١٠) هەمان سەرچاوە ل١٥٧.
(١١) هەمان سەرچاوە ل٣١٣.
(١٢) هەمان سەرچاوە ل١٢٤.
(١٣)(ابن عربي) حياته و مذهبه ترجمة عبدالرحمن بدوي.
(١٤) ديوانی مەحوی ل٢٢٧.
(١٥) هەمان سەرچاوە ل٨.
(١٦) هەمان سەرچاوە ل٣٤.
(١٧) حقائق عن التصوف عبدالقادر عيسى ص٢٨٥.
(١٨) ديوانی مەحوی ل٢١٣.
(١٩) هەمان سەرچاوە ل٢٤١.
(٢٠) (ابن عربي) حياته و مذهبه أثنين بلاثيوس ترجمة عبدالرحمن بدوي ص٢٤٩
(٢١) التصوف جدلية وإنتماء أحمد علي حسن ص٣٦.
(٢٢) ديوان إبن الفارض د. ابراهيم السامرائي ص٣٩.
(٢٣) ديوانی مەحوی ل٢٣٣.
(٢٤) هەمان سەرچاوە ل١٨٥.

## بەدەم مەوجی خوێنی ئەشکەوەم

بەدەم مـــەوجی خـــوێنی ئەشکەوەم، بڕوانە چۆنم بۆت!
دەروونم کـەیلی زووخی دەرد و غـەم، بڕوانە چۆنم بۆت!
ڕەقیبی سەگ حەزی بوو، کوشـتمت، سەیری کە چۆنی بۆم
دوعـا بۆ دەست و تێـغت مـن دەکـەم، بڕوانە چۆنم بۆت!
بەغـــدداری نەوەک ناوت بەرن، بم ئەنجنی، قـــەت من
شکاتی جـەوری تۆ بەرکـەس دەبم؟ بڕوانە چۆنم بۆت!
هەناســـەی ئاگـــرینم بردەوەبەر، تا دەروونم ســـووت
بەناڵە تا دڵت ســەخـڵــەت نەدەم، بڕوانە چۆنم بۆت!
بیــانوو بگرە، شـێـوەی خـۆت بشـێـوێنە بەمن کـوشتن
وەهـا چـاوی بـەدت لـێ لادەدەم، بـڕوانـە چـۆنم بـۆت!
بەئاوی گـریە هەردەم ناوی چاوم شـشـتـووە، نەک جـێت
بەخوێن ئاغـوشـتـەبێ، تۆ، چاوەکەم، بڕوانە چۆنم بۆت!
غەمی خۆشی نییە «مەحوی» لە دڵیا، هەر غەمی تۆیە
لە عـەشـقـتـدا دەکـەم غـەم بۆ بەغـەم، بڕوانە چۆنم بۆت!

**مەحوی**

# وێنەی شیعریی لە هۆنراوەکانی (مەحوی)دا

نووسینی: کەریم شارەزا

## پێشەکی

وێنەی شیعریی هونەرێکی ڕەوانبێژیی ئەدەبییە، لە بارەی بێ ئاگایی لەلای شاعیری داهێنەر دەخولقێ و دەبێتە مایەی جوانکاریی لە هۆنراوەکانیدا و بەزۆری وێنەیەکی ڕوونبێژیییە و لە ڕێگەی لێکچواندن و ئاوەڵواتا (خوازە) و (خواستن) وەیا لە ڕێگەی وەسفکردن و پێکەوەنانی هونەری درکە (کینایە)وە دروست دەبێ و تام و چێژێکی تایبەتی دەدات بەگوێگر و خوێنەری شیعرەکان. چونکە کاردەکەنە سەر هەست و سۆز و ئەندێشەیان و تام و چێژێکی خۆشیان لێ وەردەگرن.

خولقانی وێنەی شیعری لە هۆنراوەی شاعیراندا، سەردەمی کۆن و نوێی بۆ نییە، چونکە لەگەڵ پەیدابوونی شیعر، وێنەی شیعریشی لەگەڵدا خولقاوە، بەبێ ئەوەی شاعیر ئاگاداری بێ وەیا مەبەستی خولقاندنی وێنەکانی بێت، واتە: لەباری بێ ئاگایی شاعیر دروست دەبێ و، وا دەبێ وێنەیەکی زۆر جوان و گەش و گوڵ لە شیعری شاعیرێکی کۆندا خولقابێ، لەوانەیە گەلێک گەشتر بێ لە وێنەی شیعری لەلای شاعیرێکی نوێدا و، ئەم دیاردەی وێنەی شیعریش، ڕەخنەگرانی ئەدەبی ڕۆژئاوا پتر لە دوو سەد و پەنجا ساڵە کەوتوونەتە سەر لێکۆڵینەوەی و، لە سەدەکانی شازدەم و حەڤدەم دا ئەو ڕەخنەگر و شیعر ناسانە لەو باوەڕە دابوون کە وێنەی شیعری تەنها بۆ ڕازاندنەوەی هۆنراوەی شاعیرە و بەس، کەچی لەم سەردەمەماندا، ئەو وێنەیە بووەتە بەشێکی هەرە گرنگ لە هۆنراوەدا و دەشێ ناوی بنێین دڵی تاقیکردنەوەی ئەدەبیی شاعیر. لە ئەدەبی کوردیشماندا وا بیست سی ساڵێکە لێکۆڵەرەوە و ڕەخنەگرانمان ئاوڕیان لە وێنەی شیعری داوەتەوە و هەندێ لێکۆڵینەوەی شیاویان لەسەر دەسنیشان کردن و شیکردنەوەی ئەو هونەرە ناسکە لە شیعری شاعیرانی کورددا کردووە. ئێمەش لێرەدا دەمانەوێ ئەم دیاردە ئەدەبی و ڕوانبێژییە لەناو هەیکەلی شیعرەکانی شاعیرانی مەزنی کورد مەحوی دەسنیشان بکەین و نموونەی گەش و زیندوویان لێ هەڵبژێرن و بەپێی توانا تیشکی شیکردنەوەیان بخەینە سەر و لە چۆنیەتی دروست بوون و جۆرەکانی ئەو وێنانەوە بدوێین و، بزانین بەچ هەستێک لە هەستەکانی ئادەمیزاد وەردەگیرێن و لەگەڵیاندا دەگونجێن.

### پەیوەندیی لە نێوان شیعر و وێنەدا

لەسەردەمێکی زۆر کۆنەوە شاعیر و هونەرمەندان و زانایانی جیهان بیریان بۆ ئەوە چووە کە

شیعر دانان و وێنەکێشان، بەتایبەتی شیعری وەسف پەیوەندییەکی هونەرییان لە نێواندا هەیە. یەک لەوانە شاعیری مەزنی گریک (یۆنانی کۆن) سیمۆنیدس (٥٥٦-٤٦٨)ی پێش زایین، گوتوویەتی: «وێنە شیعرێکی بەهێڵ کێشراوە و شیعریش وێنەیەکە بەوشە و بەدەنگودوو دەردەبڕێ» [١].

لە نووسەر و ڕەخنەگرە مەزنەکانی عەرەبی سەردەمی عەبباسییەکانیش، یەکێکی زانای وەک (ئەلجاحز)کە لە نێوانی سالآنی (٧٧٥-٨٦٨)ی زایینیدا ژیاوە، لە کتێبەکەی (ئەلحەیەوان)یدا، لە بارەی پەیوەندی نێوان شیعر و وێنەوە گوتوویەتی «شیعر دارشتنێکی تایبەتییە و جۆرێکە لە وێنەکێشان» [٢].

شاعیر و ڕەخنەگری ڕۆمانسی ئینگلیزیش سەمۆئێل کولرێدج (١٧٧١-١٨٣٤) لە بارەی پەیوەندیی شیعر بەوێنەوە دواوە و گوتوویەتی : «شیعر جۆرە وێنەکێشانێکە بەوشە ئەنجام دەدرێ، بەمەرجێک پڕ هەست و سۆز بێت» [٣]. وەک دەبینین ئەم ڕەخنەگرە نوێکارە مەزنەش شیعر بەجۆرێک لە وێنەکێشان دادەنێ، بەمەرجێ پڕ هەست و سۆز بێت.

**وێنەی شیعریی و چۆنیەتی دروست بوونی**

وێنەی شیعریی لە سادەترین پێناسەی دا بریتییە لە: «وێنەیەکی هونەریی بەوشە کێشراو» [٤]. بەڵام کاتێک کە لە چەمک و ئەرکی ئەو وێنەیە لەناو هەیکەلی شیعریدا ورد دەبینەوە، هەست دەکەین ئەم پێناسەیە گەلێک سادە و ناتەواوە، چونکە لە دەوری سۆز و ئەندێشەی شاعیرەوە نادوێ کە هەوێنی دروستبوونی ئەو هونەرەن و دەبێ ئاماژەش بۆ ئەوە بکرێت کە ئەو وێنە هونەرییە لە ڕێگەی وەسف و لێکچوواندن و ئاوەڵواتا (خوازە) و (خواستن) و درکە (کینایە)وە لەباری بێ ئاگایی لەناو شیعری شاعیری داهێنەردا دەخوڵقێ و[٥]، وەک کارێکی هونەریی ناسک پێشکەش بەخوێنەر و گوێگری شیعر دەکرێت. هەندێ لە زانایان لە سەردەمێکی کۆنەوە لەو باوەڕە دابوون کە وێنەی شیعریی زادەی هونەری ئاوەڵواتا (خوازە) و (خواستن)ە و دەوری ئەو هونەرەیان لە خوڵقاندنی شیعری پتەودا دەرخستووە، یەکێک لەوانە فەیلەسووفی مەزنی گریک ئەرەستۆ (٣٨٤-٣٢٢ پ.ز) بووە و گوتوویەتی: «کاری گرنگ ئەوەیە بزانین شاعیر تا چ ڕادەیەک زاڵە بەسەر بەکارهێنانی هونەری (خوازە): (المجاز) لە شیعرەکانیدا و بەرەسەنایەتیەکەی حوکم لەسەر شاعیر بدەین و بزانین ئایا سەرکەوتنی لە خوڵقاندنی شیعرەکەی وەدەست هێناوە یان نا؟» [٦].

ڕەخنەگری کوردیش دوکتۆر کامیل حەسەن بەسیر (١٩٣٣-١٩٨٧) لە بارەی دەوری سۆز و ئەندێشە و (خوازە) لە خوڵقاندنی وێنەی شیعری و هەیکەلی هۆنراوەدا دەڵێ: «نابێ دەوری هەست و سۆز لەپاڵ ئەندێشەدا لەبیر بکەین کە هێزێکن لە هێزەکانی هۆشمەندیی ئادەمیزادی هونەرمەند و کارگەی خوڵقاندنی ئاوەڵواتا (خوازە)ن لە مەڵبەندی تۆمارکردنی واتاکانی وشە لە

مێشکدا، چونکە ئەندێشە هەروەک لە جیهانی ڕەخنەسازیدا چەسپاوە، هۆی لە دایکبوونی وێنەی ڕوون و هێنانەوەی ئەو وێنە بینراوانەیە»(٧).

### جۆرەکانی وێنەی شیعریی و چۆنیەتی وەرگرتنیان

وێنەی شیعریی دوو جۆری سەرەکی هەیە، وێنەی چەسپاو و وێنەی جووڵاو، جۆری یەکەمی دەتوانین لەیەک وێنە یان تابلۆیەکدا بیکەین بەوێنەیەکی هونەریی، چونکە لە یەک باردایە و گۆڕانکاریی تێدا نییە و جۆری دووەمیشی دەبێ لە چەند بارێکدا وێنەی بکێشین و لە چەند تابلۆیەکدا دایبڕێژین. لە هەردوو باریشدا دەبێ ئەو وێنانە هەست و سۆز و ئەندێشەی وەرگر (واتە: بینەر و خوێنەر) ڕابکێشن. جۆری چەسپاو فرمانی ڕستەکەی ڕابوردووە و جۆری جووڵاویش فرمانەکەی بەزۆری ڕانەبردوو و بەردەوامییە.

بۆ وەرگرتنیشیان، ئەگەر وێنەکە پەیوەندیی بەڕەنگ و دیمەن و ڕووناکی و تاریکییەوە هەبێ ئەوا بەهەستی بینین واتە بەچاو وەردەگیرێ و ئەگەر لە دەنگ و ئاوازەوە دوا ئەوا بەهەستی بیستن واتە: بەگوێ وەردەگیرێ و گەر لە بۆن و بەرامەشەوە دوا ئەوا بەهەستی بۆن کردن وەردەگیرێ گەر لە تام و چێژیشەوە دوا ئەوا بەچێژە هەست دەرکی پێ دەکرێ و خۆ ئەگەر لە نەرم و نۆڵی و ڕەقی و سەختی و توند و تۆڵیشەوە دوا ئەوا بەهەستی جەستەیی وەردەگیرێ و، ئێستاش دەکەوینە سەر دەسنیشان کردنی وێنەی پتەوی شیعریی لە هۆنراوەکانی شاعیری مەزنی کورد (مەحوی)ی لووتکە تاکو بزانین چۆن ئەو وێنانەی خوڵقاندووە و چ جۆرێکن و چۆن و بەچ هەستێک وەردەگیرێن:

### وێنەی شیعریی لە هۆنراوەکانی مەحویدا

مەحوی (١٨٣١-١٩٠٦) لە شاعیرە مەزنەکانی کوردە و یەکێکە لە چڵە پۆپەکانی ڕێبازی شیعری کلاسیکی کوردیمان، شاعیرێکی وردەکار و شێوە پتەوە. ڕوخساری هۆنراوەکانی بەتەواوی لەگەڵ ناوەڕۆکە پتەوەکانیدا کاریان لێک کردووە و لەگەڵ یەکتریدا جۆشاون و بوونەتە زادەی تاقیکردنەوەیەکی ئەدەبی کلاسیکی نەتەوەییمان و، زۆربەی هۆنراوەکانی بەفەلسەفەی تەصەووفی نەقشبەندیی ئاودراون، مەبەستیشی لە شیعردانانیدا بەکارهێنانی کێش و سەروای پتەو نەبووە، ئەوەندەی بەدوای ناوەڕۆکی بەهێزدا گەڕاوە و هەر هۆنراوەیەکی دایناوە کردوویەتی بە تاقیکردنەوەیەکی تازە بۆ داهێنانی هۆنراوەی پتەوتر و نوێتر و بەبێ ئاگاداری لە چۆنیەتی دروستبوونی شیعرەکانی. وێنەی جوان و پتەوی شیعری لەناو پێچ و لۆچی چەمکی شیعرەکانیدا خوڵقاون و بەچاکی هەست و سۆز و ئەندێشەی خوێنەر و گوێگری شیعرەکانی دەورووژێنێ و وێنەکانی لەناو هۆنراوەدا وەکو زنجیرەیەک ئاوێنەی ڕوون لە گۆشە جیاجیاکانی هۆنراوەکانیدا دادەنێ، تاکو جوانی بابەتەکانیان بنوێنن و شاعیری هونەرمەندیشمان وێنە شیعرییەکانی بەرزیی و ژیانی هۆنراوەکانی دەنوێنن.

ئەگەر بەوردی بەدوای هەڵبژاردنی وێنەی شیعریی چەسپاو و جوڵاو لەناو هۆنراوە بەپێزەکانی شاعیری مەزنمان مەحویدا بگەڕێین، بێگومان بەسەدان وێنەی گەش و گۆڵی شیعریمان دێتە دەست. بەڵام لەبەر کەمیی ماوەی پێشکەشکردنی لێکۆڵینەوەکەمان، تەنیا چەپکێک لەو وێنانە دەخەینە ڕوو و کەمێک تیشکی شیکردنەوەیان دەخەینە سەر و بەپێی ئەو وتەیەی کە دەڵێ: «مشتێک نموونەی خەروارێکە» بەوەندە نموونەیە دەوەستین و گوڵبژێرێکیان لێ دەخەینە بەرباس و لێکۆڵینەوەیەکی کورت و خێرا:

١- شاعیر لە هۆنراوەیەکیدا کە لەلاپەڕە «١٣»ی دیوانەکەیدا بڵاوکراوەتەوە(٨) لە ڕێگەی هونەری لێکچوواندنەوە دوو وێنەی شیعریی جوانی بۆ خوڵقاندووین، هەروەک لە دێڕی یەکەمی دەڵێ:

ئەرێ دڵ بێ شەرابی لەعلی ڕەنگت لە گوڵ چبکا؟
کە جیلوەی گوڵ لە گوڵشەندا نەبێ بولبول لە چڵ چبکا؟
ل: ١٣

مەحوی شاعیری وردەکار لە نیوە دێڕی یەکەمی شیعرەکەیدا دڵی بەهەنگ چوواندووە و ڕووی یاریشی بەگوڵ و، ماچی لێوی ئەو یارە شۆخەیشی بەمژینی شیلەی گوڵ، بەگوڵ چوواندووە و[9]، بەهۆنەری لێکچوواندنەوە وێنەیەکی شیعری ناسکی خوڵقاندووە و، لە نیوە دێڕی دووەمیشیدا دڵی خۆی بەبولبول چوواندووە و باڵای یارە خۆشەویستەکەیشی بەچڵی داری گوڵ و ڕووی ئەو یارەی بەگوڵ داناوە و لەمەش وێنەیەکی جوان و گەشی پێکەوە ناوە و، هەردوو وێنەکەیشی لە جۆری چەسپاون و بەهەستی بینین وەردەگیرێن.

٢- شاعیر لە دێڕێکی دیکەی هەمان هۆنراوەیدا، لە ڕێگەی لێکچوواندن و وەسفەوە وێنەیەکی جوان و گەش و ڕازاوەی بۆ داڕشتووین و دەڵێ:

چ حاجەت نەرگسی مەستت بکەم وەصفی بەمەخمووری
کە چاوێ سورمەکێشراوی خودایی بێ لە کل چبکا؟!
ل:١٥

مەحوی هونەرمەندانە چاوی یاری نازداری بەنێرگز چوواندووە و وەسفێکی هونەریی وای دەکات کە ئەو چاوە نەرگزییە خۆی مەستە و پێی ناوێ پێی بڵێین سەرخۆشە و کاتێک کە ئەو چاوە ڕەشەی ئەو شۆخە لە خواوە کلدراو بێ پێی ناوێ کلی دەسکردی تێ بکرێ و بەم جۆرە ئەو وێنە شیعرییەمان بۆ دەخوڵقێنێ و وێنەکەش لە جۆری چەسپاوە و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

٣- شاعیر لە دێڕێکی هەر ئەو هۆنراوەیەیدا، لە ڕێگەی پێکەوەنانی هونەری (خواستن) وێنەیەکی جوانی شیعریمان لەباری بێ ئاگایی بۆ دەخوڵقێنێ و دەڵێ:

له هەر جێیە هەڵێ خورشیدی عیشقی گوڵ ڕوخان «مەحوی»
ئەگەر عەقڵی ببێ لەو جێگە ئاونگی عەقڵ چبکا ؟!
ل: ١٦

له نیوه دێڕی یەکەمی شیعرەکەیدا شاعیری هونەرمەندمان عیشق بەڕۆژ دەچوێنێ و عەقڵیش له نیوه دێڕی دووەمیدا بەشەونمی سەردەمی شەو دەچوێنێ کە لەسەر ڕووی گیا و گوڵ دەنیشێ. ئنجا له هەڵاتنی ڕۆژی عیشقی کچی جوانی ڕوومەت وەک گوڵ، هونەری خواستن پێکەوەدەنێ و، مامڵەت کردن لەگەڵ ئاونگدا وەک کەسێکی ئاقڵ ئەمەشیان هونەری خواستنێکی دیکەیە، لەمانە تابلۆیەکی هونەری چەند وێنەییمان بۆ دەخولقێنێ و هەمووشیان وێنەی چەسپاون و بەهەستی بینین وەردەگیرێن.

٤- شاعیر له هۆنراوەیەکی دیکەیدا دیسان له ڕێگەی پێکەوەنانی هونەری (خواستن)ەوە، وێنەیەکی شیعریمان بۆ دەخولقێنێ و له دێڕێکیدا ئەمەی کردووە و دەڵێ:

غونچە دەمی له باسی تۆوە دەدا، سەبا
مشتێکی دا له دەمی، دەم قسەی زلی شکا ؟!
ل:٢١

مەحوی کە دەڵێ: «غونچە دەمی له باسی تۆوە دەدا» لەم دەربڕینە ناسکە ڕوونبێژییەیدا، هونەری (خواستن)ی پێکەوەناوە و چووە غونچەی وەک کەسێکی ئاقڵ و هوشیار داناوە و له باسی یارە شۆخەکەیەوە دەدوێ و له هەنگاوێکی دیکەیدا کە دەڵێ: «سەبا مشتێکی دا له دەمی» دیسان هونەری (خواستن)ی پێکەوە ناوە، بەوەی کە باسی بای سەبا وەک کەسی ئاقڵ دەکات و مشتێک له دەمی غونچە دەدا دەیپێشکوێنێ. له هەنگاوی سێیەمیشی کە دەڵێ:«دەم قسەی زلی شکا» دیسان وەک کەسی ئاقڵ مامڵەتی لەگەڵ (دەم)دا کردووە و قسە زلەکانی پێ شکاندووە و لەم سێ هونەرەی خواستندا سێ وێنەی شیعری یەک لەدوای یەکی بۆ خۆڵقاندووین و بەهەر سێکیان تابلۆیەکی هونەریی پێکەوەناوە و بەهەستەکانی بینین و بیستن وەردەگیرێن و له جۆری وێنەی چەسپاون.

٥- له هۆنراوەیەکی دیکەیدا، له ڕێگەی لێکچوواندنی جوان و ناسکەوە وێنەیەکی گەش و گۆڵی شیعری ناسکمان بۆ دەکێشێ و له دێڕە شیعرەکەیدا دەڵێ:

وەک بولبول ئەو دڵە بەگوڵی ڕوو کە ڕوو دەکا
پەروانەیە زیارەتی شەمع ئارەزوو دەکا!!
ل:٢٥

شاعیر دڵ بەبولبول دەچوێنێ کە ڕوودەکاتە گوڵ و لەهەنگاوی دووەمی داڕشتنی دێڕە

شیعرەکەیشیدا، دڵ بەو پەروانەیە دەچوێنێ کە ڕوو دەکاتە گڕی ڕووناکی مۆم و بەمەش وێنەیەکی گەش و گۆڵی شیعریمان بۆ دەکێشێ و بەجوانترین شێوە پێشکەشمان دەکات و جۆری وێنەکەیشی جووڵاوە، چونکە گۆڕانکاریی دیمەنی تێدایە و فرمانی ڕستەکانی ڕانەبوردوون و بەهەستی بینین وەردەگیرێن.

٦- لە هۆنراوەیەکی دیکەیدا و لە دێڕە شیعرێکی جوان و ناسکی، لە ڕێگەی پێکەوەنانی هونەری (خواستن) و (لێکچوواندن)ەوە. وێنەیەکی شیعریمان بۆ دەخوڵقێنێ و بابزانین چۆن دروستی کردووە و لە چ جۆرێکدا خۆی دەنوێنێ؟

کە دڵ دەتوێتەوە بۆ تۆ، دەکەی ئەو ڕۆژە تۆ بڕوا

کە خۆ دەرخەی وەکو خۆر، دڵ وەکو شەونم لەخۆ بڕوا

ل:٣٥

شاعیر مەبەستی ئەوەیە بەیارە شۆخەکەی بڵێ: «ئەو ڕۆژەی کە دڵم دەتوێتەوە بۆ تۆ، باوەڕ دەکەی کەوا هەر کاتێ تۆ ڕووی وەک ڕۆژ جوانت دەرخست دڵم وەک شەونم کە لەبەر گەرمایی خۆردا خۆی ڕاناگرێ و، لەخۆیەوە دەڕوا و لەناو دەچێ»[١٠]، لە توانەوەی دڵ، هونەری (خواستن)ی دروستکردووە و لەخۆ دەرخستنی یارەکەیشی وەک ڕۆژی ڕووناک و لێکچواندنی دڵ بە شەونم کە بەرامبەر بەڕۆژە لەناو دەچێ، وێنەیەکی جوانی شیعریی بۆ خوڵقاندووین و وێنەکەش لە جۆری جووڵاوە و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

٧- لە لاپەڕە «٥٩»ی دیوانەکەیدا و لە دێڕە شیعرێکی بەبیری فەلسەفی ئاودراو، لە ڕێگەی هونەری لێکچوواندن و (خواستن)ەوە وێنەیەکی گەش و گۆڵی شیعریی بۆ خوڵقاندووین و دەڵێ:

عەنبەری سارا وتم زوڵفی، نەباتی میصری لێو

زوڵفی ئاڵۆزا، وتی لێوی کە ناوی من نەبات!!

ل: ٥٩

شاعیر بەهەستی ناسکی و پێکەوەنانی هونەری لێکچوواندنی بۆنی زوڵفی یاری شۆخ و شەنگ بەبۆنی خۆشی عەنبەر و لێویشی بەشەکری (نەبات)ی وڵاتی میسر و، لە بەدەنگهاتنی ئەو لێوەی بەوەی کە ناوی نەهێنی، هونەری خواستنی پێکەوە ناوە و لە دروستکردنی ئەو هونەرانە لەناو دێڕە شیعرەکەیدا جوانترین وێنەی چەسپاوی پێکەوەناوە و بەهەستەکانی بۆنکردن و چەشتنەوە وەرەگیرێ و لە نێوان هەردوو وشەی (نەبات)یش ڕەگەزدۆزی تەواوی پێکەوەناوە و کارێکی هونەریی سەرکەوتووی خوڵقاندووە.

٨- لە دێڕە شیعرێکی نێو هۆنراوەیەکی دیکەیدا، لە ڕێگەی پێکەوەنانی هونەری (خواستن) و (لێکچوواندن)ەوە، وێنەیەکی گەش و گۆڵی شیعریی بۆ کێشاوین و دەڵێ:

خەرامی ناز ئەگەر هێنایە لەنجە سەروی مەوزوونت،
وەکو لەیلا لەسەر ڕێ پرسشێ کە حاڵی مەجنوونت!!
ل:٧٤

خەرام کردەوەیەکە کە لە ڕووی نازەوە بکرێ و کینایەیە لە ڕۆیشتنی بەناز و، لە پێکەوە هونەری خواستن لە دەربڕینی (هێنانە لەنجەی سەروو) و لە لێکچوواندنی ئەو یارە جوانە بە(لەیلا)ی خۆشەویستی (مەجنوون)، وێنەیەکی شیعری جولاوی بۆ خولقاندووین، چونکە لەنجەی سەروو جووڵە و گۆڕانی باری دیمەنەکەی تێدایە و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

٩- لە دێڕە شیعرێکی دیکەی هەمان هۆنراوەیدا، لە ڕێگەی خواستن و وەسفەوە وێنەیەکی دیکەمان بۆ دەکێشێ و دەڵێ:

دەترسم گەردی خوێنی من لە شیشەی گەردنت نیشێ
وەگەرنا، غەم نییە بمرم لە حەسرەت لێوی مەیگوونت!
ل:٧٤

شاعیر لە نیشتنی گەردی خوێنی خۆی لە شووشەی گەردەنی یارە شۆخەکەی هونەری (خواستن)ی پێکەوە ناوە و لە وەسفی لێوە سوورەکانی ئەو یارەیشی بەڕەنگی (شەراب) وێنەیەکی جوولاوی شیعریمان بۆ دەکێشێ و بەهەستی بینین وەردەگیرێ و تێکەڵ بەهەست و سۆز و ئەندێشەی گوێگر و خوێنەری شیعرەکە دەبێ.

١٠- لە دێڕە شیعرێکی هۆنراوەیەکیدا لە ڕێگەی لێکچوواندن و وەسفکردنێکی جوان و ناسکی خەت و خاڵی ئافرەتی شۆخەوە، وێنەیەکی گەش و گۆڵی شیعریمان بۆ دەکێشێ و دەڵێ:

دەمت چی؟ پڕ لە دوڕ، دورجێکی یاقووت!
نیشانەی مۆری چی؟ خەططێکی زمڕووت!!
ل:٨٠

شاعیر لە لێکچوواندنی دەمی یار بە دورج (واتە سندوقی بچکۆڵەی خشڵی ئافرەت) کە ڕەنگی یاقووتی بێ و پڕ بێ لە دوڕ و مرواری کە ددانەکانییەتی و، گەندەمووی لێوی ئەو نازدارەش بووەتە خەتێکی جوان و بەهاداری وەک گەوهەری زمرووت. بەمانەش وێنەیەکی جوانی شیعریی بۆ دارشتووین و لە جۆری چەسپاوە و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

١١- شاعیر لە دێڕێکی دیکەی هەمان هۆنراوەیدا لە ڕێگەی لێکچوواندنەوە، وێنەیەکی گەشی دیکەی بۆ خولقاندووین و دەڵێ:

بەگریانم وەکو گوڵ پێکەنی یار،
لە باغی من بەبارش غونچە پشکووت!
ل:٨٠

بەلێکچوواندنی پێکەنینی یار بەو گوڵەی کە بەباران دەپشکوێ و لێکچوواندنی گریانی مرۆڤ بەرێژنەی باران، وێنەیەکی جوانی شیعریمان بۆ پێکەوە دەنێ و وێنەکەیشی لە جۆری چەسپاوە و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

١٢- لە دێرە شیعرێکی هۆنراوەیەکی دیکەیدا، شاعیر لە رێگەی لێکچوواندن و (خواستن)ەوە، وێنەیەکی جوانی شیعریمان بۆ دەخوڵقێنێ و با بزانین چی گوتووە:

بەجیلوەی ئەو، وەکو شەونم، فری هەر عەقڵ و هۆشی بوو
کە سێبەر مەحوە لەو جێیە، هەتاوی لەحظەیەک لێکەوت
ل:٨٦

بەلێکچوواندنی یار بەرۆژ و ئەقڵ و هۆشیش لە ئاست بوونی ئەودا وەک شەونم و سێبەر وایە و لەبەر گەرمی و رووناکی رۆژدا وەک ئەوەی هەر رۆژ هەڵبێ شەونم دەبێ بەهەڵم و نامێنێ و، دەچێتە ئاسمان و سێبەریش نامێنێ و هەر کەسێکی ئەقڵی هەبێ ئەوا ئەو ئەقڵ و هۆشەی لا نامێنێ و[11]، لەو لێکچوواندن و (خواستن)ەدا وێنەیەکی جوولاومان بۆ دەخولقێنێ، چونکە گۆڕانکاریی لەباری دیمەنەکاندا هەیە و شەونم و سێبەر بەتیشکی رۆژ نامێنن و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

١٣- شاعیر لە دێڕێکی هۆنراوەیەکی دیکەیدا لە رێگەی پێکەوەنانی هونەری (خواستن)ەوە وێنەیەکی شیعریی بۆ خولقاندووین و دەڵێ:

کەی دڵ دەسێنرێ لە بتێ سەندبێتی ئەو
لێوی لە میصر و زوڵفی لە چینی خەراج و باج!
ل:٩٣

شاعیر لەم دێرە شیعرەیدا دەڵێ: «ناتوانرێ دڵ لە ئافرەتێکی شۆخی وەک بت بسەنرێ کە لێوی شیرینی باج لە میسر وەرگرێ کە جێگەی شەکری نەباتە و زوڵفە بۆن خۆشەکەیشی خەراج لە چین وەرگرێ کە سەرچاوەی بۆنی میسکە و، لە جۆرە مامزێکی ئەو وڵاتە وەردەگیرێ. لێرەدا کە مەحوی لێوی ئەو شۆخە وەک کەسێکی ئاقڵ و بەدەسەڵات دادەنێ و باج و خەراج لە وڵاتی میسر و زوڵفەکەیشی ئەو باجە لە وڵاتی چین بستێنێ. بەمەش هونەری (خواستن)ی رەوانبێژی پێکەوەناوە و لەو رێگەیەشەوە وێنەیەکی گەش و گۆڵی چەسپاوی شیعریی بۆ خولقاندووین و بەهەستەکانی چێژ و بۆن کردن وەردەگیرێ، چونکە شەکری نەباتی میسر بەچێژە هەست و میسکی وڵاتی چینیش بەهەستی بۆنکردن وەردەگیرێ.

١٤- لە دێرە شیعرێکی هۆنراوەیەکی دیکەیدا، لە رێگەی پێکەوەنانی هونەری (خواستن)ەوە وێنەیەکی چەند دیمەنی ناسکی بۆ دارشتووین و دەڵێ:

سـیـاپۆشن لە داخی خـەطط و خـاڵ و لێـو و ڕوو و زوڵفت
وەنەوشـە و مـیـسکی چین و ئاوی خـضـر و لالەو و عـەنبـەر!!
ل:١٣١

مەحوی شاعیری مامۆستای هونەری وردەکاری ڕەوانبێژیی، لە کاتێکدا کە کردەوەی کەسی ئاقڵ دەداتە پاڵ وەنەوشە و میسکی چین و ئاوی ژیان و گوڵاڵە و عەنبەر، بەوەی کە لە داخی خەت و خاڵ و لێو و ڕوو و زوڵفی یارە شۆخەکەی ڕەش پۆش و غەمبارن، زنجیرەیەک لە هونەری خواستن و لە هەمان کاتیشدا هونەری لەف و نەشرمان بۆ دروست دەکات و، لە ئەنجامی ئەم هونەرانەیشی زنجیرەیەک لە وێنەی شیعریی چەسپاومان بۆ دەخوڵقێنێ و تابلۆیەکی هونەرییان لێ دروست دەکات و پێشکەش بەهونەر دۆست و شیعرناسانی کوردی دەکات.

١٥- لە دێرە شیعرێکی هۆنراوەیەکی دیکەیدا، لە ڕێگەی هونەری خواستنەوە وێنەیەکی جوان و ناسکی شیعری بۆ خوڵقاندووین و دەڵێ:

شـەو دەبێ بادەی لە دەسـتی سـاقـیـیـەک وەرگـرتبێ
ئەم سـبـەینێـیـە لە مـەشـریق دێتـەدەر مـەسـتـانە ڕۆژ
ل:١٣٨

شاعیر لەو کاتەی کە شەو دەکاتە کەسێکی (سەرخۆش و مەست)ی وا کە بادەی لە دەستی مەیگێڕێک وەرگرتبێ و سەرخۆش بووبێ، بۆیە ڕۆژ لە بەیانی دا وەک مەست و خومار لەو دیوی بەندەنی بەرزەوە هەڵدێ و بەمـەش هونەری (خـواستن)ی پێکەوە ناوە و لەو ڕێگەیەشـەوە وێنەیەکی جوانی شیعریمان بۆ پێکەوە دەنێ و، وێنەکەشی لە جۆری جووڵاوە و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

١٦- لە دێڕێکی هۆنراوەیەکی دیکەیدا، لە ڕێگەی وەسفێکی وردەوە وێنەیەکی شیعریی بۆ کێشاوین و دەڵێ:

لالغـاوەی واعـیـز ئەمـڕۆ، مـەوج ئەدا، دەم پڕ لە کـەف
ڕیشی قیرووسیا، کتێبی وەعظەکەی بوو بەر تەرەف!!
ل:١٧٤

شاعیر وەسفێکی ورد و وەستایانەی لا لغاوەی دەمی کابرایەکی ئامۆژگاریکەر دەکات کە لە کـاتی پەند و ئامـۆژگـاریی دادانی بۆ خەڵکەکە ئەوەندە بەهات و هاوار وەعـزەکـەی داداوە، لا لغـاوەی کـەوتووەتە شـەپۆلدان و دەمـیـشی پڕ لە کـەف بووە و تەنانەت ڕیش و کـتـێـبی ئامۆژگارییەکانیشی پیس و بێ خێر کردووە و بەمەش وێنەیەکی جووڵاوی شیعریی بۆ پێکەوە ناوین و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

١٧- لە دێرە شیعرێکی هۆنراوەیەکیدا، لە ڕێگەی لێکچوواندن و خواستنەوە وێنەیەکی تازە

و گەش و گۆڵی بۆ کێشاوین و دەڵێ:

دڵی سەنگە، دەباریێ گوڵ بەسەریا،
ئەوی گوڵ بوو، زەمانە دایە بەر سەنگ!

ل:٢٠٠

شاعیر لە ڕەوشتی زەمانەوە دەدوێ و، ئەوەمان بۆ دەردەخات کە دڵی ڕەقی وەک بەرد گوڵی بەسەر دادەبارێ و، کەچی ئەوەی کە دڵی وەکو گوڵ وایە زەمانە دەیداتە بەر بەرد و پەرێشانی دەکات و لەو (خواستە) کە بەردە باران کردنی گوڵە لەلایەن زەمانەوە وێنەیەکی جوولاوی شیعریمان بۆ دەکێشێ و بەهەستی بینین وەرگیرێ.

١٨- لە دێرێکی هۆنراوەیەکی دیکەیدا، لە ڕێگەی پێکەوەنانی هونەری خواستن و وەسف کردنەوە، وێنەیەکی شیعریمان بۆ دەخوڵقێنێ و دەڵێ:

شنەی بادی بەهاری هاتەوە، خۆشی لە تۆ بولبول،
بەشاییی هاتی گوڵ کۆکی کە سازی چەهچەهە و غولغول

ل:٢٠٤

شاعیر لەگەڵ هاتنەوەی کات و سەردەمی بای بەهاری مژدە دەداتە بولبولی شەیدای گوڵ و پێی دەڵێ: «دە سازی دە چریکە و ئاوازی ئاشقانەی خۆت» بەم وەسفە و بەپێکەوەنانی هونەری خواستن، بەمامەڵە کردن لەگەڵ بولبول وەک کەسی ئاقڵ تاکو مژدەی هاتنەوەی بای بەهاری پێ بدات. بەمانەش وێنەیەکی جوولاومان بۆ دەخوڵقێنێ تاکو بەهەستی بیستن وەری بگرین، بەتایبەتی لە ڕێگەی بیستنی دەنگ و ئاوازی بولبولەکەوە.

١٩- لە هەمان هۆنراوەدا و لە دێرە شیعرێکی دیکەیدا، بەوەسفکردن و لێکچوواندنەوە وێنەیەکی دیکەمان بەگەش و گۆڵی بۆ دەخوڵقێنی و دەڵێ:

چەمەن هەر سەرو و نەسرینە، لە طەرزی خوا بگەی شیرین
سەری کێوانە یەکسەر وەک کەناری کۆهکەن هەر گوڵ!!

ل: ٢٠٤

شاعیر باخی پڕ درەختی سەر و گوڵی (نەسرین)ی لە ڕازاوەییدا بەئارامگای (شیرین)ی داستانی چوواندووە و دیمەنی سەری چیاکانیشی بەکەناری ئارامگای فەرهادی کێو هەڵکەنی ئاشقی (شیرین)ی چوواندووە کە هەردووکیان بەگوڵ ڕازاوەتەوە و، وێنەیەکی گەش و گۆڵی چەسپاوی شیعری بۆ خوڵقاندووین و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

٢٠- مەحوی شاعیری شیعرپتەوی فەلسەفە ئامێز، لە دێرە شیعرێکی هۆنراوەیەکی دیکەیدا، لە ڕێگەی وەسف و خواستنەوە وێنەیەکی جوان و چەمک پتەوی بۆ خوڵقاندووین، هەروەک

دەڵێ:

لە ڕوو سـووری عـیـبـادەت لام و ڕوو زەردی خـەجـاڵەت مـام
بەناوی سـێـوی ناوم بـاخـەوان و، من بەهێ دەگـرم!!
ل: ٢١٨

لە وەسفەکانی (ڕوو سووری عیبادەت) و (ڕوو زەردی خەجاڵەت)دا و لە هونەری خواستن لە دەربڕینی (من بەهێ دەگرم)دا، وێنەیەکی جوان و چەمک بەهێزی پێکهێناوە و لە جۆری جووڵاوە و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

٢١- لە دێڕە شیعرێکی هۆنراوەیەکی دیکەیدا، شاعیر لە ڕێگەی لێکچوواندنەوە وێنەیەکی ناسکی شیعریی لە بەژن و باڵای یارە شۆخەکەی خولْقاندووە و دەڵێ:

شـمـشـادە ئەمـە، یا قـەدە، یا سـەروی ڕەوانە
یا عـەرعـەرە، یا نەخلی مـورادی دڵ و جـانە!
ل: ٢٨٠

شاعیری هونەرمەندمان لە لێکچوواندنی قەدی ئەو یارە شۆخەی بەشمشاد و سەرو، یا درەختی عەرعەر و دارخورمای هیوا و ئاواتی دڵ و گیانی، وێنەیەکی شیعری لە جۆری چەسپاومان بۆ دروست دەکات و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

٢٢- لە دێڕێکی دیکەی هەمـان هۆنراوەدا، دیسـان لە ڕێگەی لێکچوواندن و هونەری (خواستن)ەوە، وێنەیەکی ناسکی شیعریمان بۆ لەسەر ئەگریجەی یارە جوان و شۆخەکەی دەکێشێ و دەڵێ:

داخـۆ ئەمـە ئەگـریجـەیە پەخـشـاوە بەسـەردا
یا سـونبـولە کـردوویە سـەبا زوڵفی بەشـانە!
ل: ٢٨٠

شاعیر لە لێکچوواندنی ئەگریجە لە بۆن خۆشیدا بەسونبول و هونەری (خواستن) پێکەوەنان لە شانەکردنی زوڵفی سونبولی بەبای سەبا، وێنەیەکی چەسپاوی شیعریی خولْقاندووە و بەهەستی بۆنکردن وەردەگیرێ.

٢٣- لە دێڕە شیعرێکی هۆنراوەیەکی دیکەیدا، لە ڕێگەی وەسفکردن و کینایەتەوە وێنەیەکی هونەریی شیعریی بۆ کێشاوین و دەڵێ:

لە ڕۆژی هەڵدرا ئەم کـۆڕنە خـەیمەی تان و پۆشـینە
لە سـایەیدا شـەرابی بەزمی عـوشـرەت گـریە جـۆشـینە
ل: ٢٨١

شاعیری هونەرمەندی لێهاتوومان، لە ڕێگەی هونەری (کینایە)ی ڕەوانبێژی (خەمەی تان و پۆشین) کە مەبەستی لە ئاسمانە و لە ڕێگەی وەسفی ئەو خیوەتە، وێنە شیعرییەکەی دادەڕێژێ و لە جۆری وێنەی چەسپاوە و بەهەستی بینین وەردەگیرێ.

٢٤- لە دێڕە شیعرێکی هەمان هۆنراوەیدا، شاعیر لە ڕێگەی پێکەوەنانی هونەری خواستن، وێنەیەکی یەکجار نایابمان بۆ دەکێشێ و لەو شا بەیتەیدا دەڵێ:

لەکێ پرسم دڵی بۆ پڕ لە خوێنی حەسرەتە یاقووت
عەزاپۆشی چییە و کێیە، جلی پیرۆزە بۆ شینە؟!
ل: ٢٨٢

مەحوی بەبۆچوونێکی فەلسەفییانە لە دیاردەی زۆربوونی خەم و خەفەتی زەمانەوە دەدوێ و ئەوەمان پێ دەڵێ کە ئەو خەم و مەینەتییە وە نەبێ هەر تایبەت بێ بۆ ئادەمیزاد، بەڵکو دنیای شتی بێ گیانیشی گرتۆتەوە و نموونە بەگەوهەری (یاقووت)ی سوور دێنێتەوە و هۆی ئەو سووربیەتی خوێنی خەم و خەفەتی ناو دڵیەتی. هەروەکو گەوهەری پیرۆزەش کە ڕەنگی شینە و، ئەمە ڕەنگی بەرگی تازیەداریتی. بەڵام بۆی ساغ نەبۆتەوە ئایا ئەو پرسە و تازییەی بۆچی و بۆکێ داناوە؟

کاتێک کە مامڵەت لەگەڵ گەوهەری بێ گیانی وەک (یاقووت) و(پیرۆزە) وەک کەسی ئاقڵ دەکات، پتەوترین هونەری (خواستن)ی ڕەوانبێژی بۆ هەر یەک لەوانە پێکەوە دەنێ و دوو وێنەی شیعری جوان و چەمک پتەو و قووڵی بەبیری فەلسەفی ئاودراومان بۆ دەخوڵقێنێ و هەردووکیشیان لە جۆری چەسپاون و بەهەستی بینین وەردەگیرێن.

٢٥- لە دێڕە شیعرێکی هۆنراوەیەکی دیکەیدا، لە ڕێگەی پێکەوەنانی هونەری کینایە و دارشتنێکی هونەریی پتەوەوە، وێنەیەکی پڕ هەست و سۆزی شاعیرێکی ئەندێشە قووڵمان بۆ دەخوڵقێنێ و دەڵێ:

کە بێ لێوی لەسەر لێوم بنێ، ڕوحم لەسەر لێوە
کە لێوی لابەرێ، ئەلبەتتە ڕۆحم دەردەچێ پێوە!!
ل: ٢٩٠

شاعیر لەپێکەوەنانی هونەری کینایە لە دەربڕینی (ڕۆحم لەسەر لێوە) کە مەبەستی باری گیانە لای مرۆڤە لە کاتی مردندا، وێنەیەکی جووڵاومان بۆ دەکێشێ و بەهەستی بینین و هەستی جەستەیی وەردەگیرێ، چونکە ماچ کردن و لێو لەسەر لێو دانانی تێدایە و جووڵە و گۆڕانکارییان بەسەردا دێ.

## سەرەنجامی باسەکە

لەم کورتە لێکۆڵینەوەیەدا، ئەوەمان دەرخست کە وێنەی شیعریی وێنەیەکی ڕوونبێژییە و لەباری بێ ئاگایی شاعیر لە هۆنراوەکانیدا دەخوڵقێ، جا شاعیری کۆن بێ یا نوێ و هاوچەرخ و بەهێزی و بێ هێزیی ئەو وێنانەش بەندە بە شاعیرییەتی ئەو هۆزانڤانەی پێکەوەی دەنێ و، لە قالبێکی جوان و شیاودا پێشکەش بەخوێنەر و گوێگریان دەکات. ئەو وێنانەش لە ڕێگەی وەسفکردن و لێکچوواندن و خوازە (المجاز) و خواستن (الاستعارە) و کینایەوە لەناو پێچ و لۆچی شیعری شاعیراندا دەخوڵقێ و هێز و جوانی و گەش و گۆڵیەکی دڵگیر بەبەرهەمەکانیان دەبەخشێ.

بەپێی ئەو کەرەسە و چەمکانەی وێنەکانی پێک دێنن، هەر یەکەیان بەهەستێک یان چەند هەستێکی ئادەمیزاد وەردەگیرێن، ئەگەر وێنەکە لە ڕەنگ و دیمەن و دیاردە سروشتییەکانەوە دوا، ئەوا بەهەستی بینین وەردەگیرێن و، ئەگەر لە دەنگ و دوو و ئاوازیشەوە دوا ئەوا بەهەستی بیستن و گەر لە بۆن و بەرامەشەوە دوا ئەوا بەهەستی بۆن کرن دەرکی پێ دەکرێ و، خۆ ئەگەر لە تام و چێژی وەک تاڵی و شیرینی و تیژی و ترشی و تفتییەوە دوا ئەوا بەهەستی چەشتن و ئەگەر لە نەرم و نۆڵی و ڕەق و سەختی و تورت و تۆلییەوەش دوا ئەوا بەهەستی جەستەیی و دەست لێدانەوە وەردەگیرێ.

وێنەی شیعریی هەرچەندە پتر لە شیعری وەسفی سروشت و جوانی ئافرەتدا دروست دەبێ چونکە پڕن لە هونەرەکانی ڕەوانبێژیی وەک لێکچوواندن و خوازە و خواستن و وەسف و کینایە و لەناو شیعری فەلسەفە ئامێزی بەبیری تەصەووفی ئیسلامی ئاودراو کەمتر دروست دەبێ و، مەحوی شاعیری لووتکەی شیعری تەصەووفی ئیسلامی، بۆیە هەڵێنجانی وێنەی شیعری لەناو پێچ و لۆچی چەمکی شیعرەکانی ئەوەندە زۆر و ئاسان نییە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەشاعیرییەتی بەهێزی و زاڵ بوونی بەسەر هونەری شیعر و بەکارهێنانێکی وەستایانەی خوازە و خواستن لە هۆنراوەکانیدا توانیویەتی وێنەی شیعریی جوان و نایابمان لەو جۆرە شیعرانەیدا بۆ بخوڵقێنێ و بەسەر هەموو گیروگرفتێکی هاتبێتە ڕێی ئەو کارە هونەرییەی زاڵ بووە و چەپکێک وێنەی جووڵاو و چەسپاوی شیعری لە جوانترین قاڵب و چوارچێوەی هونەرییدا بخوڵقێنێ و پێشکەش بەشیعرناس و ڕەخنەگرانی ئەدەبی کوردی بکات و بەچاکی لەو تاقیکردنەوە ئەدەبییانەیدا سەرکەوێ و گوێ هونەر لەو مەیدانەدا بباتەوە.

### سەرچاوە و پەراوێز


١- الدكتور محمد مندور: فن الشعر، القاهرة، ص:٥٢.

٢- الدكتور إحسان عباس: كتاب فن الشعر، بيروت ١٩٥٩، ص٤٦٤.

٣- سيسل دي لويس: الصورة الشعرية، ترجمة د. أحمد نصف الجنابي وآخرين، بغداد ١٩٨٢، ص٢٣.

٤- هەمان سەرچاوە، ل:٢١.

٥- هەمان سەرچاوە، ل:٢٦.

٦- هەمان سەرچاوە، ل:٢٣.

٧- دوکتۆر کامیل حەسەن بەسیر: زانستی ئاوەڵواتا، بەغدا ١٩٨١، ل:١٠٨.

٨- بڕوانە دیوانی مەحوی: لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس و محەمەدی مەلا کەریم، چاپی دووەم ١٩٨٤.

٩- بڕوانە هەمان سەرچاوە، پەراوێزی لاپەڕە (١٣).

١٠- هەمان سەرچاوە، پەراوێزی لاپەڕە (٣٥).

١١- هەمان سەرچاوە، پەراوێزی لاپەڕە (٩٣).

وتی مـیـوەی بەهەشـتـە شـیـعـری مـەحـوی
خـــــــــوا نـەبـڕی لـە بـاغـم داری بـەردار

# هەڵبەستەکانی مەحوی و
# لایەنە هونەرییەکانی هەڵبەست

**نووسینی: کامل ژیر**

من لەو باوەڕەدام کـە هەڵـبـەسـتـیش[١] بەشـێکە لە بەشـەکـانی هونەرە جـوانەکـان و هەستیاریش[٢] بەهرەوەرێکی هونەرمەندە.

هونەری هەڵبەست، گەلێ لایەن ئەگرێتە خۆی، وەک: ساز، ئاواز، داهێنان، وێنە، دارشتن، رەوانی، وردەکاری و هەندێ جاریش ئەندێشە[٣].

مرۆڤی هەستیاریش، کەسێکی بەهرەوەرە. ئەو بەهرەیەش، خەلاتێکی سروشتییە. بێ بوونی ئەم بەهرە زگماکیە، کەسێک بەهەوڵدان و بەمەشق و فێرکردن نابێتە هەستیار.

گرنگترین لایەنی هونەری لە هەڵبەستدا، لایەنی سازە. لە سازەوە ئاوازی جۆربەجۆر پەیدا ئەبێ. عـەرەب ئاوازە سـەرەکـیـەکانی هەڵبەستی لە شازدە جۆردا کـۆکـردۆتەوە و هەر یەکـەیانی بەدەریایەک ناوزەدە کردووە. هەستیارانی کوردیش پەیرەوی هەندێک لەو ئاوازانەیان کردووە کە لەگەڵ سروشتی زمانی کوردی و زەوقی مرۆڤی کوردا ئەگونجێ. لەوانە هەستیاری پایە بەرزمان مەحوی.

ڕاستە هەڵبەستی وا هەیە ساز (مۆسیقا)ی تێدا نییە. بەهەڵبەستیش ناو ئەبرێن. ڕاستییەکەی، ئەوانە ئەگەرچی بەجەستە لە هەڵبەست ئەچن، بەڵام جەستەیەکی بێ گیانن.

ساز لە هەڵبەستدا، بریتییە لە کێش و سەروا لە پلەی یەکەمدا. لەم بارەیەوە هەستیاری گەورەی ئینگلیز (کۆلرج ١٧٧١-١٨٣٤) یەکەم مەرجێک کە دای ئەنێ بۆ بلیمەتیی ئەو کەسەی بەهەستیارێتی لە دایک ئەبێ: هەستکردن بەخۆشیی ساز (مۆسیقا)ی هەڵبەستەکەیەتی[٤]. بەپێی ڕایەکی تر: سازی هەڵبەست بریتییە لە کێش و ڕێکخستنی دەنگەکان و سازی هەڵبەست ئەبێتە هۆی فراوانکردنی واتاکەی[٥] هەروەها ڕەخنەسازان گەیشتوونەتە ئەوەی کە ئاواز و ساز دەورێکی گەورە و کاریگەر ئەگێڕن بۆ فراوانبوونی واتای هەڵبەست[٦] ئێوە سەرنجی ساز و ئاوازی ئەم هەڵبەستەی مەحوی بدەن:

لە ناکەس کـاریا خـاکم بەسـەر ڕۆیی بە با عـومـرم[٧]
خـــودا تۆ بمژیێنە تا لەبەر قـــاپیی کـــەسێ دەمـــرم

بەضایع چوو لە (مالا يَعنْي)یا وەقتم هەموو، یەعنی
دەبێ وەقتێ لە (بو الوَقت)یْ بخوازم تا تیا بمرم
ئەجەل دەورم دەدا حاضربە، وادەی دەور و تەسلیمە
منی غەفڵەت زەدە هێشتا خەریکی مەسئەلەی دەورم
خەیاڵی پووچی دنیا وا دەماغ و دڵمی پێچاوە
قیامەت، هەر مەگەر ڕۆژی قیامەت بێتەوە فکرم
لەپێ کەوتووم و نەفسم بۆ هەوا دەشنێ وەکو منداڵ
لەبەر پیری سەرم خۆی ناگرێت و، تازە پێ دەگرم
چییە سووچ و گوناهی؟ بۆچی دەیکاتە جەزاخانە؟
لە قەبر هەڵکەن، هەتا ڕۆژی جەزا دەعوا چییە قەبرم
سبەینێ (يُحشَرُ المَرءُ)ە برا گەل، فرسەتە ئەمڕۆ
تەبەرابن لەمن، با کەس نەبێ حەشری لەگەڵ حەشرم
لەمن نازانم ئیتر نەفسی بەدخوو چیی دەوێ «مەحوی»
کە بەد کردار و بەد ڕەفتار و بەد ئەفکار و بەد طەورم
مەگەر بەر مەوجی بەحری ڕەحمەتم خا وەصفی سەتتاری
وەگەرنا، زەحمەتە پابوو نەوەم، نامومکینە سەترم

لەم هەڵبەستەدا، ئەبینین مەحوی کێشی هەزەجی بەکارهێناوە کە بریتییە لە بەکارهێنانی چوار جار مفاعیلن و پێی ئەوترێ هەزەجی هەشتی بێ خەوش.

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعلین. واتا یەک برگەی کورت و سێ برگەی درێژ.

ب --- ب --- ب --- ب---

بەمەش هەموو هەڵبەستەکە، یەک ساز و ئاوازی هەیە، بێجگە لە تاکە دێڕی:

(لە من نازانم ئیتر نەفسی بەدخوو چیی دەوێ مەحوی)

کە لەم تاکە دێڕەدا جۆرە لەنگییەک هەست پێ ئەکرێ. ئەویش لە پارچەی دووەمدا کە ئەڵێ: (نم ئیتر نەف). بەوەش ئاوازەکە ئەگۆڕێت و ئاوازی ئەو پارچەیە ئەبێتە: (فاعلاتن) لە جیاتی: (مفاعلین) واتا: (-ب --) لە جیاتی: (ب ---): (برگەی یەکەم درێژ، برگەی دووەم کورت). ئەمەش بابەتێکە کە بەعەرەبی پێی ئەوترێ (زەحاف و عیلەل) و دوایی گەڕانەوەمان ئەبێ بۆ سەر ئەم بابەتە.

لە هەڵبەستێکی تر داو بەکەمێک گۆڕانەوە لە سازەکەیدا و لە ئاستێکی بەرزی هونەری دا مەحوی ئەڵێ:

بەپیـــــر ئەو مــــاهەوە چووم و بەســــەرچووم
پەری بوو، ئەو نەبوو، شەو بوو بەسەرچووم[٨]
تەڵێ نێـــرگـــــسم و باغی حـــیـــرەتم پێ-
بەفــەڕ هات و وەکـــو گـــوڵ زوو بەســــەرچووم
گلەی پێـــشم لەســـەر ســـەرە هەم بووە بار
کـــەدیی من دولبـــەرم هات و بەســـەرچووم
دەزانم بادیە، عـــیـــشـــقـــە خـــەطەرناک
کـەچی هەرچووم، ئەگـەر مـام و ئەگـەر چووم
لە حـــینی نەزعی رۆحـــا، رۆحی عـــاشق
وتی: ئۆخـــەی لە مــیـــحنەتخـــانە دەرچووم
بەئۆغـــر کـــردنی من بوومـــە قـــەقنەس
کـە ئەو چوو بۆ سـەفـەر، من بۆ سـەقـەر چووم
وتی: قـــەت وا مـــەیە و من واوە هەر دێم
نەهات ئەو واقـــەت و، من واوە هەر چووم
شـــوکـــر مــــوورم بووە پامـــالی مـــیـــرێ
بەبێ نـامـی ژیـام و نـامـــــــــەوەر چووم
غـەمی قـاتیلمـە «مـەحـوی»! مـونفـەعـیل مـا
لە حـەشـــرا کـفنی خـوێناوی بەبەر چووم[٨]

مەحوی ئەم هەڵبەستەشی هەر لەسەر کێشی هەزەجە بەڵام هەزەجی شەشیی لێ قرتاو، واتا لە دوا هەنگاوی هەڵبەستەکاندا، برگەیەکی لێ قرتاندووە. کە ئەبێتە:

مفاعیلن مفاعلین فعولن

ب --- ب --- ب--

بەمەش ئاوازی هەڵبەستەکە گۆڕانێکی کەمی بەسەر دا دێت لە چاو هەڵبەستەکەی پێشوودا. یا ڕوونتر بلێین: تریە (ایقاع)ی هەڵبەستەکە لە هەنگاوی سێهەمدا ئەگۆڕرێت. سەرنج بدەن:

کەچی هەرچووم، ئەگەر مام و، ئەگەر چووم

ب --- ب --- ب --

هەنگاوی یەکەم و دووەم، هەریەکەیان چوار برگـەیە. بەڵام هەنگاوی سێـهـەم بۆتە سێ برگـە. لەبەر ئەوە هەم ئاوازەکەی ئەگۆڕێ، هەم کاتێکی کەمتریشی ئەوێ.

مەحوی وەک هونەرمەندێکی سازژەن «مۆسیقار» ، ئالۆگۆڕ بەئاوازی هەڵبەستەکانی ئەکات. لە کێشی هەزەجەوە، ئەچێ بۆ کێشی ڕەمەڵ و ئەڵێ:

دڵ لەسەرخۆ چوونی پەی دەر پەی دەلیلی یارە هات(٩)
عەقڵ و هۆش ئەی دڵ بکە حاضر، لەپێشە کارە هات
تۆ کە دەرکەوتی مەپرسە چی بەسەردێ جان و دڵ
حاڵەتی شەونم تەماشاکە بەوەقتی ڕۆژهەڵات
گەر لەتۆ دنیا بەری بوو، قەوم و خۆشیت لێ بەرین
گەر بەراتی بوو، هەمو عالەم بووە باب و برات
(ألحذَرْ) لەم چەرخی کە چبازە، بەڕوو چەرخاندنێک
چەندە سوڵطان و شەهی کرد و دەکا بێ دەست و مات
شێخ و طوڕڕەی مێزەر و نەقل و نوقوولی هیچ و پووچ
من بەتوڕەی بار ئەسیرم، ئەو بەکۆڵی توڕرە هات

هەنگاوەکانی ئەم هەڵبەستە بریتییە لە چوار هەنگاو. دەنگەکانی هەنگاوی یەکەم و دووەم و سێهەم هەریەکە و بریتییە لە چوار بڕگە. بڕگەی یەکەم درێژ. بڕگەی دووەم کورت، دوو بڕگەکەی تر درێژ. بەڵام هەنگاوی چوارەم تەنیا سێ بڕگەیە. یەکەم درێژ، دووەم کورت، سێهەم درێژ. بەپێی کێشی عەرووز، ئەبێتە:

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلُ

– ب –– – ب –– – ب –– – ب – وە پێی ئەوترێ: ڕەمەڵی هەشتیی قرتاو (محذوف) چونکە هەنگاوی چوارەم بڕگەیەکی لێ قرتاوە.

دوای ئەوە هەستیاری هونەرمەند، ئەچێ بۆ ئاوازێکی تر:

چیبکەم نە ئەو کەسەم کە کەسم بێ لەلا بەکەس(١٠)
خۆشم نەگەیە ئەو کەسە ئەو من بکا بەکەس

–– ب – ب – ب ب – – ب – ب –

مستفعلن مفاعیل مستفعلن فع

مەحوی جارێکی تر ئەگەڕێتەوە سەر کێشی هەزەجی هەشتیی بێ خەوش و ئەڵێ:

دیارم دەیری عیشقە، جێ بەسووتن بێ لەوێ دەگرم(١١)
کەمن مشتێ چل و چێوبم، بەچی بم، کەڵکی کێ دەگرم

نەگـەبیـە دامـەنی دەسـتی دوعـا ، جـا دەبمە خـاکی ڕێی
طەریقـەی گـۆشـەگـیـری بـەردەدەم، ئەمـجـارە ڕێ ئەگـرم
کـە دادی یەئسی خـۆمم بردە لا ، ئەم عـارفـە توند بوو
وتی ئاخـر سـەبینێ جـەژنە ، خـوێنی تۆ لـەپێ دەگـرم
لە ڕوو سووری عیبادەت لام و ڕوو زەردی خەجاڵەت مام
بەناوی سـێـوی ناوم باغـەوان و من بەهێ دەگـرم
لەسـەرخۆ چوونە ، شـەیدابوونە ، قـوڕ پێـوانە ، سـووتانە
هەتا مـردن، مـەحـبـەت ئیـشی زۆرە، ڕێزی لێ دەگـرم
چ شـۆخـە ئاگـرم تێ بەر ئەدات و پێم دەڵێ: یا شـێخ!
بەخاشاکی دەوت: شوعلە ، عەصامە دەستی پێ دەگرم
کـە سـینەی ڕێشـمی بەو تێـغی نازە ئەنجن کـرد
وتی: پـەژمـوردەیـە ئەم لالـەزارە ئاوی تێ دەگـرم
لە پاداشـتی قسـەی ساردا هەمە ئاه و هەناسـەی گەرم
کـەسێ شـێـتـانە بەردم تێگرێ، من بەرقی تێ دەگـرم
شـوکـر هوشـیـارە «مـەحـوی» تێـدەگـا دنیـا خـەراباتە
کـە بەدمـەسـتی بکا ئەهلی، خـراپەی بۆچی لێ دەگـرم

مـەحـوی لەو هەڵبـەسـتـەدا کـە بۆ سـوڵتـان عـەبولحـەمـیـدی وتووە، ئەگـەرچی ئەو هەڵبـەسـتـە مـشـتـومڕێکی زۆری لەسەرە و بەخاڵێکی ...... ئەژمێردرێ لەسەر مەحوی و من لە نووسینەکانی پێشوومدا وتبووم: بـەپێی پێوانە نەتەوەییەکە مەحوی ئەو هەڵبەستەی هەر نەبوایە باشتر بوو ، چونکە ڕاسـتـتـر وایە بۆ کوردێک ئەگـەر دەسـتـێکی نەبێ لە چەسـپـاندنی ڕەوادا ، لە هەر کات و جێگەیەکدا ، ئەوا هەر بێ دەنگ و بێ لایەن بێ باشترە[١٢]. بەڵام ئەم هەڵبەستە ، وەک (ئاواز) ئاوازێکی پڕ لە ئاهەنگی هەیە. هەڵبەستەکە لەسەر کێشی ڕەجەزە و ئەڵێ:

شەخصێکی ساحیب ئەحوال پرسیی کە ئەی فلاطوون[١٣]
یـۆنانـیـیـانی قـەومت بـۆچی بەدەردی سـەگ چوون؟
ئەو زوو فنوونە جـوابی دابوو: بە جـێـیـە وابێ:
خـۆی دایە بەر شـیـهـابی ثاقـیب کـە دێوی مـەلعـوون
باطیـل مـوقـابیلی حـەق وەسـتـا ، بەتاڵە ئیـشـی
گـەردی بەبادە خـاکی بێ هەڵپـژێ بەگـەردوون

بەپێی کێشانەی عەرووز ئەبێتە:

مستفعلن مفعولن مستفعلن فعولن

-- ب - --- -- ب - ب --

ئەم کێشە، بەپێوانەی کێشی پەنجەی کوردی، پێی ئەوترێ: کێشی حەوت بڕگەیی. حەوت بڕگەیی و دووجاری حەوت بڕگەیی. چونکە ژمارەی هەر نیوە دێڕێک حەوت بڕگەیە و دێڕەکە هەمووی ئەبێتە چواردە بڕگە.

لێرەدا شایانی باسە کە هەموو کێشەکانی عەرووز، بەکێشی پەنجەی کوردیش ئەپێورێ. بۆ نموونە: هەندێک لەو هەڵبەستانەی لەم وتارەدا هاتوون:

(لە ناکەس کاریا خاکم بەسەر ڕۆیی بەبا عومرم)

کێشی شازدە بڕگەییە، ئەشتوانین پێی بڵێین کێشی چوار بڕگەیی و چوار جارەی چوار بڕگەیی کە ئەکاتە شازدە بڕگە.

نموونەی کێشی حەوت بڕگەیی لە هەڵبەستی کوردیدا:

وەرە ئەی نازەنینم وەرە گیانی شیرینم[١٤]

نموونەی کێشی شازدە بڕگەییش:

ئەی چاو گەشەی تەلیسماوی بەنیگایەک چاوەکانت

ڕام ئەکێشێ بۆ جیهانی پڕ ئەندێشەی فراوانت[١٥]

هەروەها هەڵبەستی:

(بەپیر ئەو ماهەوە چووم و بەسەر چووم)[١٦]

بەکێشی پەنجەی کوردی ئەبێتە کێشی یازدە بڕگەیی. وەک:

ئەی قژ زەرد، ئەی بەژن و بالای کەلەگەت

بۆ کز ڕاوەستاوی بەرامبەری من

بۆ دەستت ناوەتە ژێر چەنەی خەفەت

لە ئاستی دیمەنی دەربەدەری من

لە هەڵبەستی گۆران[١٧] کە مامۆستا گۆران زۆر گرنگیی داوە بەم کێشە لەو هەڵبەستانەیدا کە لەسەر کێشی پەنجەی کوردی دایناون. وەک:

ئەی کۆترە سپییەکەی ناو هێلانەی بەرز[١٨]

لە گیانی پێکاسۆ ئیلهام ئەکەم قەرز

هەروەها هەڵبەستی:

ئەژدەهاک زیندانت قـــەڵا قــــەڵایە[19]
دیواری کـــــۆنکرێت، دەرگــــای پۆڵایە

یا وەک ئەڵێ:

ئەی نەتەوەی کاوەی زنجیر قەف قەف بڕ[20]
ڕۆژی نەورۆز، دای بەهەوری زســـتـــان دڕ
گـــــەرمی ژین و شـــــادیی هێنا بەدیاری
کــوردی خـــســتـــە جـــەژنی تازەی بەهاری

مەحوی لەو هەڵبەستەی دا کە لەسەر کێشی ڕەمەڵە، ئەڵێ:

دڵ لەســـەرخـــۆ چوونی پەی دەرپەی دەلیلی یارە هات
عـەقڵ و هۆشی ئەی دڵ بکە حازر لەپێشـە کارەهات

ئەمە بەتەرازووی کێشی پەنجەی کوردی، ئەبێتە پازدە برگەیی. وەک:
هەڵبەستەکەی کامەران: (مسی مەنوونە)[21]

وەک گـــوێم مـــسی مـــەنوونەی تێکرابێ
وەک دەروازەی هەســـتم خــــڕ داخــــرابێ
نـەهـاوار و نـەلالانـەوە و گــــــــــریان
نەئـەگـــــەیێت بەناخی دڵ و بەگـــــیـــان
وام ئـەزانی تـاســـــــــەر ژیـن ئـەبێ وابێ
دوور لە خــــەفـــەت هەر شـــادیم بۆ لوا بێ

مەحوی لە هەڵبەستەکەی تری دا کە ئەڵێ:

چیـــبکەم نە ئەو کـەســـەم کــە کـەسم بێ لەلا بەکـەس
خــۆشم نەگـــەیمە ئەو کـــەســـەی ئەو من بکا بەکــەس

ئەمەش بەکێشی چواردە برگەیی پەنجەی کوردی ئەکێشرێ. وەک ئەم هەڵبەستە:

وتم: ئەشێ پێت بڵــێم ســەرســامی زەردەی لێـوم[22]
وتی: نەتدیوە زەردە خــــــەواڵـووم و پەشـــــێـــوم
وتم: گـیـانە خـوات لەگـەڵ جـا بۆ ناڵێـیت ئەتکوژم؟
وتی: من پیـــاو ناکـــوژم، تەنیـــا خـــوێنی ئەمـــژم

بێینەوە سەر جیهانی مەحوی و بزانین ئەم هەستیارە چۆن چۆنی هەڵبەستی داناوە؟.
بەر لە وەڵام ئەو پرسیارە، ئەشێ جارێ پێناسەیەکی هەڵبەست بکەین، یۆنانییەکان پێناسەی

هەڵبەستیان بەم جۆرە کردووە: (هەڵبەست کەشتییەکە دوو ئەسپی خرۆخەپان ڕای ئەکێشن. ئەو دوو ئەسپە: ئەندێشە و هەستن. ئەو کەشتییە، کەسێکی زانا ئەیهاژوێ ناوی ژیریتی (عقل)ە کەشتییەکەش بەسەر هەوردا ئەکشێ[23] بەڵام عەرەب وتوویەتی: (هەڵبەست قسەیەکی کێش و سەرواداره) [24]. ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ کە عەرەب گرنگیی بەلایەنی ساز (مۆسیقا) داوە کە بریتییە لە کێش و سەروا. بەڵام یۆنان گرنگیی بەخەیاڵ و سۆز و ژیریتی داوە و لایەنی سازیان پشتگوێ خستووە. ڕاستییەکەی هیچ کامیان پێناسەیەکی تەواوی هەڵبەستیان نەکردووە چونکە هەردوو لایان ئەم تایبەتمەندیانەی هەڵبەستیان لەیاد کردووە لە پێناسەکانیاندا:

١- وێنە

٢- داهێنان

٣- هەڵبژاردنی وشەی گونجاو بۆ جێگەی گونجاو کە گوزارە لە سرووش (وحی)ەکە بکات.

٤- جوانکاری لە داڕشتن و ڕێکخستنی بیرۆکە و شێوازدا.

٥- ڕەوانی و گەلێ لایەنی تری هەڵبەست. لەوانەش هەمووی گرنگتر: کاریگەریتی هەڵبەستە بۆ سەر وەرگری هەڵبەست. واتا هەژاندنی وەرگری هەڵبەست.

بەو پێیە، بەلای منەوە، ئەشێ پێناسەی هەڵبەست بەم جۆرە بێ:

«هەڵبەست دەربڕینی بیرۆکەیەکی داهێنراوی ساز ئامێزی وێنەداری جوان داڕێژراوی ڕەوانی هەژێنەری بیر و هەست و سۆز و ئەندێشەی مرۆڤە».

بەمەش ئەتوانین هەڵبەست لە هۆنراوە جیا بکەینەوە. کە هۆنراوە (نظم) بریتییە لە وتارێکی کێش و سەروادار.

شایانی وتنە لێرەدا کە هۆنراوەش بایەخی خۆی هەیە، مەبەستم ئەوەیە کە هۆنراوە نابێتە خەوشێک بۆ کەسێک. بەڵکو ژمارەیەک لە هەستیاران، لەپاڵ هەڵبەستدا، هۆنراوەشیان هەیە. هەندێ جار هەڵبەست و هۆنراوەش تێکەڵ بەیەک ئەبن. بەگشتی هۆنراوەش وەستایەتی ئەوێت و وەستای خۆی هەیە و هەموو کەس ناتوانێ گوزارە لە شتێک بکات بەکێش و سەرواوە.

ئێستا بابزانین هۆنراوەکانی مەحوی تا چ ڕادەیەک ئەگونجێ لەگەڵ ئەو پێناسەیەدا کە دامانا بۆ هەڵبەست.

ئێمە لە سەرەتای ئەم وتارەدا، پێمان لەسەر (ساز) داگرت لە هەڵبەستەکانی مەحویدا. چونکە بەڕای من (ساز) گرنگترین کۆڵەکەیە بۆ هەڵبەست و بۆ هۆنراوەش. بێ بوونی ساز، نە هەڵبەست دێتە ئاراوە نە هۆنراوە. سازیش لە هەڵبەستدا بریتییە لە کێش و سەروا. کێش لە هەڵبەستدا ترازووە. بەهۆی ئەو ترازووەوە هەڵبەست لە لەنگی ڕزگاری ئەبێ. بێ بوونی کێش، ئاوازی هەڵبەست نا ساز دێتە گوێ و لە جیاتی هەژاندن و خۆشی، گرژبوون و بێزاریمان تیا دروست ئەکات. جۆرەکانی کێش لەناو هەستیارانی کوردا کێشی عەروز و کێشی پەنجەیە. مەحوی وەک

زۆربەی هەستیارە کلاسیکییەکان هەڵبەستەکانی لەسەر کێشی عەروز داناوە. ڕاستییەکەی کێشی عەروز، ساز و ئاوازێکی زیاتر و ڕێکوپێکتر و هونەری تری تیدایە وەک لە کێشی پەنجە. ئەو وردەکارییەی لە کێشی عەروزدا هەیە. لە کێشی پەنجەدا نییە.

بەپێی کێشی عەروز، نەک هەر ژمارەی بڕگەکانی هەر هەنگاوێک ئەبێ یەکسان بێ بەژمارەی بڕگەکانی هەمان هەنگاو لە سەرتاسەری هەڵبەستەکەدا، بەڵکو ئەبێ جۆری. بڕگەکانیش، واتا کورتی و درێژی بڕگەکانیش یەکسان بن بەیەک، بەوەش دارشتنی هەڵبەستەکە جوانتر و چاکتر و هونەریانەتر ئەبێ و ڕەوانتر و خۆشتریش دێتە گوێ. ڕاستە خۆبەستنەوەی بەکێشی عەروزەوە، بارێکی گرانترە لەسەر هەستیار. بەڵام وەرگری هەڵبەست گوێ بەوە نادات. ئەو ساز و ئاوازێکی بێ خەوش و خۆشتری ئەوێ.

لێرەدا ئەمەوێ ئەوە ڕۆشن بکەمەوە کە ئەم کێشی عەروزە بەتەنیا مڵکی عەرەب نییە. دوکتور ممدوح حقی لە پەڕاوەکەیدا (العروض الواضح) ئەڵێ: «ئێمە ناتوانین بڵێین کە خەلیل پابەندی کێشی هەڵبەستی هیندی و فارسی بووە یا نەبووە. ئەشێ عەروزی عەرەبیی لەسەر شێوازی ئەوان دانابێ. ئەو لە هەموو بارێکدا دۆزەرەوە بووە نەک داهێنەر». ئنجا زانایەکی فەرەنسیش (ئیم پاری Aim Parie) دەستورێکی وەک ئەوەی خەلیلی دانا لە بابەت گۆڕینی ترپەی مۆسیقاوە بۆ بڕگە دەنگی زمان. خەلیل هەنگاوەکانی لەسەر (فەعەلە) پیشاندا. پاری فەرەنسی (یەکەی) دەنگەکانی بە(ta- pa- ta- ti) پیشاندا کە ئەتوانرێ، بەو پێیە، هەر نۆتەیەکی مۆسیقایی بگۆڕێت بۆ دەنگی زمان لەناو ئەو یەکەیەدا[٢٥]. ئەمەش ئەو ڕاستییە ئەگەیەنێ کە ترپە (ایقاع) و کێش، دوو توخمی جیاواز نین لە هەڵبەستدا، هەردووکیان یەک واتا ئەبەخشن.

مەبەستم لەم وتانەی سەرەوە، ئەوەبوو کە ئەگەر هەستیارێکی کورد هەڵبەستە کوردییەکانی لەسەر کێشی عەروز دانا، ئەوە لاسایی کردنەوەی عەرەب نییە، عەروز زانستێکە وەک هەر زانستێکی تر، زانستیش موڵکی هیچ نەتەوەیەک نییە. ئەگەرچی لەناو نەتەوەیەکی دیاری کراویشدا سەری هەڵدابێ.

هەر لێرەدا ئەمەوێ ئەوەش دەربڕم کە زانستی عەروز، زانستێکی تایبەت نییە بۆ هەڵبەستێکی کلاسیکی. بەڵکو ئەکرێ هەموو جۆرە هەڵبەستێک لەسەر کێشی عەروز بێ. ئنجا وەرگری هەڵبەست، ئەگەرچی هیچیش نەزانێ لە بارەی زانستی عەروزەوە، بەڵام ساز و ئاوازی ئەم جۆرە هەڵبەستەی خۆشتر دێتە گوێ وەک لە هەڵبەستێک کە لەسەر کێشی پەنجە دانرابێ. ئەوە بەمەرجێک کە هەڵبەستە عەروزییەکە (زەحاف و عیلەل)ی تێدا نەبێ. زەحاف و عیلەلیش واتا کەموکووڕی لە کێشی بڕگەکاندا، کە ئەو کەموکووڕییە هەر نەبێ چاکترە. ئەگەر چاریش نەما، لەبەر ئەوەی واتا نەبێتە قوربانی هەڵبەست، ئەوا هەتا کەمتر بێ باشترە.

**بێینەوە سەر پێناسەکە و هەڵبەستەکانی مەحوی:**

ئەوەمان پیشاندا کە مەحوی لەسەر زانستی عەروز هەڵبەستەکانی داناوە. لە دەرگای ژمارەیەک لە کێشەکانی عەروزی داوە. بەسەرنجدانێکیش ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ کە مەحوی لە چاو هەستیارانی عەرەبدا، کەمتر کەوتۆتە کێشەی (زەحاف و عیلەل)ەوە. هەموو هەڵبەستەکانیشی، سەروادارن. سەرواش بەشێکە لە ساز لە هەڵبەستدا. سەروا (قافیە) ئەو کۆتاییەیە کە هەڵبەستی لەسەر دروست ئەکرێ. ئەویش بەپیتێک یا لە پیتێک زیاتر ئەبێ. سەرواش چەند جۆرێکی هەیە. دیارترینیان سەروای ستوونی و سەروای ئاسۆییە. سەروای ستوونی بۆ هەڵبەستی ستوونییە کە کۆتایی هەموو بەیتێک بەهەمان ئەو پیتانە ئەبێ کە لە بەیتی یەکەمدا دیاری کراوە، بەڵام هەڵبەستی ئاسۆیی هەر بەیتە و سەروای تایبەتی خۆی هەیە. هەموو هەڵبەستەکانی مەحوی ستوونین و سەرواکانیشیان هەر ستوونییە.

**داهێنان**

مەحوی، زۆربەی بیرۆکەی هەڵبەستەکانی لە داهێنانی خۆیەتی. لاریمان لەوەش نییە کە وەک پرۆفیسۆر دوکتور محەممەد نوری عارف لە نامیلکەکەیدا (چەند سەرنجێ لە بارەی مەحوی و حافزەوە)[٢٦] پیشانی داوە، هەندێک بیرۆکەی لە خواجە حافزی شیرازییەوە وەرگرتووە. بەڵام وەرگرتنەکە دەقاودەق نییە. بەڵکو مۆرکی تایبەتیی خۆی لە هەر یەک لەو بیرۆکانە داوە و لەگەڵ بارودۆخ و هەڵکەوتی کۆمەڵگاکەی خۆیدا گونجانویەتی. یان بەواتایەکی تر ئەتوانین بڵێین: لەیەکچوونی هەردوو کۆمەڵگاکەی حافز و مەحوی، وای کردووە بیرۆکەکانیان لەیەک بچێ. هەر کامیان بێ، سوود وەرگرتن لە یەکتری، لە نێوان هەستیاراندا، کارێکی پێویست و پەسندە.

**وێنە**

هەڵبەستەکانی مەحوی، پڕن لە وێنەی هەمە جۆر. بۆ نموونە: کەسێک کە گوێ لە وشەی سۆفی یا واعظ ئەبێ: ئەشێ دوو مرۆڤی ڕێکوپێکی بێتە بەرچاو. بەڵام مەحوی وێنەی ئەو دوو مرۆڤەمان ئاوا ئەخاتە بەرچاو:

ڕیشێکی پان و تووکی بنا گوێ درێژ و لوول[٢٧]
سۆفی لە دینی لادە بەدیمەن لە جوو دەکا!

بۆ واعیظیش ئەڵێ:

ئەشکەوتی بایەکە دەمی واعظ کە دێتە وەعظ[٢٨]
وەختی سکووتی، نەقشی سمێڵی لە قوو دەکا

قوو: تەیرێکی مل درێژە.

دوای ئەوە مەحوی لەم هەڵبەستەی خوارەوەدا، چەند تابلۆیەکی جۆراوجۆرمان پیشان ئەدات.

کـاتێک کـە شـۆخـەکـەی لە دوورەوە دەرئەکـەوێ، بزانن چی ڕوو ئەدات!؟ چۆن ئەشک و ئاهی مەحوی و خەڵکی تریش بەرز ئەبێتەوە؟ چۆن بەدەرکەوتنی لێو و ئەو، لەعل و گەوهەر بایەخی نامێنێ و لەبەر چاو ئەکەوێ؟ چۆن دەرکەوتنی ئەو وەک هەتاو کەوتن وایە؟ چۆن هەرکەس بەرەو پیری ئەچێ بوونی نامێنێ؟ یا دەربەدەر ئەبێ. یا هەر دڵە و لەسەرخۆ ئەچی. لەوانەش سەیرتر. ئەم جـوانەی مـەحـوی کـە وەک ڕۆژ و مـانگە، لە ڕۆژئاواوە هەڵدێ! ئەوە جگە لەوەی برۆی ئەو شۆخە وەک تیغ وایە و بەر هەرکەسێ بکەوێ نەجاتی ئەدات! مـەحویش لـەو ناوەدا، لە جیـاتی ئەوەی بەپێ بڕوا بەپیـر ئەو جـوانەوە کـە وەک ڕۆژ وایە، بەسـەر ئەڕوا بەپیـریەوە. بەڵام چۆن بەدەرکەوتنی ڕۆژ شەونم ئەبێ بەهەڵم و نامێنێ، ئاوا مەحویش ئەتوێتەوە و نامـێنێ. فەرموون ئێوە و هەڵبەستەکە:

وەکـو ڕۆژ ئەو مـەهە لەو دوورە دەرکـەوت(٢٩)
لە مـێـوە ئەشک و ئاهی ئێـمـە سـەرکـەوت
کـــە ئەو لێـــو و ددانەم دی، بەجـــارێ
لەبەر چاوم، هەمــوو لەعل و گــوهەر کــەوت
وەنەوزێکم شـــەوێ دا گـــەیـیـــە ســـەرم و
وتی: هەســـتـــە، هەتاوت وا لەســـەر کــەوت
لەکـێ یـارەب خـــــەبەر پرسـی بـکـەم مـن
کـە هەر کـەس بۆ خەبەر چوو، بێ خەبەر کەوت
دڵم وەک شـێـری بێـشـەی شـوعلەگـرتوو
لە ســـینەی پڕ لە ســـۆزم دەربەدەرکـــەوت
بەتیـــر ئەمـــڕۆ دڕی دا هەرچی پێش هات
خـودا پێـداوە هەرکـەس بەر نەظەرکـەوت
لەســـەرخـــۆ چوو بەدەم گـــریانەوە دڵ
گـەڕەک پڕ بوو کـە ئەم منداڵە دەرکـەوت
لە ڕۆژئاواوە ئیـــمـــشـــەو بێ نیـــقـــابە
مـەهی من، مـاهی عـالەم بێ مـەفـەڕ کـەوت
بەخـــۆڕایی ئەوەندەم ناڵە کـــێـــشـــا
لە سـینەمـدا پسـا، مـا، بێ ئەثەر کـەوت
برۆی ئەو شـۆخـە ئەمـڕۆ تێـغی کـێـشـا
نەجـاتی دا بەڕەحـمـەت هەرچی بەرکـەوت

بەپێـــــر ئەو ڕۆژەوە «مـــــەحـــــوی» ئەوەندە
بەســـەرچووبوو، وەکـــو شـــەونم لەســـەر کـــەوت

**دارشتن**

وابزانم لە بارەی دارشتنەوە، پێویست بەسەلماندن ناکا. ئەوەتا نەک هەر هەڵبەستێک، بگرە هەر دێڕە هەڵبەستێکی بگری، ئەوەندە چڕوپڕ و تۆکمە دارێژراوە کە چەند لاپەڕەیەک شیکردنەوە هەڵ ئەگرێ، بۆیە کەسێکی وەک مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، لەسەر هەر دێڕە هەڵبەستێک شیکردنەوەیەکی هەیە وەک لە دیوانەکەی مەحویدا، چاپی دووەم ١٩٨٤، هاتووە. هەروەها کەسێکی وەک دکتۆر عەبدوڵڵا ئاگرین لەسەر یەک تاکە بەیتی مەحوی:

هەیە گـەر عـیـشـقی سـەرداری لە سـەرتا
بکە مــەشــقێ لەوانەی چوونە ســـەردار

زیاتر لە دە لاپەڕەی لەسەر نووسیوە.

مەبەست لە ڕەوانی (سلاسة)ە. ڕەوانی ڕاستییەکەم لەم ڕووەوە، مەحوی هەڵبەستی ڕەوانی هەیە و هەڵبەستی نارەوانیشی هەیە. هەموو ئەو هەڵبەستانەی لێرەدا خستمانە پێش چاو، لە هەڵبەستە ڕەوانەکانی مەحوییە. ئەوە جگە لە زۆربەی زۆری هەڵبەستەکانی تری. ژمارەیەکی کەمیش هەڵبەستی نارەوانی هەیە. هۆی ئەو نارەوانیەش ئەوەیە کە مەحوی زۆر پابەندی واتا (معنی) بووە، بەجۆرێک هەوڵی داوە کە لەیەک تاکە دێڕدا چەندین واتا بپێکێ و زۆر مەبەست بدا بەدەستەوە، بۆ نموونە:

کوردی زوبانی ئەسڵـمە گەر تەرکی کەم بەکول(٣١)
بۆ فـــارسی، بەکـــوللی ئەمن دەبمە بێ وەفـــا

لەم هەڵبەستەدا وشەی (بۆ فارسی) کەوتۆتە نیوە دێڕی دووەمە. وا خۆشتر و ڕەوانتر ئەبوو، ئەم وشەیە هەر لە نیوە دێڕی یەکەمدا بوایە، بڵێین ئەگەر مەحوی بیوتایە:

کـوردی زوبـانی ئەسـڵـمـە گـەر تـەرکی کـەم بۆ فـارسی

هەڵبەسەکە زۆر ڕەوانتر ئەبوو. بەڵام مەحوی دیارە لەلایەک ویستوێتی کێشی ئەم دێڕە هەڵبەستە وەک کێشی سەرجەمی دێڕەکانی نوێ بێت. لەلایەکی کەشەوە ویستوێتی وشەی (کول) دووجار وەک ڕەگەز دۆزی (جناس)ێک بەکار بێنێت. ئەوە جگە لەوەی مەحوی لەم هەڵبەستەدا، هەنگاوی پاشەکشەیەکیشی بۆ خۆی داناوە، لە ئاستی ئەگەرێکدا کە لێی بپرسن ئەی کەوایە تۆ بۆچی ئەو هەموو هەڵبەستە فارسیانەت داناوە؟! ئەویش لە وەڵامدا بڵێ: من وتوومە ئەگەر زمانی کوردی بەکوللی تەرک بکەم ئەبم بەبێ وەفا. بەڵام من کە بەفارسی هەڵبەستم وتووە، ئەوەتا وازم لە زمانەکەی خۆشم نەهێناوە و ئەو هەموو هەڵبەستە کوردیانەشم

وتووە. ئەم مەبەست و ناوەڕۆکانە، وای کردووە مەحوی گوێ بەو نارەوانییە نەدات لەو دێڕە هەڵبەستەدا، ئەوە سەرباری واتاکەی کە پەرۆشی مەحوی ئەگەیەنێت بۆ زمانی نەتەوەیی خۆی کە ئەویش بیرکردنەوەیەک و هەوڵێکی نەتەوەییانەیە.

**هەژاندن**

ئەمەیان پێویست بەبەڵگە لەسەر رۆیشتن ناکا. بەبەڵگەی ئەو هەموو گرنگییەی بەهەڵبەستەکانی مەحوی دراوە، چ وەک بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە و ستایش کردنیان. چ وەک ئاواز دانان بۆ ژمارەیەک لە هەڵبەستەکانی و کردنیان بەگۆرانی و بەتەواشیحی دینی، بەجۆرێک کە لەگەڵ هەموو دووبارە کردنەوەیەکیاندا هەژانێکی تر دروست ئەکات لە ناخی بیسەرانیاندا و کار لە بیر و هەست و سۆز وئەندێشەیان ئەکات.

ڕاستییەکەی نووسین و لێکۆڵینەوە لەسەر هەڵبەستەکانی مەحوی، مەودایەکی زۆر زیاتری ئەوێ. بەڵام کەمیی کات و وابەستەبوونمان بە تەنیا ٢٠ دەقیقەوە لەم ڤیستیڤاڵەدا، وای کردووە زۆر بەخێرایی و تەنیا وەک ئاماژەیەک بەسەر هونەری هەڵبەست و هەڵبەستەکانی مەحویدا تێپەڕین. کۆتایی وتارەکەشمان بەم هەڵبەستەی مەحوی ئەهێنین کە هەموو لایەنە هونەرییەکانی تیا کۆبۆتەوە:

خەططی دەوری لێوی ئاڵت، ئەی مەسیحا لام و بێ(٣٣)
هەر لە جامەی سەبزە ئەچێ بۆ غەین و نوون و چیم و هێ
غونچە بازاڕی نەزاکەتداریی و تەنگی شکاند
هەر کە ظاهر بوو لە دەوری باغی حوسنت لام و بێ
لەب شەکەر تاکەی لە حەسرەت خاڵی موشکینت دڵم
داخدار و خەستە بێ وەک لام و ئەلف و لام و هێ
لالە ڕوخسارم لە سایەی ئەشکی خوێنین ڕەنگەوە
چونکە ڕووسوورم لە قاپیی عەین و شین و قاف و تێ
عیشقت ئەی جانا، منی ڕیسوایی عالەم کردووە
چاکە ئینسافت ببێ بۆ ئەلف و سین و تێ و هێ
ئێستە بۆ لاف و گەزاف هەرکەس دەبینی عاشقە
نەک هەموو کەس جانفیدا وەک میم و حێ و واو و یێ
مەحوی ئەمڕۆ زۆر نەخۆشە قەت شیفای نایێ بەهیچ
گەر شیفای بێتن، بەبۆیی زوڵفت و ئەو ئەگریجە دێ

**پەراوێزەکان**

١- هەڵبەست: شیعر.

٢- هەستیار: شاعیر.

٣- من لام مەرج نییە کە هەموو هەڵبەستێک ئەبێ تێکەڵ ئەندێشە بێ. بۆیە وتم هەندێ جار.

٤- بڕوانە: ر. أ. سكوت جيمس، صناعة الأدب، ل ١٩٩.

٥- بڕوانە: کامیل ژیر، هەڵبەستەکانی ژیر.

٦- بڕوانە هەمان سەرچاوە.

٧- دیوانی مەحوی، ل ٢٢٠.

٨- هەمان سەرچاوە، ل ٢٢٤.

٩- هەمان سەرچاوە، ل ٥٦.

١٠- هەمان سەرچاوە، ل ١٤٦.

١١- هەمان سەرچاوە، ل ٢١٧.

١٢- گۆڤاری ئاینده.

١٣- سەرچاوەی ژمارە (٧)، ل ٢٤٥.

١٤- سەرچاوەی ژمارە (٥).

١٥- کامیل ژیر: جوانی، ل ٢٢.

١٦- سەرچاوەی ژمارە (٧).

١٧- دیوانی گۆران، ل ٢٠٦.

١٨- هەمان سەرچاوە، ل ٢٥٣.

١٩- هەمان سەرچاوە، ل ٢٦٨.

٢٠- هەمان سەرچاوە، ل ٣٠٩.

٢١- دیوانی کامەران، ل ٣٢٠.

٢٢- سەرچاوەی ژمارە (١٥).

٢٣- ممدوح حقي، العروض الواضح، ص ١٤.

٢٤- ممدوح حقي، العروض الواضح، ص ١١.

٢٥- طلال عبدالرحمن، الإيقاع بين الشعر والموسيقى، جريدة العراق، العدد ٣٩٠٥، ص ٦.

٢٦- د. محمد نوری عارف، چەند سەرنجێک لەبارەی مەحوی و حافزەوە.

٢٧- هەمان سەرچاوەی (٧)، ل ٢٥.

٢٨- هەمان سەرچاوەی (٧)، ل ٢٧.

٢٩- - هەمان سەرچاوەی (٧)، ل٨٧.

٣٠- د. عەبدوڵلا ئاگرین، لەبارەی مەحویی لوتکەوە، ل ٢٦٩.

٣١- هەمان سەرچاوەی (٧)، ل ١١.

٣٢- هەمان سەرچاوەی (٧)، ل ٣٢٣.

٣٣- دیوانی مەحوی، ل٣٢٣.

**سەرچاوەکان**

١- ر.أ. سكوت جيمس، صناعة الأدب، ترجمة هاشم المنداوي، من مطبوعات دار الشؤون الثقافية/بغداد.

٢- کامیل ژیر، هەڵبەستەکانی ژیر، دیوان، چاپی سوید ١٩٩٣.

٣- دیوانی مەحوی، لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عەبدولکەریمی مودەریس، چاپی دووەم، بەغدا ١٩٨٤.

٤- گۆڤاری ئاینده.

٥- دیوانی کامەران.

٦- د. ممدوح حقي، العروض الواضح، اليقظة العربية، الطبعة الثالثة ١٩٦٤.

٧- جريدة العراق، مقالة طلال عبدالرحمن، ص ٦، العدد ٣٩٠٥، بغداد.

٨- د. محمد نوری عارف، چەند سەرنجێک لەبارەی مەحوی و حافزەوە.

٩- لەبارەی مەحویی لوتکەوە، ئامادەکردنی عەبدوڵلا ئاگرین، چاپخانەی سومر، بەغدا ١٩٨٦.

## له مەیخانە

له مـەیخـانە، خـودا! گـەر ئێـمـە دەرچین،
بەكێ بەین ئیلتــجـا، بۆ كـێــهـە دەرچین؟!
كــە ئێــمـــە چوونە جــەننەتمان بەتۆدا،
له ئێـمــە لادا زاهیــد؟ ئێـمــە هەر چین
خــەت و زولـفی بەیەكــدا دێ لەســەر روو
مـەگـەر زەنگ و خـەتا شـەریە لەسـەر چین
لەباوەشـمــا دەدا مـەوج ئەشكی حـەسـرەت
كـەمــەرتی گــرتە باوەش تا كـەمــەرچین
ئەوەندە تەنگ و ناخـــۆشـــە، له دنیـــا
خـۆشـە دەرچوون، ئەگـەرچی بۆ سـەقـەر چین
سـەرت پێ لازمـە، مـەی بازە «مـەحـوی»
دەبێ دولبــەر كـە هات ئێـمـە بەسـەر چین
مـــەحــــالاتە لە بەندی زولـفی دەرچوونی
چەها چینە، چەها چینە لەســـــەر چین

# مەحوی ١٨٣٠ - ١٩٠٦
# شاعیرێکی شۆڕشگێڕ لە ڕوانگەی ئاینییەوە

**نووسینی: کەمال غەمبار**

## بەرایی

مەبەستم لە وشەی شۆڕش و شۆڕشگێڕی شێوازی توندوتیژی و خوێناوی نییە بۆ گۆڕانی واقیع و بونیادی کۆمەڵ، بەڵکو شۆڕشێکی سپییە لە ڕێگەی چاکسازی و گەیاندنی پەیامی ڕاستی و ڕووناکی و چارەسەرکردنی کەموکوڕی و ناتەواوی و لادان لە ڕەوتی ڕاست و ڕەوانی ئایینی و گومراکردنی خەڵکی سادە و نەزان، لەژێر پەردەی ئایینی. واتە بەرپاکردنی ڕاپەڕینێکی کۆمەڵایەتی گشتی.

مەحوی شاعیر، یەکێکە لەو سەرکردە چاکسازە و هزرڤانە شۆڕشگێڕانە کە شیعرەکانی بەڵگە و گەواه و شایەتن کە چ کارتێکردن و ڕەنگدانەوەییێکیان لە ڕێنماییکردنی خەڵکی کوردستان بینیوە و، ویستوویەتی شۆڕش لەسەر ئەو واقیعە ستەمکارە بکات و، میللەتە چەوساوە و دواکەوتووەکەی هەنگاو بەرەو ئاسۆیەکی گەش و ڕووناک هەڵێنێ و تۆز و گەردی تاریکی و نەزانی و گومرایی لە جەستەی خۆیدا بتەکێنێ.

لەم ڕوانگەیەوە من مەحوی بەخاوەن پەیامێکی پیرۆز لەقەڵەم دەدەم کە لەسەردەمی خۆیدا وێڕای زاڵبوونی عەقڵییەتی ویشک و داخراو و تەنگەبەر. بەفراوانی عەقڵ و بوێری پتەوی بیروباوەڕ و ئازادی و پاکی وێژدان بەگژ ئەو ڕەوشە نالەبارە دابچێتەوە کە نەتەوەی کورد لەژێر حوکمی دەسەڵاتی عوسمانی دەیناڵاند، ئەوە لە کاتێکا ئەو دەسەڵاتەی دوژمنی بەویستی گەلەکەمان کە میرنشینی بابانی لەناو برد، بەهەموو شێواز و شێوەیەک پشتگیری لە ژیان و ڕێبازی دەروێشی و برەوپێدانی بیروباوەڕی پڕوپووچ و گەندەڵ دەکرد، هەڵبەت لەو سەردەمەدا بانگەشەی چاکسازی و نوێکردنەوە لە ئاییندا ئەرکێکی ئەوەندە سانا و بێ گیروگرفت و سەرئێشە نەبوو، بەڵام وێڕای ئەمەش مەحوی وەک شۆڕشگێڕێک پەردەی لە ڕووی ئەو جەردە و ڕێگرانە هەڵدەدایەوە کە ئاینییان دەشێواند و بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بەکاریان دەهێنا. بۆ نموونە دەڵێ:

شێخێ هەمەوەندێکی دەدا پەند و نەصیحەت
ئەو قوڕبەسەرەی دابووە بەر فەحش و فەضیحەت
خۆش هاتە جەواب و وتی: تۆ حەقتە، فەقەط من
قوططاعی طەریقم، نەکو قوططاعی طەریقەت(١)

## کوردایەتی و شۆڕشگێڕیی مەحوی

لە نووسەرێکی ناسراوی سۆڤییەتی پێشوویان پرسی ئایا ئێوە ئەدەبی نەتەوەییتان هەیە؟ لە وەڵامدا وتی: نووسینی بەزمانی نەتەوە، ئەدەبێکی قەومییە، کە شاعیرێکی متەصەووفی وەک مەحوی شیعر بەزمانی کوردی دەنووسی و دیوانێکی تەواوی بەزمانی کوردی هەیە، کەواتە بەهەستێکی کوردانە کارەکەی ئەنجام داوە کە دەڵێ:

کوردی زوبانی ئەصڵمە گەر تەرکی کەم بەکول
بۆ فارسی، بەکوللی، ئەمن دەبمە بێ وەفا
دووری مەبینە تۆ لە کەریمی بەها نە جۆ
هەرچی کە کوردە پاکی ببەخشێ بە(بوالوفا)(٢)

لەکاتێکدا لەو سەردەمەدا زۆربەی پیاوانی ئاییني نووسینەکانیان بەفارسی و عەرەبی بوو، حاجی قادری کۆیی ١٨١٥ – ١٨٩٢ لە هۆنراوەی (کوردێکی کۆیی کەوتە بەر)دا، بەربەرچی ئەو کابرایە دەداتەوە کە حەزی کردووە کاکە حەمەدی شێخ مەعرووفی نۆدەهی ئامۆژگاری و ڕێنمایی موسلمانانی کورد و ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی شەرع و قورئان بەزمانی عەرەبی بکات نەک بەکوردی حاجی چۆن ڕووبەڕووی دەبێتەوە و گیانی کوردایەتییەکەی دێتە جۆش و خرۆش کە کوردە کۆیییەکە دەڵێ:

کەس نەماوە بە غەیری کاک ئەحمەد
شەیخ مەعرووف و عالیمی ئەرشەد
چاکە ئێستا دەکا لە بۆ کوردان
تەرجەمەی شەرع و ئایەتی قورئان
واقعا خزمەتی لە بۆ خووایە
چ دەبوو گەر بەکوردی نەبووایە

حاجی لێی دێتە وەڵام و پێی دەڵێ:

هەر کە وای گوت وەها موکەددە بووم
وام دەزانی کەوا لە دین دەرچووم
گوتم ئێستاش لەسەر کەری ماوی
چابو مستم نەدا لەنێو چاوی
کوردی ئاخر بڵێ چییە عەیبی
هەر کەلامی حەقە نییە عەیبی

یا لەگەڵ فارسی چ فەرقی هەیە
بۆچی ئەو ڕاستە بۆچی ئەم کەمی نییە[٣]

کە زمان، دیارترین و بەرچاوترین ڕەگەزی پێکهاتەکانی نەتەوە بێ و، مەحوی بەم جۆرە شانازی بەزمانە کوردییەکەی بکات ئەی کوردایەتی گەر بەم شێوە نەبێ، دەبێ چۆن بێ، ئەوە لە کاتێکا کاکە حەمەی مەلا کەریم لە بەراوردی نێوان نالی و مەحویدا لە ڕووی کوردایەتییەوە بۆچوونێکی تایبەتی هەیە کە دەڵێ: «ڕاستەکەی لە مەیدانی کوردایەتیشدا، کوردایەتییەکەی مەحوی ئەوەی لەباردا نییە شان لەشانی کوردایەتی یەکێکی وەک نالی و بەڵکو سالمیش بدا کە هیچ نەبێ لەبەر دواکەوتنی سەردەمی ئەم و دەرکەوتنی ڕاستی پتر بۆی، دەبوو ئەگەر لەوان پێشیش نەکەوتایە، هیچ نەبێ بگاتە ڕادە و پلەیان، جووتە چوارخشتەکییەکەشی کە هەستی کوردایەتی خۆی تیایاندا دەربڕیوە، تەنها دەستە چیلەیەکن لە ئاگری بەتینی کوردایەتی و هەستی نەتەوە پەرستی نالی وەرگیراون، بەتێکرای دیوانی مەحوی پارچە شیعرێکی وای تیا نییە کە چ لەمەیدانی ناسینەوەی دوژمنانی گەلی کورد و چ لە مەیدانی گیانی کوردایەتیدا بەقوڵەپێی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم...)ەکەی نالیدا بگاتەوە»[٤]. بەلای منەوە ئەم بۆچوونە کەمکردنەوەیە لە ئاستی کوردایەتییەکەی مەحوی و لاسەنگبوونی تەرازووەکەیەتی لە ئاستی نالیدا، ئەوا لە کاتێکا هەریەک لەم دوو شاعیرە لەڕەوش و چوارچێوەیەکی جیادا ژیاون، قەسیدەی (قوربانی تۆزی ڕێگەتم) لە ڕاستیدا گەڕانەوەیە بۆ سەردەمی میرنشینی بابانییەکان و نالیش وەک شاعیرێکی دەسەڵاتخواز (سلطوی) لایەنگریی خۆی بۆ سەردەمی بابانەکان دەرئەبڕی و ڕێ چوونی خراپتربوونی باری ژیانیش بۆ سەردەمی ڕۆمییەکان دائەنێ و مامۆستا حەمە ئەم لایەنگرییە دەبەستێت بە (نیشتمانپەروەری)یەوە، بێگومان ئەمانە دوو چەمکی جیاوازن و پێویستە لە بەکارهێناندا بەدیقەت بەکارببرێ، ڕێی تێدەچێت لە قۆناغی ژیانی گەلێکدا لایەنگیریی فەرمانڕەوایانی ئەو گەلە نیشانەی نیشتمانپەروەری بێت، بەڵام ئەمە ڕێسا نییە... ئەو لایەنگرییە بەلای ئێمەوە بریتییە لە (چارەنووس) بەستنەوە بەو ڕۆژگارەوە کە بابانییەکان فەرمانڕەوایان دەکرد و ئەویش نالی ناچار کردووە چارەنووسی خۆی بەشێوەیەکی ڕەها بەو ڕۆژگارەی حوکمەوە ببەسێتەوە بریتییە لەو سیستەمی پەروەردە سیاسییەی دەسەڵاتداری بابانییەکان بۆ ئیحتواکردنی عەقڵییەتی سەردەم»[٥].

من وای بۆ دەچم کە جیاوازییەکی تەواو لە نێوان نالی و مەحویدا هەیە، نالی وەک شاعیرێکی میری شاعیرانی ئەو سەردەمەی دەرباری پاشایەتی، کە پلە و پایەکی تایبەت و باڵای لای سلێمان پاشای بابان و ئەحمەد پاشای کوڕی هەبووە و، مەحوی وەک شاعیرێکی مەتەسەووفی باڵای سەردەمی خۆی کە خەلیفەی شێخ بەهائەددینی کوڕی شێخ عوسمان بووە و خەریکی دەرسگوتنەوەی زانیارییە ئاینییەکانی ئەو کاتە و ڕێنماییکردنی مرۆڤ بووە لە دونیای تەسەووفدا، خۆی بەهیچ جۆرە حوکمێک نەبەستۆتەوە، ئازادانە بیری کردۆتەوە، ناز و نیعمەتی

هیچ کاربەدەستێکی پێ نەبەخشراوە، بەڵکو مرۆڤێکی یاخی و شۆڕشگێڕ و نەفس بەرز بووە. کە ستایشی سوڵتان عەبدولحەمیدی کردووە، بارودۆخی ئەو سەردەمە جوولاندوویەتی چونکە «لە سەردەمی مەحویدا هەستێکی موسڵمانەتی، وەک شێوەیەکی بەربەرەکانێی ئەمپریالیزم، جیهانی موسڵمانانی گرتبووەوە و کۆمەڵێ لە ڕۆشنبیرانی ئیسلام بەو ڕێگەیەدا دەچوون، سەرچاوەی ئەم هەستە لەسەرێکەوە سەودای خەبات لە دژی ئەمپریالیزمی تازە هاتوو و، سەرکێشی لە هاندانی سوڵتان عەبدولحەمیدەوە بوو کە ئاڵای (پان ئیسلامیزم)ی بەرزکردبۆوە، ئەم هەستە تێکڕا هەستێکی پێشکەوتنخوازانە بووە، چونکە یەکێک بووە لە ڕێبازەکانی خەبات بۆ پاراستنی سەربەخۆیی وڵاتە ئیسلامەکان لە هێرش و دەستدرێژیی ئەمپریالیزم کە چ لە ڕووی سوپایی و چ لە ڕووی ئابوورییەوە ڕووی کردبووە وڵاتە موسڵمانەکان، مەحوی ئەم هەستەی بەئاشکرا تیا دیارە و لەو مەیدانەدا لە ڕۆشنبیرە موسڵمانەکانی سەردەمی خۆی دوانەکەوتووە».

هەر چەندە مەحوی لە دونیای تەسەووفدا شاسوار بووە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە لەو خەڵوەتەدا دەرنەچووە و ئاگای لە ڕووداوەکانی دونیا نەبووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە دژی نەخشە و پیلان و داونانەوەی دەوڵەتانی ئیمپریالی بووە، کە ویستوویانە گۆڕانکاری و چاکسازی نەکرێ و یەکێتی موسوڵمانان تێکبدەن، لە هەمان کاتدا کە دیویەتی میللەتەکەی دووچاری زوڵم و ستەمی حاکمانی تورک بووە، ویستویەتی لە وڵات سەری خۆی هەڵبگرێ و بەجێی بێڵێ، بەڵام خۆڕاگرتن و مانەوەی و بەربەرەکانی کردنی بارودۆخی نالەباری کۆمەڵایەتی، جۆرە شۆڕشگێڕییەکی پێ ڕەوا دەبینێ، کە نالی نەیتوانیوە خۆی لەبەریان بگرێ بەرەو شام ڕەو نەکات.

مەحوی ویستوویەتی ئایین بکاتە مەبەستێکی کۆمەڵایەتی و خەبات دژی دواکەوتن و زوڵم و زۆرداری بەئەرکێکی ئایینی، بۆیە هەوڵی نوێکردنەوەی بیروباوەڕی موسوڵمانان و ڕاستکردنەوەی کار و ڕەفتاری چەوت و چەوێڵی داوە و، ئەوانەی ڕیسوا دەکرد، کە لە پشت دینەوە خۆیان حەشاردابوو، شتی ئەوتۆیان خستبووە پاڵ کە دوور بوو لە ڕۆحییەتی و ئوسوولەکانی. کە لە ڕێگەی نموونەی شیعرەکانییەوە ڕووناکییان دەخەینە سەر.

## مەحوی چاکساز و ڕابەری کۆمەڵایەتی

هەرچەندە مەحوی خۆی شاعیرێکی متەسەووف و لە خوا نزیک بووە و، پشتی لە دونیا کردووە، بەڵام هەمیشە بەرهەڵستکاری ئەو کەسانەی کردووە، کە خوا پەرستییەکەیان تەنیا بەڕواڵەتە و لە کرۆکەکەی نەگەیشتوون و کاری ڕیش و قژ درێژکردن بەلادان لە ئایین لە قەڵەم دەدات و دەڵێ:

ڕیشێکی پان و، تووکی بناگوێ درێژ و لوول
صوفی لەدینی لادە بەدیمەن لە جۆ دەکا (٧)

لە ڕۆژگارێکی ناهەمواردا، کە پارەوپوول سەروەربێ، دونیا پشتت تێ بکات، کە بەرژەوەندیی

خودی لەجیاتی خزم و کەسوکار بێ و مرۆڤ هەژار و نەدار بێ، چارەش چەک و دەسەلات بێ دەبێ مەحوی ئەم واقیعە چۆن هەلسەنگێنێ، ئەوەن بەبێ کە بلێ:

گەر لە تۆ دنیا بەری بوو، قەوم و خوێشت لێ بەرین
گەر بەراتی بوو، هەمـوو عـالەم باب و برات(۸)

مەحوی لە شاعیرێکی عەرەب کە باسی بێ پارەوپوولی دەکات چۆتە ناو واقیعەکە، هەر چەندە هەردووکیان لەیەک خالدا یەک دەگرنەوە، لە دونیای ئەمڕۆماندا ئەم حەقیقەتە لە هەموو کاتێک زیاتر و زەقترە ڕەنگی داوەتەوە. شاعیرە عەرەبەکە دەلێ:

فـصـاحـة حـسـان وحظ إبن قـحلة
وحكمـة لقـمـان وعـفـة مـريم
اذا اجـتـمـعت في المرء والمرء مـفلس
ونـودي عـليـه لايـبـاع بـدرهـم

مەحوی هەر بەم حەقیقەتە دەربڕینە ناوەستێ، بەلکو ئەو کەسە ڕیسوا دەکات کە هەموو خەم و خەو و خولیای بەهەر شێوە و شێوازێک بێ پارە پەیدا کردنە و کوردیش بەخۆڕایی نەیگوتووە کە دەلێ: «خوا و خورمایان نەگوتووە»، چونکە هەرگیز ناکرێ جۆرە هاوسەنگییەک لە نێوان هەردوولا دروست بێ و یەکێکیان لەسەر حیسابی لە دەستچوونی ئەوی ترە، هەر لەم ڕووەوە مەسیح لە ئینجیلدا دەلێ: (کەس ناتوانێ خزمەتی دوو سەردار بکات، چونکە یا ئەوەتا ڕقی لە یەکێکیان دەبێتەوە و ئەوەی تری خۆشی دەوێ، یاخود لەگەل یەکێکیان دەبێ و بەسووکی سەیری ئەوی دی دەکات، ناتوانن خزمەتی خوا و پارەوپوول بکەن)(۹).

مەحوی بەچاوێکی سووکەوە سەیری ئەو جۆرە کەسانە دەکات کە نرخ و بەهای خۆیان نازانن و خۆ دەکەنە پوولی قەلب و بۆ پارووە نانێ ڕووی خۆیان ڕەش دەکەن. ئا ئەمەیە بەرز نەفسی مەحوی یاخی بووی شۆڕشگێڕ کە پەردە لە ڕووی ئەو نزم نەفسانە هەلدەمالێ و دەلێ:

بۆ پارە حـەیفـە خـۆ دەکـەیە پوولی نارەواج
بۆ پاروێکی نان ئەسـەفـە ڕوو دەکـەی بەسـاج(۱۰)

مەحوی سکالای دەروونی خۆی لە دەست ئەو خەلکە نەزانە دەکات کە ڕێزی شیعر و هونەر ناگرن. چونکە شیعر زمانحالی گەلە و، شیعری ڕەسەن دەماودەم دەگێڕدرێتەوە و هەموو کاتێ برەوی خۆی هەیە، وەک کالای قەشەنگ و جوان لەبەر دەکرێ، بەلام کێن ئەوانەی ئەم جۆرە کالایانە لەبەر دەکەن مەگەر مرۆڤی هوشیار و ژیر و ڕێکوپێک نەبن، لای مرۆڤی گەمژە و گێژ و نەزان شیعر چ نرخ و بەها و تەقدیرێکی هەیە، بۆیە مافی خۆیەتی لەناو کۆمەلگەیەکی کوردا، مەحوی پرسیار بکات و بلێ:

کێ قــەدری شــیــعــری ئێــمــە دەزانێ، بەری دەکــا
هەر صــاحــیــبــە لەبەر کــەری کــاڵایی بێ ڕەواج(١١)

گۆرانیش هەر لەسەر ئەم ڕێچکە دەڕوات و گلەیی لە دەست ئەو کۆمەڵگەیەی کورد دەکات کە بە چ چاوێکی کەم سەیری مرۆڤی هونەرمەند دەکات و لە هۆنراوەی (دەروێش عەبدوڵڵا)دا لەگەڵ مەحوی لوتکەدا یەک دەگرێتەوە و دەڵێ:

بەڵێ، دیارە لەناو قـەومی بەسیـتـا قـەدری سنعـەتکار
وەکـو عـەکسی قـەمـەر وایە لەناو حـەوزێکی لێـخندا،
بەڵام تەختی ڕوفـاه و تاجی حورمەت میـللەتی هوشیـار
بەئوستادێ ئەدا وەک تۆ لەناو شمشاڵی کون کوندا(١٢)

مەحوی وەک مرۆڤێکی قـووڵ و وردبین دەرکی بەو ململانێی سەر دەسەڵاتی دونیا کردووە، کە هەموو شەڕوشۆڕێک لەسەر ئەو لاکە تۆپیوەیە، کە کەس لەگەڵ خۆیدا نایبات و تاسەر نییە، ماڵ و مـوڵکی دونیـا ئەوەندە نـاهێنێ کە ئەو هەمـوو شەڕوشـۆر و مرۆڤ قران و وێرانـی بەدواوە بێت بۆیە دەڵێ:

دەزانی جــیــفــەیە دنیــا، دە حــەیفــە
وەکـوو سەگ ئەم شەڕ و شۆڕە لەسـەر لاک(١٣)

مەحوی لە ناکۆکییەکان و هاودژەکانی واقیع دەدوێ و ڕووناکی دەخاتە سەر لایەنە چەوتەکانی زەمانە و چەرخی ناچیز و بێ بایەخ، کە چۆن پێوەرەکان سەرەو لێژ کراون، هیچ شتێک لە شوێنی خۆی نەماوە و کـار و ڕەفتـاری ئەم خەڵکە گۆڕاوە. بۆیە ئەم واقیـعە ناهەمـوارە بەشیـعر دەردەبڕی کە شیـعر چاکـترین چەکی سەردەمی ئەو بووە و، لەو ئان و زەمانـەدا شتـەکان بەم شێوە بوون و زۆرجاریش مێژوو خۆی دووپات دەکاتەوە. ڕووە تاریک و دژوارەکەی سەدەکانی پێشوومان وەک فلیـمی سـینەمـا دێنێـتـەوە بەرچاو و ئەمڕۆ و دوێنی بەیەک دەبەسـتێـتـەوە، مـەحـوی بەم جـۆرە سەردەمی خۆی وێنە دەکێشێ:

لە سایەی دەوری چەرخی سوفلە پەروەر لەک بەلەک دەدوێ
سـەگی ئاواتەخـوازی ئێـسکی و شـتـر لە شـەک دەدوێ
دەبینم شێری شێر ئەفگەن دەڵەک کەوڵی دەکا، دەبیـەم
بەکۆڵێ کلکەوە ڕێوی لەگەڵ کەوڵی دەلەک دەدوێ(١٤)

گومانی تێدا نییـە لە بارودۆخێکی ئاوادا کە پێوەری حەق و ڕاست و ڕەوان پێشێل بکرێ و، نرخ و بەهاکــان بـاویان نەبێ، دەبێ حــاڵی هونەر چۆن بێ، لەو زەمــانـە نەگـریســەدا چ بازاڕ و برەوێکی هەبێ، هەر دەبێ بەهەمان دەردی بەها بەرز و باڵاکان بچێ و مـەحوی یاخی و شۆڕشگێڕ

بەرامبەر ئەو ڕەوشە دزێوەدا هەر ئەوە بڵێ:

ئەمــــڕۆ لە کن زەمـــانە هونەر بۆتە قـــەشـــمـــەری
شـــێـــری ژیانی بۆ چیـــیـــە، مـــەیموونە گـــەرەک!
فـــــیطرەت بـلـند و پـایە بـلـندم نـەدی، بەگـــــوێش
گەردوون ئەوەندە دوونە، کە هەر دوونییە گەرەک(١٥)

هەڵبەت لەم جۆرە ڕۆژگارەدا، مرۆڤی هونەرمەند و، خاوەن بەهرە و بلیمەت شوێنی شیاوی خـۆی پێنادرێ، چونکە هەرگـیـز ئامـادە نییـە، بەهرە و هونەر و زانست و ئەدەبەکـەی لە پێناو پلەوپایەدا لە دەست بدات و سەنعەتەکەی خۆی ڕەزیل کات.

بەرانبەر ئەوەی کە مەحوی بەم جۆرە ڕووبەڕووی ئەو واقیعە تفت و تاڵەی کە تێیدا ژیاوە دەبێتەوە کە زۆرجار گیروگرفت و سەرئێشەی بۆ دروستکردووە و، لەم ڕێگەدا باجی داوە، لە هەمان کاتیشدا، ئاوڕێکیش لە مرۆڤی مەرد و ئازاد دەداتەوە و ڕێزی دەگرێ و، ئەوەی کە ڕێزی ئەو جۆرە کەسانە دەگرێ، شیاوی ئەوەیە ببێتە شا کوڕ و مەرجیش بۆ ئەم پلەوپایە دادەنێ و دەڵێ:

ڕۆڵە! گـەر حـەز دەکـەی ببـیـە شـا کـوڕ
پەندی «مـەحـوی» لە گـوێ گـرە وەک دوڕ
مـــەردی ئازادە قـــەت مـــەرەنجـــێنە
(کلُّ شيءٍ ولا شـــتـــيـــمـــة حُـــرّ)(١٦)

وێرای ئەوەی کە مەحوی شاعیری عیلم و عیرفان بووە، لەو دەریایەدا مەلەوانێکی باش بووە، بەڵام بێ فیزی و تەوازوعەکەی ئەوەندە سەری کردووە کە دان بەحەقیقەتێک بنێ، کە هەرچەندە مرۆڤ زانا و دانابێ، هێشتا زۆری ماوە تەنانەت لە ئەلف و بێی زانستەکان بگات، هەرچەندە لەو ڕەوتە بەردەوام بێ، ناگاتە مەنزلی زانیای و بڵێ ئیتر ئێرە مەڵبەندی حەسانەوەمە و پێویستم بەزانین نەما، بۆیە لەم ڕووەوە دەڵێ:

هەر گـفـتـوگـۆمـە، کـەچی هەر دەڵێم و تێ ناگـەم
هەر جـوست و جـۆمـە، کـەچی هەر دەڕۆم و پێ ناگـەم
چاوم ڕوا و گـــــــۆشـــــــەی ئـەو ئەبـرووەم نـەدی
دڵ بوو بەبەحـری علووم و لە ئەلف و بێ ناگـەم(١٧)

شاعیری نوێخوازی عـەرەبیش ئەبوو نوواس دانی بەو حەقیـقەتە نا و، کە مرۆڤ هەرچەندە لافی زانین لێـبـدات و خـۆی بەزۆرزانێکی گـەورە لە قـەڵەم بدات، شـتـێکی لەو زانینە وەدەستهێناوە و زۆر شتیشی لا ڕوون نییە و دەڵێ:

فـــقل لمن يدّعي في العلم فلســـفـــة
عــرفت شــيـئـــاً وغـــابت عنك أشــيـــاء

دڵداری شاعیریش هەر لە مەحوی لوتکە دوو دێڕی یەکەم و دووەمی وەرگرتووە و نائومێدی بەرامبەر ژیان دەردەبڕێ و دەڵێ:

هـەر دەڵــێــین و تــێــنـاگـــــــــــەیــن
هـەر ئـەڕۆیــن و پـێــنـاگـــــــــــەیــن
هەمـــــوو ئەو گـــــفــــتـــــوگـــــۆیە
داخـــــــەكـــــــەم ڕەنجـــــــەڕۆیـە[١٨]

## ئەنجام

لە سەرەتادا ئاماژەم بۆ یاخیبوونی مەحوی کرد لە داب و نەریت و بیروباوەڕ و کار و کردەوەی ناهەمواری کۆمەڵایەتی و ئەو کەسانەی کە ئاییندیان کردۆتە هۆکارێک بۆ بەرژەوەندیی تەسکی خۆیان و لە ڕاستی لایان داوە و خواپەرستییەکەیان تەنیا بۆ ڕواڵەتە و شێوەیەکی ڕۆتینی وەرگرتووە، بۆیە لە ڕووی ئەو جۆرە کەسانە دەتەقێتەوە و ڕیسوایان دەکات و دەڵێ:

ئەغلەبی تەکـــیـــەوو دەرگـــاهی بیـــلادی ڕۆمم
پشكنی، دی: چەلەبی هەر جـــەلەبی بوو، دەدە دەد[١٩]

لەســەر ئەم ڕێچکەیە بەردەوامە و، ئامۆژگاری ئەوکەسانە دەکات کە لە جەوهەری دین نەگەیشتوون و. ژیان بەدەروێشی دەبەنە سەر و پێیان دەڵێ:

نـزیـکە مـــــــــردنت ئەی پـیـــــــرە زاهیــــــــد
وەرە با تۆبە كـــــەین، ئیـــــتـــــر ڕیا بەس[٢٠]

مەحوی لە حەق بێژی لانادا و بەتەحەدداوە، بانگەشەی حەق دەکات و ئامادەشە لەو ڕێگە پیرۆزەدا گیانی خۆی ببەخشێ و دەڵێ:

هەتا حـەق ناصـرە، هەر حـەقـمـە مـەنظور
وەکـــو مـــەنصـــور، ئەگــەر بمكەن بەدارا[٢١]

مـادامـەكی هەر قـەسـیـدەیەکی بۆتە بەحری (أنا الحق)ی مـەنسـووری حەللاج، نەک تەنیا چاوەڕوانی ئەوە دەکات کە هەڵیواسن، بەڵكو لەباتی پاداشتی ئەو حەقەی کە داکۆکی لێدەکات، پێویستە لە دار بدرێ، ئەمە بەواجب لە قەڵەم دەدات و بوێرانە دەنگ هەڵدەبڕێ و دەڵێ:

لە حەق بێژی بووە بەحری (أنا الحق) هەر قەصیدێكم
لە باتیی جائیزە، واجب گەرا قەتلم بكەن واجیب[٢٢]

حەق بێژییەکەی زیاتر لەسەر ئەو زاهید و سۆفیانە بووە، کە بەناحەق خەڵکیان لە خشتە بردووە و کاری ساختەیان ئەنجام داوە و، لە ئەنجامدا بەشەڕ هاتوون و شەڕەکەش خێری ئەوکەسانەی تێدایە لەناویاندا مەحوی کە دەستەی دڵداران و، خوازیاری ئەوەیە کە هەردوولا تێدا بچن:

زاهید و صۆفی بەشەڕ هاتن لەسەر تەزویر و شەید
خێری ڕەندانە خودا کا بەر طەرەف بێ هەر طەرەف(٢٣)

مەحوی هەر تەنیا یەقەگیری واعیزی چەنباز و زاهید و سۆفی فێڵباز و ساختەچی نەبووە، بەڵکو ڕووبەڕووی ئەوکەسانەش بۆتەوە کە هیچیان لەبار دانییە و شانازی بەباو و باپیرانیانەوە دەکەن و، لەسەر حیسابی ئەوان خۆیان با دەدەن و بەلووت بەرزی دەڕواننە خەڵکی تر و، حەقیقەتی کەسایەتی خۆیان نایەتە بەرچاو. بۆیە پێیان دەڵێ:

فەضیلەی ئەصل و فەصل ئینسانی پێ نابێ بەصاحیب فەضل
کە تۆ کۆسەی، بە تۆ چی مامە ڕیشەی باب و باپیرت(٢٤)

ئەو وەسفەی مەحوی جوانترە و باڵاترە لەم دێڕە شیعرەی عەرەبی کە دەڵێ:

لاتقل أصلي وفصلي أبداً
إنّما أصل الفتى ما قد حصل

لە کۆتاییدا دەڵێم مەحوی ڕابەرێکی کۆمەڵایەتی، شاعیرێکی یاخیبووی شۆڕشگێڕ بووە، پەنجەی خستۆتە سەر گیروگرفت و دەردە کۆمەڵایەتییەکان، ڕووبەڕووی کار و ڕەفتاری ساختەکاری بۆتەوە، بانگەشەی بۆ حەق کردووە، وەک هەر شاعیرێکی کلاسیکی سەردەمی خۆی، جگە بەزمانی کوردی، بەزمانی باوی میللەتانی دراوسێی کورد شیعری نووسیوە، بەڵام هەرگیز زمانێکی دیکەی لا بەرزتر و باڵاتر نەبووە لە زمانی کوردی، هەمیشە وەک کوردێکی دڵسۆزی پاک شیعری بەکوردی نووسیوە و خەڵکی لە خەوی غەفڵەتا ڕاپەڕاندووە و ڕێنمایی کردوون و شانازی بەزمانی زگماک کردووە، تەنانەت لە قەصیدەی بەحری نووریشدا، کە هۆنراوەیەکی دوور و درێژی ئاینییە میللەتەکە و زمانەکەی خۆی بیرنەچۆتەوە و بۆیە بەکوردی دایناوە چونکە لە هەمزییە و بوردەدا سوودێکی کەمی تیایاندا دیوە بۆ کورد، بۆیە قەسیدەی نووری لە ڕیزی ئەواندا دادەنێ و بەم دێڕە شیعرە ئەم ڕاستییە دەردەبڕی و دەڵێ:

لە (همزيّة) و لە (برُدە)م چونکە کەم دی ئیستیفادەی کورد
منیش ئەم کوردییەم دانا لە ڕیزی ئەو قەصیدانە(٢٥)

دوا وتەم ئەوەیە کە نامەوێ لە ڕووی تەکنیکی شیعرەوە بچمە بنج و بنەماکانی هۆنراوەکانی مەحوی، بەڵام ئەوەندە دەڵێم نالی شاعیرە و مەحوی حەکیمە، هەر بەراوردێک لە نێوان ئەم دوو کەڵە شاعیرە و لوتکەی شیعری کلاسیکی دەبێ لەم ڕوانگەیەوە بکرێ و بەقووڵی و سەرنجی

ورد مامڵەتیان لەگەڵدا بکرێ.

**پەراوێزەکان**

١- دیوانی مەحوی (مەلا موحەممەدی کوڕی مەلا عوثمانی باڵخی) لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مەلا عبدالکریمی مدرس و محمدی مەلا کریم. چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا ١٣٩٧ک - ١٩٧٧ز، ل ١١ .

٢- هەمان سەرچاوە.

٣- دیوانی حاجی قادری کۆیی، گرد و کۆ و پەخشکار: گیوی موکریانی، چاپی سێیەمین ٢٥٨١ کوردی، ١٩٦٩زا، هەولێر ل ١١٨ - ١١٩ .

٤- دیوانی مەحوی ل: بیست و حەوت.

٥- کتێبی نالی، ڕێبوار سیوەیلی، چاپخانەی موکریانی هەولێر ٢٠٠١- ل ٧٠ - ٧١ .

٦- دیوانی مەحوی ل بیست و نۆ.

٧- دیوانی مەحوی ل ٢٥ .

٨- دیوانی مەحوی ل ٥٧ .

٩- الكتاب المقدس، إنجيل متى الاصحاح السادس.

١٠- دیوانی مەحوی ل ٩٢ .

١١- دیوانی مەحوی ل ٩٣ .

١٢- سەرجەمی بەرهەمی گۆران بەرگی یەکەم، دیوانی گۆران ١٩٨٠، محمدی مەلا کۆی کردۆتەوە و ئامادەی کردووە و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نووسیوە ل ١١٩ .

١٣، ١٤، ١٥، ١٦، ١٧ (دیوانی مەحوی) ل ١٨٧، ٣١٣، ١٩٣، ٣٣٤، ٣٣٧ .

١٨- دیوانی دڵدار، عەبدولخالق عەلائەددین.

١٩، ٢٠، ٢١، ٢٢، ٢٣، ٢٤، ٢٥- دیوانی مەحوی ل ١١٢، ١٢٠، ٨، ٥٤، ١٧٤، ٧٤، ٤٥٢ .

# دیاردەی ڕەنگ لەلای (مەحوی)ی شاعیردا

**نووسینی: مستەفا زەنگەنە**

کۆلێژی پەروەردە

## پێشەکی

ڕەنگ گرنگییەکی تەواوی لە ژیانی مرۆڤدا هەیە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە دەوروبەری مرۆڤ لەیەک پارچە ڕەنگی جۆراوجۆر پێک دێت، هیچ شتێک نییە کە ڕەنگی نەبێ، تەنانەت ئەو تەنانەش کە بەوە ناو دەبرێن کە ڕەنگیان نییە، ئەوانەش لەخۆیاندا ڕەنگن، ڕەنگ لە ڕێگای یەکێک لە پێنج هەستەکانی مرۆڤەوە بەسەر دەکرێتەوە، ئەویش چاوە، شانە تەشیلەکانی چاو بەرپرسی جیاکردنەوەی ڕەنگەکانن، هەر گرفتێک و نەخۆشییەک لەو تەشیلانەدا ڕوو بدات، مرۆڤ تووشی نابینایی ڕەنگ دەبێ، کەواتە ڕەنگ لەناو چاودا هەیە و لە مێشکدا جیا دەکرێتەوە، لە دەرەوەی چاوی مرۆڤدا شتێک نییە پێی بگوترێ ڕەنگ، گەرچی پەیوەندیی نێوان ڕەنگ و ڕووناکی، پەیوەندییەکی لەیەک دانەبڕاوە، بەڵام ئایا هەموو مرۆڤێک وەکو یەک ڕەنگەکان دەبینن؟ ئەگەر بێت و نەخۆشییەکانی نابینایی ڕەنگیان نەبێ، ئەوا ئەو کاتە دەتوانین بڵێین هەموویان ڕەنگەکان دەبینن، بەڵام وشەکانیان بۆ دەستنیشانکردنی پلەکانی ڕەنگ جیاوازە، چونکە ژمارەی وشەکانی ڕەنگ لە زمانەکانی دنیادا یەک نین، گەرچی هەموو مرۆڤێکی ئاسایی ئەو ڕەنگانە دەبینێ، بەڵام وشەی هەندە کەمن، کە ناتوانن بەژمارەی ڕەنگەکان بن.

مامەڵەکردن لەگەڵ ڕەنگدا، کارێکی هەند ئاسان نییە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە، کە وشەکانی ڕەنگ واتای فەرهەنگییان هەیە، جگە لەوەش واتای گشتییان هەیە، بەڵام لەهەموو گرنگتر ئەوەیە کە دەکرێ واتای کە لە وشەکانی ڕەنگ باربکرێ و لە بواری واتاسازیدا بەمیتافۆر ناو ببرێ، ئەم واتا خوازراوە بارکراوانە ناگیرێن، ناشکرێ بەئاسانی سنووریان بۆ دابنرێن، ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە هەموو شاعیر و نووسەرێک بۆی هەیە واتای تایبەتی بدات بەو وشانەی ڕەنگ، دیارە، ئەو واتا بەخشینەش وا دەکات بڵێین خودی ڕەنگەش واتاکەی دەگۆڕێ و شاعیر خۆی شتێکی نوێ دێنێتە جیهانی هەستەوەری کە ڕەنگە، لەلای کەسانی دی، ئەو واتایە بەئاسانی وەرنەگیرێ یان وەکو کارێکی سوریالی لە قەڵەم بدرێ. ئەندێشەی شاعیر بۆی هەیە شتی نوێ لەو ڕەنگانە و لە وشەکانی ڕەنگ ساز بکات. ئەمەش لەوەوە هاتووە. کە ڕەنگ خۆی واتای نییە، واتاکانی ئێمە بەخشیومانە، لە ئەنجامدا هەر نەتەوەیەک خاوەنی کۆمەڵێ واتای ڕەنگەکانن، بەڵام ئەمە ڕێگە لەوە ناگرێ کە کەسێک واتای نوێ بەو ڕەنگانە ببەخشێ، یان لە

ئەنجامی بەکارهێناندا لە بوارێکی واتاییەوە بیگوێزێتەوە بۆ بوارێکی واتایی دی. زۆر ئاساییە ئەو چۆن دەیبینێ یان خەیاڵی دەکات بەو شێوە لێکی بداتەوە، خۆ ئەگەر رێگە لەو گوزارشتە بگرین ئەوا ناکرێ، هەر ئەمەش وای کردووە ئەگەرەکانی رەنگێک کە بێ ژمارەن، لە ئەگەری واتاکانی وشەی رەنگدا بەدی بکرێن، شاعیریش بۆی هەیە رەنگە پۆزەتیفەکان بەنیگەتیف دابنێ و نیگەتیفەکانیش بەپۆزەتیف، ئەم بۆ بوونەش لە بواری تابلۆکێشانیشدا دەشێ، شیعریش تابلۆیە بەوشە، وشەکانیش رەنگن، رەنگەکانیش تێکەڵ بەهەموو شتێکن، کەواتە دەکرێ رەنگەکان بەپێی ئەو هەموو شتانە لێک بدرێنەوە.

## سنووری لێکۆڵینەوە

ئەم لێکۆڵینەوە تایبەتە بەو دێرە شیعرانەی مەحوی کە لە دیوانەکەی گوڵبژێرم کردوون، ژمارەی دێرەکان «٥٣» دانەن، ئەوە نەبێ وشەی رەنگی لە شوێنی کەدا بەکار نەهێنابێ، بەلاّم من تەنها ئەوەندەم هەڵبژاردوون کە تێکرای مەبەستەکانی مەحوی دەپێکن، جگە لەو «٥٣» دێرە شیعرییە پەلوپۆ بۆ نموونەی کە ناهاوین و مەحوی چۆنی فەرمووە ئێمە بەو چەشنە لێکی دەدەینەوە و هەوڵ دەدەین لە سنووری ئەو دەرنەچین نموونەکانیش. لە دیوانەکەی مەحوی وەرگیراون.

## خستنە روو

مەحوی یەکێکە لەو شاعیرانەی کە وشەکانی رەنگی زۆر بەکارهێناوە، کە رەنگە لەلای زۆربەی هەرە زۆری شاعیرە کلاسیکیەکان بەو شێوەیە نەبێ. بۆ نموونە سەیری ئەم نموونانە بکە.

ظالمی دڵ رەقی روو گرژی موسڵمان ئازار
هەر بەئیذایە کە رەنگی بگەرێتە روخسار
بەرد ئەگەر سەرنەشکێنێ بەچی روو رەنگین کا
کە لە پێ هەڵچەقی ئەوسا روخی گوڵناریە خار
ل:٣٣٧

مەحوی دەڵێ خۆشەویستی من هەمیشە دڵرەق و روو گرژە بەرانبەر بەمنی موسڵمان و قەلەندەر، دیارە بەو ئازاردانەی من رەنگی جوانی دەگەرێتەوە روخساری و دڵی پێ خۆش دەبێ، ئەمەش وەکو ئەوە وایە کە بەرد چۆن رووی رەنگین دەبێ ئەگەر سەر نەشکێنێ و خوێناوی نەبێ، هەروا درکیش کاتێک رووی سوور و جوان دەبێ، کە لەپێ دەچەقێ و ئازاری کەسانێک ئەدات.

ئەرێ دڵ بێ شەرابی لەعلی گوڵ رەنگت لە گوڵ چبکا ؟!
کە جیلوەی گوڵ لەگوڵشەندا نەبێ بولبول لە چل چبکا ؟!
ل:١٣

دیاره شەراب خۆی نەشئە بەخشە، مەحوی دەڵێ، دڵی من چی بکا لە گوڵ و گوڵی بۆ چییە، لە کاتێکدا ئەگەر شەرابی لێوی سووری وەک گوڵت لەمن دوور بێ، کەواتە من شەرابی لێوی سووری تۆم دەوێ، نەک ڕەنگی گوڵ، چونکە بولبول چی لەچڵی ڕەق و تەقی درەختەکان بکات لە کاتێکدا شنە و جوانی گوڵ لە گوڵشەندا نەبن.

چ حاجەت نەرگسی مەستت بکەم وەسفی بەمەخمووری
کە چاوێ سورمە کێشراوی خودابێ لە کل چبکا؟
ل:١٥

چاوی نێرگسی مەستت پێویستی بەوە نییە بڵێم خەوی لێ شکاوە، چونکە چاوی خۆی کلڕێژی دەستی کردگارە و پێویستی بەکل نییە، دەربڕینی (کە چاوێ سورمەکێشراوی خودا بێ) بەبێ ناوهێنانی وشەی (ڕەش) واتای ڕەشی دەگەیەنێ، ئەمەش ئەوپەڕی جوانیی بەکارهێنانی واتای خوازراوە کە سەرچاوەکەی لە وشەی (سوورمەکێشراو)ەوە هاتووە، بەواتای بەکل ڕێژراو.

دوو ئەسپە مەنزڵت پێ طەی دەکەن تاسەر حەدی مردن
بەدیقەت (مەحویا) تێفکرە، شەو شەبدێزە، ڕۆژ ئەشهەب
ل:٣٠

دەڵێ لە دنیادا تا ڕۆژی مەرگەسات، دوو ئەسپ هەن ئەم جیهانەت پێ دەگێڕن (مەحوی)، ئەو ئەسپانەش یەکێکیان شەوە و ئەوی دیش ڕۆژ، دیارە لێرەدا ئەسپی شەویش ڕەنگی (شەبدێز) دەبێ، چونکە لە تاریکیدا ڕەنگ نییە، لێرەشدا ئاماژەیە بەئەسپی شەبدێزی خوسرەوی پەروێز، ئەسپی ڕۆژیش کوێتە، کەواتە ژیان لە دوو ماندوو بوون پێک دێ، نابێ مرۆڤ بەفریو بچێ. شەبدێز و ئەشهەب دوو وشەن بۆ ڕەنگ ولاغی بەرزە بەکاردێن، کە لە زمانی فارسی و عەرەبییەوە وەرگیراون.

زوشت و ناشیرینە پیر، ئەمما چ شیرینە ئەگەر
چاوی خوێناوی نەدامەت ڕیشی خورمایی بکا
ل:١٩

مەحوی دەفەرموێ، کە مرۆڤی پیر ڕوخساری ناشیرین دەبێ و لەسەر جوانییەکانی گەنجێتی نامێنێ، بەڵام پیر کاتێک جوان دەبێ و شیرین دەبێ ئەگەر بێت و فرمێسکی خوێنینی پەشیمانی لە گوناهەکانی ڕابوردووی ڕیشی چەرمگی تەڕ بکا و بەڕەنگی خورما سوور هەڵگەڕێ. ئەم دێڕە شیعرە جوانترین تابلۆی نیگارکێشێکە کە گوزارشت لە پەشیمانی بکات.

بەنیلەبێ نەباتی میصری لێوت
جلم، سوبحم، هەموو هەر شامە بێ رووت
ل:٨٢

مەحوی وشەی (بەنیلە)ی بۆ واتای شین و تازیەمانی بەکارهێناوە، نەبات شەکرێکی کلۆی سپیی شیرینە، کاتی خۆی زۆربوو وەکو نوقڵ وابوو، لە کاتی ڕێزگرتندا بۆ چا خواردنەوە وا دادەنرا. کەواتە ماچی شیرینی وەک میصری لێوت، بەشین و تازیەمانی بکەویتەوە، چونکە ڕۆژو بگرە بەرگەکەشم وەکو خاڵی ڕەش، ڕەش و تاریکە.

نیلە: بەواتای شین و تازیەمانی، بەواتای شینی ئاوی نیلی وڵاتی میسریش دێ کە مەبەست ڕەنگە شینەکەیەتی.

شام: بەواتای (خاڵی ڕەش) یان، (ئێواران) کە تاریک دادێ و دنیا ڕەش دەبێ.

بەسەر ڕوخساری زەردا جۆگەلەی کێشاوە ئەشکی سوور
بەیادی سەرووی باڵایەک ئەوەندەم شین و زاری کرد
ل:١٠٨

ڕوخساری زەرد: دەم و چاوی زەرد هەڵگەڕاوی دەستی عەشق و خۆشەویستی کەواتە: نەخۆشی.

ئەشکی سوور: فرمێسکی خوێنین، کەواتە سوور بەواتای خوێن بەکارهاتووە.

شین: بەواتای، شیوەن و تازیباری.

واتای دێڕەکەش دەڵێ: بەسەر دەم و چاوی منی نەخۆشی مەستی عەشقدا کە زەرد هەڵگەڕاوە، فرمێسکی خوێنینم جۆگەلەی کردووە. چونکە من هەمیشە لە یادی خۆشەویستی باڵا وەک سەروودا لە گریان و شیوەندام.

بەخوێنم تینووە بانۆشی کات و نۆشی بێ ئەما
لەسەرچی، تۆ بڵێ، ئەو لێوە مۆرە وا لەمن بوو سوور
ل:١١٨

لێوی مۆر: واتە داخراو، قفڵ کراو، هەمیشە نەدوو

لەمن بوو سوور: زۆر بڵێ و لەسەر چوون پێ داگرتن

دەڵێ، ئەگەر دلبەرم تینووی نۆشینی خوێنی منە، با بفەرموێ و بیخواتەوە، (با بمکوژێ)، بەڵام با من هەندە بزانم لەبەرچی ئەو دەمە داخراوەی لە خەڵکی، هەمیشە لەمن سوور و زۆر بڵێیە و خراپەم دەڵی.

بەزەرد و سووری دنیا زەردەواڵەت لێ نەگۆڕابێ
بەهەنگی تێ بگەی، هەرنێشە، نۆشێکی نییە زەنبور
ل:١٣٠

زەرد و سووری دنیا: بەواتای شتی جوانی بەرچاوی، ئێستا بۆ منداڵی جوانیش بەکاردێ.

دەڵێ: شتی ڕەنگاوڕەنگ و لەبەر چاو جوانی دنیا، نەکات زەردەواڵە (کە زەرد و سوورە) لێت بگۆڕێ و بەهەنگی بزانی، چونکە زەردەواڵە تەنها چزووی هەیە و پێوە ئەدات و هەنگوینی نییە پێتی ببەخشێ کەواتە بەشتی جوان هەڵمەخەڵەتێ ئەگینا زەرەرت پێ دەگەیەنن.

له ئیعجازی موحەببەت چار فەصڵم جوملە بۆ جەمعە
سروشکم سوورە، ڕەنگم زەردە، لێوم وشکە چاوم تەڕ
ل:١٣١

له موعجیزەی خۆشەویستی کە هەموو وەرزەکانی تەمەن و ساڵی لەیەک وەرزدا بۆ کۆکردوومەتەوە، ئەویش وەرزی ئازارە، لەبەر ئەمەشە فرمێسکم خوێنە و ڕەنگم زەردە (نەخۆشم، لێوم وشک بووە و چاوەکانم هەمیشە بەگریانن).

سروشکم سوورە: بەواتای فرمێسکی خوێنین
ڕەنگم زەردە: نەخۆشم

سیاپۆش، لە داخی خەطط و خاڵ و لێو و ڕوو زوڵفت
وەنەوشە و میسکی چین و ئاوی خضر و لالە و عەنبەر
ل:١٣١

سیاپۆش: ڕەش پۆش: تازێ بار
دەڵێ لە خەم و داخی خەت و خاڵ و لێو و ڕوخسار و زلْفت، وەنەوشە و میسکی چین و ئاوی حەیاتی خضر و لالە و عەنبەر ڕەشپۆش و تازێ بارن چونکە هەموو کە تۆیان بینی هەند جوانی، ئەوان بۆ نەمانی جوانییەکانی خۆیان ناچار مان ڕەش بپۆشن.

کە ئەو لێو و ددانەم دی بەجاڕێ
لەبەر چاوم هەموو لەعل و گەوهەر کەوت
ل:٨٧

لەعل: مەبەستی سوورییەکەیەتی،
گەوهەر: مەبەستی سپێتی گەوهەرەکەیە
دەڵێ کە دیم لێوت هەندە سوورە، سووری لەعلم لەبەر چاو کەوت.
کە دیم ددانت هەندە سپییە، چەرمێتی گەوهەرم لەبەر چاو کەوت.

دەمت چی؟ پڕ لە دوڕ، دورجێکی یاقووت
نیشانە و مۆری چی؟ خەططێکی زمڕووت
ل:٨٠

پڕ لە دوڕ: پڕە لە ددانی وەکو دوڕ سپی

دورجێکی یاقووت: سندووقێک یاقووتی سپی تێدا دابنرێ

نیشانە و مۆری چی: مۆر بەواتای هەڵنەپچڕاو و کارخانە

دەڵێ: دەمت پڕە لە ددانی وەکـو دوڕ سـپـی، بۆیە دەکـرێ دەمت بەقـوتووی هەڵنەپچـڕاوەی یاقـووت دابنێین، یان، نیـشـانەی سـەرمۆری دەمت دەکـرێ خەتێکی شـینی زمرووت بێ، چونکە جاران نیشانەی دەس لێ نەدان و نەکراوەی قوتوو، مۆرێکی شین بوو لەسەر قوتووە دەدرا. بۆیە (سەرمۆر) بەواتای هەڵنەپچڕاو دێ.

نەخـۆشی عـیـشـقی لێـوت وەصـیـەتی کـرد
بـتـــــاشـن داری عـــــــونـنـابـی بەتـابـووت
ل: ٨٠

داری عـوننابی: بەواتای داری سووری عـوننابی، مـەبەست نیـشـانەی شـەهیـد بوونی ڕێگای عەشقە.

دەڵێ: من کە نەخۆشی دەستی ئەو لێوە جوانانەی تۆم، وەسیـەتی ئەوەم کرد کە تابووتێکم بۆ بتاشن لە داری سوورعونایی، چونکە دەزانم لەم عەشقەدا دەمرم و بەشەهید لە قەڵەم ئەدرێم.

قـــوبـوڵم کـــەی ئەگـــەر، لـوطفـــێکی زۆرە
بەکــەمـــتـــر هیندوێکی، خـــاڵی هیندووت
ل: ٨٠

بەکـەمتـر هیندوێکی: کەواتە کـەمتـر لە کـۆیلەیەکی ڕەش، چونکە هیندییـەکـانیش وەکـو ئەو کۆیلانە ڕەشن.

خاڵی هیندووت: خاڵی ڕەشت.

لێرەدا وشەی هیندووی بە دوو واتای ڕەشی جیاواز بەکارهێناوە (عەبدی ڕەش و خاڵی ڕەش) کەواتە دەڵێ:

تۆ لوتفێکی زۆرم لەگەڵدا دەکەی، ئەگەر بەکـۆیلەیەکی ڕەشی خاڵە ڕەشەکـەی خـۆتم قبـووڵ بکەی.

تا لە دەوری لێـوی ئاڵی خـەططی سـەبزی بوو عـەیان
عـــاشـــقـــان جـــوملە وەک بەنگی دەبینم گـێـژ و وێژ
ل: ١٤٢

هەر کە گەنەمووی دەوروبەری لێوی یارەکەم دەرکەوت لە جوانیدا، هەموو دڵدارەکانی کە وەکو بەنگکێش بەسەرخۆشی و گێژ و وێژی دەبینم.

خـەططی سـەبزی: لێـرەدا مـەبەست شـینە، چونـکە ئافـرەتی جـاران دەسکاریی دەم و چاویان

نەدەکرد، ئەو گەنەمووە باریکانەی لە دەوری لێویان شین دەبوو بەمایەی جوانی لەقەڵەم ئەدرا.

وەک داغی غەم نییە سپییە داغی ئینتیظار
چاوم ببینە، چاوە؟ کە موطبیقییەتی بەیاض
ل: ١٥٧

خەم کە مرۆڤ داغ دەکا و شوێنەوار بەجێ دێڵێ، وەکو داغی چاوەنواڕی نییە، چونکە چاوەنواڕی زۆر کوێربوونە، بەڵگەش بۆ ئەمە فەرموو بزانە چاوی من، چۆن تانەی سپیی بەسەر داهاتووە و کوێر بوومە.

سپیی: بەواتای کوێری هاتووە

هەتا تۆ چوویە گوڵشەن، گوڵ بەبێنی مسکی زولفت کەوت
کەوا ئەو ڕەنگە خۆشەی سیس و هەم بێنی بووە ضایع
ل: ١٦٥

کە تۆ چویتە گوڵشەن، گوڵ کەوتە بۆنی زولفت کە خۆی مسکە،
لەبەر ئەمەش بوو گوڵ ڕەنگی جوانییەکەی خۆی لە دەسدا و بۆنیشی نەما.
ئەو ڕەنگە خۆشە: ئەو ڕەنگی ڕوخسارە جوانەی گوڵ.

عیشق ئاگرێکە بەربووە هەرکەس دەبێ بەکەس
گەر ڕۆژە ڕەش وەکو شەوەبێ بوو بەچراغ
ل: ١٧١

ڕۆژە ڕەش: ڕۆژی پڕ لە مەینەت و نەگبەتی و ناخۆشی و لێ قەومان.

دەڵێ، ئاگری عەشق لە هەرکەسێ بەربێ، ئەوا ئەو کەسە ئەو کاتە دەبێتە کەسی ڕاستەقینە، چونکە کانزا لە ئاگردا پاک دەبێتەوە و دەردەکەوێ کە چەند بێ غەل و غەشە. گەر ڕۆژیشی ڕەش بێ، ئەوا دەبێتە چراخان و دەدرەوشێتەوە و ڕووناک دەبێتەوە، چونکە نووری عەشق لە هەموو ڕووناکییەک ڕووناکترە.

دەستی حەنا نیگار و، موژە و چاوی سورمەدار
بۆ غەیری خان و خانمە فەندی نییە موساغ
ل:١٧٢

حەنا نیگار: بەخەنە نەخشێنراو
موژە و چاوی سورمەدار: برژانگ و چاوی ڕەشکراو
دوو شیواز بۆ ڕەنگ بەکار هاتوون. بەبێ ئەوەی ناوی وشەکانی ڕەنگی بەکار بردبێ.

لالغـاوەی واعـیظ ئەمـڕۆ مـەوج ئەدا، دەم پڕ لە کـەف
ڕیشی قـیـروسـیـا کـتـێـبی وەعظەکـەی بۆ بەر تەرەف
ل: ١٧٤

ڕیشی قـیـروسـیـا: لێـرەدا قـیـروسـیـا بە دوو واتا هاتـووە، یەکـەمـیان بەواتای گـرنگ نییـە، دووەمـیش بەواتـای ڕەشـە وەک قـیـر، کـەواتە پیس و چڵکنە و ڕەشە وەکـو ڕەشی قـیـر و ڕەشی تەنی.

ڕوتبـەی کـەمـاڵە، ڕۆژە ڕەشی بۆ جگەر بەخـوون
ناکـامـە تاکـە ڕەش نەبووە خوێنی خامی مـسک
ل: ١٨٨

بۆ مرۆڤی جگەر بەخوێنی عـیشـق، ڕۆژە ڕەشی ئەو ڕوتبە و ناونیـشـانی پێگەیشـتـنی، چونکە ئەو خوێنە سوورەی لە نافـەی مامزی خەتاو خوتەندا هەیە بەناکام و پێ نەگەیشـتـوو دادەنرێ، کاتێ کامڵ و بۆن خۆش دەبێ کە ڕەنگی ڕەش بێ، کەواتە ڕەش نیشانەی کامڵی و پێگەیشتنە.
ڕەش: بەپێگەیشتن و کامڵی

وتـی: بـۆچـی وەهـا بـێ تـین و بـێ ڕەنـگ
وتم: تۆ بۆچ ئەوەندە شـۆخـیـی و شـەنگ؟
ل: ١٩٨

بێ ڕەنگ: نەخۆش، ڕەنگ هەڵبزڕکاو، زەرد و زەعیف

یەکێ عـاشق بەخـوو، یەکێ طالیـبی ڕوو
یەکێ مـەجـبـووری بۆ، یەک مـایلی ڕەنگ
ل: ١٩٩

مایلی ڕەنگ: حەز بەجوانی کردن، ڕەنگ بەواتای جوانی بەکار هاتووە.

لە چاوم خـوێنی جـاری کـرد و هەم ڕەنگی لە ڕوو بردم
ئەم ئاشـووبی دڵ و دینە بەلێـوی ئاڵ و چاوی کـاڵ
ل: ٢٠٢

ڕەنگی لە ڕوو بردم: ڕەنگی تێکدام و نەخۆشی خستم
لێوی ئاڵ: لێوی سوور
چاوی کاڵ: کاڵ بەواتای کەمی توخمەکانی هەر ڕەنگی، کاڵ سیفەتێکە دەدرێتە پاڵ ڕەنگ، لەم حاڵەتەدا بەدژ واتای (تیر- تۆخ) دێ.

بەغـەمزەی نـازەوە ئەو سەروی نـازە کـەی چووە گـوڵشـەن
کـە نێـرگـز وا بـووە چاوی سـپی، سـەرووی بووە تۆپاڵ
ل: ٢٠٣

چاوی سپی: بەواتای کوێربوون دێ

دەڵێ: ئەو باڵا سەرووە بەنازە کەی چووە گوڵشـەن و غەمزەی چاوی کرد، ئیـدی نێرگز کـوێر دەبێ و باڵای دەشکێتەوە و دەبێتە تۆپەڵ.

بنا گـۆشی لە چینی زوڵـفـیـا دەرکـەوتبـوو دەتووت
ئەمـە بازی سـپی صـوبحـە، چووە بن بـاڵی زاغی شـام
ل: ٢١٧

بازی سپی صوبح: بەدوو واتا هاتووە، سپێدەی بەیان، بازی سپیی لە دەمەو بەیاندا کە خۆر لێی ئەدا و ئەچریسکێتەوە.

زاغی شام: بەواتای قەڵەڕەشی شام (سوریە)، بەواتای قژی ڕەشی وەکو تاریکی شەو.

کەواتە، سپێتی بنا گوێیەکانی، لە تۆی چین چینی زوڵفیا کە دەرکەوتبوو دەتووت، سپێدەی بەیانە و چۆتە بن باڵی شەوەوە.

لە ڕوو سووریی عیبادەت لام ڕوو زەردی خەجاڵەت مام
بەناوی سـێـوی ناوم باغـەوان و، من بەهێ دەگـرم
ل:٢١٨

ڕوو سووری: بەواتای سەربەرز لە دەرگای خودا و لەلای مرۆڤ

ڕوو زەردی: شەرمەزاری دنیا و قیامەت

لە باغی سێـو و بەی دا باسی ڕوخسـار و چەنەی کـەی بوو
خەجڵ ما سێو و، بەی ترسا، کەوا ئەو سوورە ئەم زەردە
ئەگەر چی من گەدام، ئەو شا، لە عورفی عەشقدا «مەحوی»
بەسە نیسبەت لە بەینا، من سیابەخت، ئەوسیا چەردە
ل: ٢٧٢

سـوور و زەرد: بەواتای ڕەنگەکـانی خـۆیان بەکـارهاتوون بەڵام کـینایەن بۆ (شـەرمکردن کـە سوورییە) بۆ ترسان کە (زەردییە)

سیا بەخت: بەخت ڕەش: نەگبەت

سیا چەردە: خاڵی ڕەش

کەواتە نێوان یەکێک بەختی ڕەش بێ کە (مەحوی)یە و یەکێک خاڵی ڕەشی بێ کە (دولبەرەکەیەتی) جیاوازییەکی گەورە هەیە و ڕێژە لە نێوان ئەم دوو حاڵەتەدا هەر نییە.

ئاهووی خوتەنە جیلوە دەکاتن لە خەطادا
یا چاوی ڕەشی فیتنەگەری سوورمەکەشانە!
ل: ٢٨٠

چاوی ڕەش: ڕەشی سیفەتی جوانیی چاوە.
سوورمەکەشان: کلرێژ، بەکل ڕەشکراو دێ.

لە ڕۆژی هەڵدرا ئەو کۆنە خەیمەی تان و پۆشینە
لە سایەیدا شەرابی بەزمی عوشرەت گریە جۆشینە
دەبینی جێیەک ئەمڕۆ بەزمی عەیش و بادە نۆشینە
سبەینێ زوو زەمانە وەضعی گۆڕیوە، لە نۆ شینە
لە کێ پرسم دڵی بۆ پڕ لە خوێنی حەسرەتە یاقووت
عەزا پۆشی چییە و کێیە؟ جلی پیرۆزە بۆ شینە!
ل: ٢٨١-٢٨٢

خەیمەی تان و پۆشین: ئاسمانی بەرین کە ڕەنگی شینە
لە نۆشینە: سەرلەنوێ تازێ و شینە، خەریکی بەزمی ژیان و خواردنەوەیە
عەزا پۆش: جلی ڕەشی عەزیەتباری پۆش
پیرۆزە: ڕەنگێکە لە گرووپی ڕەنگی شین

لە سەیری خەستەخانەی عیشق، ئەوی سەوزەی کەوا شینە
لەسەر هەر خەستەدێ یا خوێندنێ یاسینە، یا شینە
ل:٢٨٣

سەوزە: ئەسمەرێکی خوێن گەرمی مەیلە و سپی
یا شینە: مەبەست شیوەنە. «بەواتای پیتی شینیش دێ کە نیشانەیە بۆ شین و شەپۆڕ.

شەهیدی غەمزەیە بەعضێ، سەقیمی عیشوەیە جەمعێ
دیارە سەر نوبشتی ئەهلی دڵ یا شینە یا سینە
ل: ٢٨٤

هەندێ کوژراوی غەمزەی چاون و، کۆمەڵێکیش نەخۆشی دەستی عیشوە و نازن. دیارە چارەنووسی دڵدارەکان، یان شیوەن و گریانە بۆ دولبەر، یان ئەوەتا مردوون و یاسینیان دەخوێنن.

دەرد و داغــێکی دەروونی، گــەر ببێ یا ڕەنگ و ڕوو
سیس و موغبەربێ. کە ماڵم بۆ جەماڵم بۆ چییە!
ل: ٢٩٢

ڕەنگ و ڕوو: بەڕەنگی و بێ ڕەنگی ڕوخسار، بەواتای خولّقیش دێ.
گەر خودا دەردوداغی دەروونیم بۆ بنێری، با ڕەنگ و ڕووشم سیس و
گەرد لێ نیشتووبێ، چونکە من نەماڵی دونیام، نەپێگەیشتنم بۆ جوانیی خۆم نییە.

سەنەد و بێ مۆر و خەط دەعویی مەحببەت کردنە (مەحوی)
تەعەشـــوق بێ دڵێکی داغــدار و ســـینەیی ڕێشی
ل: ٣٠٤

سەنەد: قەباڵەی خاوەنێتی زەویوزار و موڵکی دنیایە، سەنەدیش بەخەت دەنووسرێ و مۆر دەکرێ تا یاسایی بێ و تەسدیق کرابێ. بۆیە مەحوی دەڵێ سەنەدی دەعوا چیی خۆشەویستی دڵێکی پڕ خەم و بریندارە،
ئەگینا بێ ئەم خەت و مۆر کردنە، سەنەدەکە ناخوا و پووچ و بێ بەڵگە دەبێ.

تەرسـا بەدینی ئەو یەدی بەیضـایە بوونە جــووی
بۆ کــوشــتنم کــە دەســتی کــە دەرێنا لە باخــەڵی
ل: ٣٠٧

کاتێ خۆشەویستی من دەستی لە باخەڵی دەرهێنا بۆ ئەوەی بمکوژێ، کەچی لەو کاتەدا مەسیحییەکان ترسان و چوونە سەر ئایینی خۆشەویستەکەم هەروەکو چۆن لە کاتی خۆیدا جوولەکەکان کە دەستی درەوشاوەی حەزرەتی مووسایان بینی و چوونە سەر ئاینەکەی ئەو.
یەدی بەیضا: دەستی سپی، ئاماژە کردنە بۆ دەستی حەزرەتی مووسا.

کەچ ئەبرۆ، دیدە ئاهو، شۆڕشین خوو، فیتنەجۆ، تورکێ
خورۆش و شۆڕ و شینی خستە ناو ئەهلی نەظەر لە نوێ
ل: ٣١٥

شین: بەواتای شیوەن و ماتەمینی

لالە ڕوخســارم لە ســایەی ئەشکی خـوێنی ڕەنگەوە
چونکە ڕوو سوورم لە قاپیی عەین و شین و قاف و تێ
ل: ٣٢٣

لالە ڕوخسار: ڕوو سوور

ئەشکی خوێن: فرمێسکی خوێنین (سوور)

ڕوو سوور: سەر بەرز

لەبەر ئەوەی فرمێسکم خوێنینە و بەڕوومدا دەڕژێ، لە سایەی ئەوەوە ڕوخسارم سوورە و لە دەرگای (ع+ش+ق+ت) عشقتدا سەربەرزم.

ڕەشێ بۆ کوشتنی یەک ڕووڕەشێ بەدەستەوە بوو
بەدزیەوە وتی: فتوادە، ڕوخصەتم فەرموو
وتم: کە دەردەکەوێ زووکە ئەم غەزاکەرە تۆی
بەدەستی سەوز و سپی، بوونەوەی جەماڵ و ڕوو
ل:٣٥٢

ڕەشێ: مەبەستی کابرایەکی ڕەش پێستە، بەواتای (عەوام) دێ.

ڕووڕەش: پیاوخراپ

بەدەستی سەوز و سپی: دەستی سەوز: دەستی پیرۆز، دەستی سپی: بەواتە دەستی حەزرەتی موسا.

کەواتە کابرایەکی عەوامی ڕەش پێست هات و داوای فتوای لەمن کرد کە کابرایەکی ڕوو ڕەشی خراپەکار بکوژێ. منیش پێم گوت ئەو غەزاکەرە گەر تۆ بی ئەوا ئێستا دەستت سەوز دەبوو، وەکو موسایش دەستت سپی دەبوو.

کە شایەد بێتەوە بۆ سەیری شینی ئەم سیابەختە
بەمەرگی مەحوی ئەی نەی ناڵەیێ وەی دەف خرۆشێکە

شین: شیوەن و ماتەمینی

سیابەخت: بەخت ڕەش و نەگبەت

لە شینی فیرقەتی ئەودا ئەوەندە ئەشکی سوورم ڕێت
بەدەوری جێگەما تا بڕ دەکاتن دیدە گوڵزارە
ل: ٤٦٢

شین: شیوەن و ماتەمینی

ئەشکی سوور: فرمێسکی خوێنین

ئەگەرچی مودەتێکە من لە ظوڵماتی سیابەختێ
ونە، ذەڕڕەی وجودم، ڕۆژی ڕووناکم شەوی تارە
ل: ٤٦٦

سیابەختێ: بەخت ڕەشێک

شەوی تار: شەوی تاریک و ڕەش

لەبۆ سەیرانی باغ و سەبزە تەکلیفم مەکەن یاران
کە سەبزە و گوڵ لە چاومدا بەبێ ئەو هەر خەس و خارە
ل: ٤٦٣

سەبزە: شینایەتی، باغ و دەشت و دەری سەوز

لەو ڕۆژەوە جودا بووە لێم ئەو پەری وەشە
ڕۆژم ڕەشە شوعور و دڵم لێ بووە جودا
ل: ٧

لەو ڕۆژەوە ئەو پەری ڕوخسارم لێ جودا بۆتەوە، ڕۆژم ڕەشە و پڕە لە مەینەتی و هەست و دڵم لەلای خۆم نەماون

وەرە دەستێ بەخوونم کە نیگارین
خوێنی من خەڵاتت بێ نیگارا
ل:٩

نیگارین: ڕەنگاوڕەنگ

ئەشکەوتی دەمی بایەکە دەمی (واعیظ) کە دێتە وەعظ
وەقتی سکوتی نەقشی سمێڵی لەقوو دەکا
ل: ٢٧

لەقوو دەکا: ڕەش و سپی بەوێنەی باڵندەی قوو

دەم و زارێ بیامابێتەوە ڕەنگاری ڕیق ئەمما
پیاڵێکی عەقیقە، پڕ لە بادێکی عەقیق ئەمما

ڕەنگاری ڕیق: خۆشاو و پاشماوەی تفی دوای ماچی خۆشەویست

پیاڵێکی عەقیق: پیاڵەیەک سوور وەکو ئاقیق

**ئەنجامەکان**

١- هەست بەڕەنگکردن لەلای مەحوی زۆر بەهێز بووە و بەسەرچاوەی جوانی دایناوە.

٢- جیهانی سۆفیگەری لە ڕەنگ بێ بەش نییە، ئەگینا مەحوی وشە و واتاکانی ڕەنگ لەو دێرانە دا بەکار نەدەهێنا کە دەچنە ناو سۆفیگەرییەوە.

٣- مەحوی جگە لە واتا و وشەکانی ڕەنگی کوردی واتا و وشەی ڕەنگی عەرەبی و فارسیشی

بەکارهێناوە.

٤- هەندێ دەربڕینی ئاینی لای عیسای و ئاینەکانی کەی جگە لە ئاینی ئیسلام، وشە و واتاکانی ڕەنگیان بەکار بردووە، مەحویش لەو دەربڕینانە ئاگادار بووە بەحوکمی ئەوەی ئاماژەی پێ کردوون.

٥- ڕەنگ جگە لە هۆکاری تەندبار کردن و بەرجەستە کردنی شتەکان بەلای مەحوییەوە خۆی گرنگییەکی هەیە، ئەو گرنگییەش لە ژمارەی دووبارە بوونەوەی وشەکان و واتاکاندا بەدی دەکرێن.

## سەرچاوەکان


١- هەژار: ١٣٦٩ ک، هەمبانە بۆرینە، فرهەنگ-کردی-فارسی، یک جلدی، تهران، انتشارات سروش.

٢- مەلا عەبدولکەریم مودەڕیس: ١٩٨٤، دیوانی مەحوی.

٣- احمد مختار عمر: ١٩٨٢، اللغة واللون، کویت.

## کاتێ (مەحوی) وێنەی سەردەمی خۆی بەوشەی ڕەنگاوڕەنگ دەکێشێ!

**ئەحمەد سەلام**

«بەحــەق هەر حــەق، بەناحــەق ناحــەقم وتووە لە ڕۆژێ بووم
وەکـو (مـەنسـوور) ئەگـەر بیـشـمکوژن ناکـەم لە حـەق لادەم»

هەر ئایین و مەزەبێک یا هەر تیۆر و فەلسەفەیەک بگری پەیڕەوکارانی ڕاستەقینەیان هەمیشە بەو نیـازەوە ئەو ڕێبـازە لە ئامـێز دەگـرن و ئاشـقـانە وە دووی دەکـەون تا لەو ڕێیـەوە بتـوانن خزمەتێکی باش بەکۆمەڵەکەیان بگەیەنن.

دیارە ئاشکرا و ڕوونە لای هەمـوومـان کـە هەر نووسـەر و شـاعـیـرێک بگرین دەبینین لەڕێی بەرهەمـەکانیـانەوە بوونەتە شایەدی سەردەمی خۆیان، بۆیە دەبێ هەمیـشە بەو حیـسابە بڕوانینە شـاعـیـران و نووسەرانمان کە، کەسانێکن زادەی بیریان ئاوێتـەی زادەی بیروبۆچوونی کەسـانی سـەردەمـانی خـۆیان بوون، تەنانەت دەشێ هەندێکیـان کـاریگەرییـان لەسـەردەمی خـۆیشـیـان تێپەڕاندبێ، بەڕادەیەک بەرهەم و ڕەفتاریان بۆتە زاد و توێشەبەرەی سەردەمانی دوای خۆیشیان.

وتی: مـیـوەی بەهەشـتـە شـیـعـری (مـەحـوی)
خـــــــــودا نـەبـڕی لـە بـاغـم داری بـەردار

مامۆستا کاکەی فەللاح دەربارەی مەحوی دەڵێ:

(هیچ شـاعـیرێکی ئەو سەردەمـەمان وەک مەحـوی بایەخی بەلایەنی کۆمەڵایەتی کوردەواری نەداوە و (کـەسـیـان وا بوێرانە) و بەجـەرگـانە نەچووە بەگـژ داروباری زۆرداری و سـتـەم و زۆر کاروباری نارەواوە، کە لەژێر پەردەی ئایین و بەناوی ئایینەوە بۆ سوود و بەرژەوەندی تاکە کەسی و دەرەبەگی کراوە).

لە عـاریف عـامـیـیـەک پرسی هەواڵی مـەسلەخ و قـەسـسـاب
بە ئەنگوسـتی شـەهادەی کـرد ئیـشـارەی مـەحکەمـە و نائیب

مامۆستا (کامل ژیر)یش ڕایەک دەربارەی (مەحوی) دەردەبڕێ و دەڵێ:

« بێینەوە سەر مەحوی بزانین بە پێوانەی (واقیع) مەحوی هەستیار(شاعیر) چۆن چۆنی ئەبێ هەڵسەنگێندرێت؟ چۆن چۆنی ئەبێ سەیری مەحوی بکەین، ئایا ئەبێ سـەیری مـەحوی بکەین وەک خۆی کە هەبووە، یان وا سەیری بکەین وەک ئێمە بمانەوێت بووبێت؟».

بۆ وەڵامی مامۆستا (ژیر) مەحوی شاعیر هەردوو پرسیارەکە بە دوو وەڵامی حازربەدەستانە دەداتەوە ئەوەتا لە وەڵامی پرسیاری یەکەمی (ژیر)دا کاتێ دەپرسێ (ئەبێ سەیری مەحوی بکەین وەک خۆی کە هەبووە) مەحوی دەڵێ:

چبکەم، نە ئەو کەسەم کە کەسم بێ لە لا بەکەس
خۆشم نەگەیمە ئەو کەسە ئەو من بکا بەکەس

بۆ وەڵامی پرسیاری دووەمی مامۆستا (ژیر) کە پرسیویەتی (یان وا سەیری بکەین وەک ئێمە بمانەوێت بووبێت؟)

شاعیر هەر لەم قەسیدەیەیدا وا وەڵام دەداتەوە:

گەر ئیشی ڕۆحتە، کە نەبوو کەس بەدەستەوە
دەست هەڵگرە لە ڕۆح و مەبە ئیلیتجا بەکەس

هەر شاعیرە و بۆ خۆی مەبەستێکی بە زەقی کردۆتە پێخۆری شیعرەکانی و لە پاڵ هەموو ئەو شیعرانەی وتوونی سیمای ئەو مەبەستە تایبەتمەندەی خۆی بەزەقی دەربڕیوە، هەر بۆ نموونە خانی و حاجی قادری کۆیی بەشیعری نەتەوایەتی ناسراون، (نالی) بەغەزەلیات، شێخ ڕەزای تاڵەبانی زیاتر بە شاعیری داشۆڕین ناو و ناوبانگی دەرکردووە، گۆرانی شاعیر بە شاعیری ئافرەت و جوانی ناسراوە، ئیتر بەم چەشنە هەر شاعیرە و بەجۆرێ، شاعیری ئەم بابەتەشمان (مەحوی) زیاتر سیمای تەسەوف و خوداناسی بەشیعرەکانییەوە دەبینرێن. ئەوە نییە دەڵێ:

لە حەق بێژی بووە بەحری (أنا الحق) هەر قەسیدێکم
لە باتی جائیزە، واجب گەرا قەتلم بکەن واجیب

یا لە شوێنێکی تردا دەڵێ:

موحەقەق هەر کەسێ مەسلەکیە حەق و حەقیە مەنظور
سولوکی چوونە سەرداره طەریقەی پیرییە مەنصور

(د. عەبدوڵڵا ئاگرین) کە بۆ خۆی یەکێکە لە نەوەی مەحوی شاعیر سەبارەت بە مەحوی دەڵێ:

«مەحوی نەک تەنیا شاعیرێکە شیعری سۆفیزمی هۆنیوەتەوە بەڵکو شاعیر خۆشی بڕوا و ئیمانێکی تەواو و بەهێزی پێی هەبووە و بەپلەکانی سۆفیزمدا تێپەڕیوە، تا ئاکام بە مەرتەبەی هەرە بەرزی سۆفیزم گەیشتووە».

«لەم شارە خۆ هەموو ڕەوش و دەئیبی ئادەمی
یەکبارە باری کردووە، دین و حەیا خصوصی
نامەرد ئەوەندە موعتەبەرن لەم زەمانەدا
مەرد ئیعتباری کەم بووە، مەردی خودا خصوصی»

نەک من لێرەدا بەڵکو هەموو ئەو کەسانەیش پێش من بەناو دەریای قووڵ و بێ بنی شیعری ئەو شاعیرەدا گەڕاون و لە گەوهەر و مرواری شیعری (مەحوی)یان پشکنیوە، هێشتا لە سیحر و تەلیسمی شاعیریێتی ئەم شاعیرەیان بە تەواوی بۆ ساغ نەبۆتەوە! ئەوەتا شاعیرێکی وەکو مامۆستا (حەمە ساڵح دیلان) لە ئاستی شیعری مەحویدا دۆش دادەمێنێ و بەو هەموو پسپۆری و شارەزاییەی لە کۆن و نوێی شیعری کوردیدا بەرامبەر بە مەحوی دەڵێ:

(شیعری مەحوی چەکوش کارییە، قورسە. داخراوە، ئەبێ زۆر لێی وردبیتەوە، ئەبێ تەماشای کتێبی بۆ بکەی، ئەبێ لەشەرحەکانی حەدیث و تەفسیری قورئان و دیوانی شاعیرە گەورەکانی فارسی شارەزاییت هەبێت).

دیارم دەیری عیشقە، جێ بەسووتن بێ لەوێ دەگرم
کە، من مشتێ چل و چێوم بەچی بم کەڵکی کێ دەگرم
نەگەییـیە دامەنی دەستی دوعا، جا دەبمە خاکی ڕێی
طەریقەی گۆشەگیری بەردەدەم ئەمجارە ڕێ دەگرم
کە دادی یەئسی خۆمم بردە لای ئەو عارفە توند بوو
وتی: ئاخر سبەینێ جەژنە، خوێنی تۆ لە (پێ) دەگرم

بە بڕوای من ئەم شیعرە، ئەگەر کەسێکی وەکو مەحوی نەی وتایە و هەر شاعیرێکی تر بیوتایە، دوور نەبوو تۆمەتی لە ڕێ لادان و کوفریان بخستایەتە پاڵی! بەڵام مەحوی نەک هەر لەم شیعرەیدا بەڵکو لە زۆربەی شیعرە ئایینی و تەسەوفییەکانی تریشیدا ئەگەر تەجاوزێکیشی کردبێ ئەوە هەر دیسانەوە تەجاوزەکەی بەو نیازەوە بووە خزمەتێکی زیاتر بە ڕێگا و تەریقەتی خۆی بگەیەنێ، هەر لەبەر ئەمەیشە ئەو واتەیە دەیگرێتەوە. کە دەڵێ:

(المعني الشـعـر في قلب الشـاعـر!)

ڕەنگە یەکێکی وەکو مامۆستا (عەلائەددین سەجادی) لە هەموو کەسێ زیاتر لە چەمک و مەبەست و غەرەزی شاعیر گەیشتبێ و هەر بەپێوانەی بۆچوون و فەلسەفەی بیرکردنەوەی شاعیر توانیویەتی گەلێ پەردەی نهێنی شیعرەکانی مەحوی بۆ خوێنەرانی ڕوون بکاتەوە، مامۆستا سەجادی لەو ڕوانگەیەوە بەم چەشنە شاعیرمان پێ دەناسێنێ:

(شاگردی مەیخانەی مەی فرۆشانی مەعریفەت لە سۆزدا، خەلفەی کۆڕی جلەوکێشی ئەشکەوتان لە خرۆشدا، شێخی سەر بەرماڵی دڵ ڕووناکان، بەو چاوی پڕ لە فرمێسکی خوێنینەوە، پیری دیوەخانی پاڵەوانان بەو باوەڕی قایمی ئاسنینەوە، شەیدا بەگشتی قسەی نەستەق لە باری ئایینی، والا بەزوشتی لەگەڵ نەفس پیسی ڕابەری بێ دینی. ئاشنا بووە بە عەشقی تەنها بە باسی کردەوە بۆ ڕۆژی دوایی، نەیداوە خەرمەنی

فـــيكرى بەدەس خـــەيالّى شـــەن و باى دنيـــايى، دانا بووە بە فەلسەفەى ئەو ڕێگەيە كە ڕێى تەريقەتە، زانا بووە بە وردەكاريى ئەو باوەڕە كە بيرى شەريعەتە، قسەى ئاوێنەى دلّيە، شيعرى تێكەلاّوى گلّيـــە، نەفســيــەتى سـۆفى بووە، بيـرى تيـژ و قـوولّى بووە...)

هەر بۆ بەلّگەى ڕاستى ئەو قسانەى مامۆستا سەجاددى با گوێ لەم چەند دێڕە شيعرەى شاعير بگرين كاتێ دەلّێ:

خـــەيالّى پووچى دنيـــا وا دەمـــاغ و دلّمى پێـــچـــاوە
قـيـــامــەت هەر مــەگـەر ڕۆژى قـيـــامــەت بێـتــەوە فكرم
لە پێ كــــەوتووم و نەفـــسم بۆ هەوا دەشنێ وەكــــو منداڵ
لەبەر پيــــرى ســـەرم خـــۆى ناگـــرێ و تازە پێ دەگـــرم
چيـــە ســــووچ و گـــوناهى؟ بۆچى دەيكاتە جـــەزاخـــانە؟
لە قــەبر هەلّكەن، هەتا ڕۆژى جـەزا دەعــوا چيـــيـە قـــەبرم
ســـبـــەينێ (يُحـــشـــر المرء)ە برا گـــەل فـــرســـەتە ئەمـــڕۆ
تەبەڕا بن لەمن، باكـــەس نەبێ حـــەشـــرى لەگـــەلّ حـــەشـــرم

لە كوردستانى ئێمەدا شان بەشان چەندين مەزەب و تەريقەتى ئاييىنى دوو تەريقەتى سەرەكى ڕۆلّى كـاريگەرى خـۆيان گـێـڕاوە لە پەروەردەكـردنى ڕێبـازى ئاييىنى خەلّكيـدا، ديارە ئەو دوو تەريقەتەيش تەريقەتەى نەقشبەندى و تەريقەتى قادرين، وەكو ئاشكراشە مەحوى شاعير زياتر پابەندى تەريقـتى نەقـشـبـەندى بووە، هەر وەكـو زانراويشــە پەيرەوانى ئەم تەريقـەتە درێغـيـان نەكردووە لە خزمەتكردنى ڕۆلّەكانى ميللەتەكەياندا بەتايبەتى ڕەشورووتى ناو ميللەت و هەربۆيە دەبينين زۆرجار ئەم تەريقەتەيان تەرخان كردووە بۆ هاندانى خەلّكى تا لەم ڕێيەوە بەگژ زولّم و زۆردارى و ستەمكارييدا بچنەوە... لەم ڕووەوە مامـۆستـا محـەمەدى مـەلا كەريم لە پێشـەكى ديوانەكەى مەحويدا ئەم ڕاستييەمان بۆ ڕوون دەكاتەوە و دەلّێ (تەريقـەتى نەقشبەندى خۆى لە خۆيدا دەمارێكى تيژى بيركردنەوە و فەلسەفەكاريى تيايە، لەوانەيە بەشێكيشى لە هيندييەوە هێنابێ و لە كەلەپوورى سامانە فـەلسەفـييـە دەولّەمەندەكەى ئەو ولاّتە بێ، لە بارەى ڕيشـەى چينايەتيـشـەوە تەريقـەتەكان هەمـوويان بەتايبـەتى تەريقـەتى نەقشـبـەندى لەپێشـيـا ڕێبـازى ڕەشورووت و هەژار و چەوساوەكانى كۆمەلّ بوون) وێنەى ڕاستى ئەم تەريقەتەى شاعير دەتوانين لەم قەسيدەيەدا بەرجەستە بكەين كاتێ دەلّێ:

ئەوى ئەمـــڕۆ بە دەورى تەخـــتــــيـــايە هەلهـەلەى مــەظلومــە
لە دەورى نەعـــشــيـــا ســـبـحـــەى دەبينى وەلوەلەى مــەظلومــە

بەپەل پەل کـــردنی ســـبـــحـــەی ئەگـــەر بـبـــوایە باوەڕیان
دەبوو قـــەت بەم حـــەودە نەبوایە بۆ دنیـــا پەلەی مـــەظلومـــە
دەخـاتـە فکری ئەهلی مـەعـریفـەت شـێـوەی جـەجـاڵ (ئەلحەق)
دەبینی بەعـــزە ئەشـــخـــاصێ بەدویا خـــەرگـــەلەی مـــەظلومـــە
وەها پڕ فـیـــتنە بوو عـــالەم کـە ئیـبلیـســێکی وەک ئیـبلیس
نەمـاوە مـەئمـەنی غـەیری کـڵـێشـە و کـەڵکەلەی مـەظلومـە
لە پەردەی جـیلوە یەکـتـا ڕووخـایە شـۆری سـەد مـەحـشـــەر
نیـــقـــابێ لادە لەو چیـــهـــرە، ببـــینە زەلزەلەی مـــەظلومـــە
بەئاری تێگەیشـــتین ئێـــمـــە دنیـــا، هەر ســـەرابێ بوو
هەمـــوو دەشـچن بەخنکان و لەو شـــیکلە مـەلەی مـــەظلومـــە
لەســـوقی دەهردا دوکـــانی هەر کـــەس مـــودەتێ عـــومـــرە
گـوهەر دانە بەپشـکل دانە (مـەحـوی) مـامـەڵەی مـەظلومـە

ئەوانەی سەر و گیـانیـان لەڕێی ڕاستی و قەناعەتی باوەڕیاندا بەخت دەکەن و دەبنە قوربانی ئەو ڕێبازەیان ئەوانە هەمیشە وەکو سونبلی قارەمانێتی و ڕاستگۆیی لە دڵ و دەروون خەڵکیدا دەژین یەکێکی وەکو (هەللاج) کە ڕەمزی ئەو خۆ بەختکارییە بووە لە مێژوودا ئێستا نەک هەر لای سۆفیەکان تەنانەت لای هەموو هەڵگرانی ئاڵای ئازادی و بیری ڕووناکی وێنەی لە ویژدانی هەموو کەسێکدا دەژی و هەموو عاشقانی ئازادی لەهەر کوێ و سەر بەهەر نەتەوەیەک بن یادی دەنرخێنن و ستایشی بیروباوەڕی دەکەن.

هەر بۆیە شاعیری ئێمەیش مەحوی لە زۆر شوێنا بەیادی عاشقانی ئەم ڕێبازەوە وتوویەتی.

بەپیـری مـەرگەوە فـەرسـەخ بەفـەرسـەخ ڕۆیون مـەردان
ئەوی بـاکی لـە مـــــردن بێ دیارە بـڵـح و نـامـــــەردە

یا لە شوێنێکی تردا دەڵێ:

دەبیـنی بـایەزیـدە، وەک یەزیدێـکی دەبیـنن خـــــەلق
بەبێ پەردە شـەیاطینی لە ئەحـــواڵی مـــەلەک دەدوێ

هەر سەبارەت بە سۆفیگەرێتی شاعیر برای نووسەر (محەمەد ئەمین حوسێن) دەڵێ:

«مەحوی شاعیریش هەر وەک شاعیر لەو بارودۆخە ناهەموارەدا دەژیا و سۆفیگەریش دەریای پڕ لە ئارام و هێمنی دەروونی سۆفییەکانە، بۆیە لەو بوارەوە بە هەلی دەزانێ کە ئازایانە و بەبێ سڵ کردنەوە وەک شـاعـیـر و سـۆفـیـیـەکی پێگەیشـتـوو هۆنراوەکـانی دەکـاتە مـینبـەری بـانگی حەقبێژی»

هەتا حەق ناصیرە هەر حەقمە مەنظور
وەکو (مەنصور) ئەگەر بمکەن بە دارا

یا لە شوێنێکی تردا دەڵێ:

حەق بێژی یەک گوناهیە مەنصور و حەقمە من
ئەم قەطعە گەر نیشانی نەدەم (مەحویا)بەکەس

ئەگەر وەک شایەد حاڵێک لێرەدا لە نزیکەوە لە هەڵسەنگاندنی بەهایی و ڕۆڵی شاعیر بدوێین هەڵبەتە کەسێکی وەکو (سۆران مەحوی) کە ئەویش یەکێکە لە نەوەکانی شاعیر، دیارە شایەدحاڵێکی وا نزیک بۆ ئەم باسەی ئێمە و بۆ ئەم شوێنە سوود بەخوێنەر دەگەیەنێ بۆیە مەبەستمان بوو برێ لە ڕاوبۆچوونی مامۆستا سۆران تێهەڵکێش کەین بەم باسە تا برێ ڕاستی تری شاعیرمان بۆ ڕوون بێتەوە، مامۆستا سۆران لە پوختەیەکی قسەیەکیدا نووسیویە دەڵێ:

«بەڵێ ڕاستە ئەو ڕۆژگارەی مەحوی تیا ژیا بوو وەک لە دەلاقەی شیعرەکانیەوە بەدەردەکەون تا بلێی ڕۆژگارێکی ناخۆش و باری دواکەوتوویی کۆمەڵ لە گشت لایەنێکەوە لاسەنگ و تێک چوو بوو، بەڵام ئەگەر بەراوردێکی ئەو ڕۆژگارە لەگەڵ ئەمڕۆدا لە ڕووی پێشکەوتنی زانیاری و گەشەکردنی باری ئابووری و هەموو لایەنەکانی تری تەکنۆلۆژیاوە بکەین. دیارە ئەمڕۆمان پێشکەوتووترە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لاسەنگی و تێکچوونی باری کۆمەڵایەتیمان بەرێژەی دوێنێ یا ڕابوردووەوە پێم وایە هەر سەرکەوتن و پێشکەوتنی لە ڕووی غەصب کردنی (زەوت کردن) ماڵی عیباد و کوشتن و تاڵان و بڕۆ و ڕەوشت نزمی و درۆ و دوو ڕووییەوە بەخۆیەوە بینیبێ!».

ئەگەر ئەم نموونانەی خوارەوەی شاعیر بخەینە ڕوو ڕاستی قسەکانی مامۆستا (سۆران)مان بۆ ساغ دەبێتەوە، ئەو قسانەی نزیکەی سەد ساڵ لەمەوبەری شاعیر سەبارەت بە گەندەڵی و نالەباری ناو کۆمەڵەکەی وتوونی، ئەگەر ئێستا زیادیان نەکردبێ باوەڕ ناکەن شتێکی ئەوتۆیان لێ کەم بووبێتەوە فەرموو سەرنج بدەن شاعیر دەڵێ:

ئەربابی غینا ئەوەندە غەڕا بە (زەڕ)ن
بێ بۆنی بەهار و دیتنی (جۆ) دەزەڕن
ئەمیانە مەقام و بەستەیان ناشکوورییە
یەعنی دەوەڕن، ئەگەر (دەمێ بێ) نەزەڕن

یا ببینە کاتێ دەڵێ:

لە واعیظم پرسی، یەکێ شۆخانە جوابی دامەوە
وەعظی چی؟!سەر لنگە دەستاری کرەی دەستاری هات

شـێخ و طورەی مـێـزەر و نەقڵ و نوقـوڵی هیـچ و پووچ
مـن بە طورەی بـار ئەســـیـــرم، ئـو بەکـــۆڵێ تـورەهات

یاخود دەڵێ:

چیـە دنیـا ژنێکە هەر شـەوێ سک پڕ بە سـەد فـیـتنە
سـبـەینێ زوو بەخـوێنی جـەرگی ئەهلی دڵ دەکـا بێـزوو
دەنی تـەبعی بەجـارێ عـالەمی داگـرت ئەوا (مـەحـوی)
درەنگە ئیلتـیـــجـا بەبەر دەری عـــالی جــەنابێ زوو

ڕاسـتـییـەک لە شـیـعـرەکانی ئەم شاعـیـرەدا بەدی دەکرێن ئەویش ئەوەیە شـاعـیر هەمـیشـە ویســـتـوویەتی ڕووی ڕاســتی ئایین و پیـاوچاکـانی ئـایینی لە ڕیاکـاران و بـازرگـانانی ئایینی جیـابکاتەوە، ئەمـەیش بۆ سەردەمێکی وەکـو سەردەمی ئەوسـای ئەو بەپێـوانەی ئەمـڕۆ دەکرێ بەکارێکی پێشکەوتن و جورئەتی ڕا دەربڕینی بۆ لە قەڵەم بدرێ، هەر باوەڕێک بتەوێ بەپاکی و بەڕاسـتی بە خـەڵکی بگەیەنی بێگومـان لەلایەن بازرگـانانی ئەو بیـروباوەڕەوە تووشی چەندین گێرەوکێشە دەبێ و زۆر جار تووشی هەڕەشە و گورەشە و بگرە سەرنگووم بوونیش دەبی، هەربۆیە دەبینین شـاعـیـر لەسـەر ئەو ڕاسـتگۆیی و ڕاست بێـژییـەی خـۆی تووشـی ئەو حـاڵەتانە هاتووە، تیشکی ئەو ڕاستییانە لە زۆر شوێنی شیعرەکانیدا بەدیار دەکەون هەر بۆ نموونە ئەوەتا دەڵێ:

فەضیلەی ئەسل و فەسڵ ئینسـانی پێ نابێ بە ساحیب فەضل
کــە تۆ کــۆســـەی بەتۆ چی مـــامــە ڕیشی باب و باپیـــرت!

یا لە جێیەکی تردا دەڵێ:

ڕیشــــێـکی پـان و تـووکی بـنا گـــــوێ درێـژ و لـوول
ســـــۆفـی لەدیـنـی لادا بەدیمەن لـە جـــــوو دەکــــا

زیاد لەوەش لەم نموونەیەدا ڕاستی ئەو ڕیاکارانە دەردەخا کاتێ دەڵێ:

شــێـخێ هەمــەوەندێکی دەدا پەند و نەســیــحــەت
ئەو قــوڕ بەســەرەی دابووە بەر فــەحش و فــەزیحــەت
وەلێ کابرا خۆش هاتە جەواب و وتی: تۆ حەقتە فەقەط
من قـــاطعی طەریقم نەکـــو قـــوطاعی طەریقـــەت

ئێـمـە وەک لە شـوێنیکی تری ئەم باسـەمـاندا وتمان مـەحـوی شـاعـیـر ئەوەندە شـیـعـرەکـانی تەلیـسـماوین ئەگەر ڕێبوارێکی ئەم ڕێبـازە بەعـەشق و سووتانەوە خۆی ناهاوێتـە ئاگرسـتـانی شیـعـرەکـانەوە و دڵسـۆزانە قـرچ و هۆر تێـیدا نەسووتێ زۆر زەحـمـەتە بتـوانێ لە مـەبەست و ناوەڕۆکی تەواوی شیعـرەکان بگات. کەواتە کەسێک بیەوێ لە دنیای ئەم شیعرە بگات دەبێ

وەک (سەمەندەر) هەمیشە دەرد و خولی شیعرەکانی بدا و خۆی بەپریشکی ئەو ئاگرانە بسووتێنێ تا جارێکی تر دیسانەوە لەناویانا زیندوو بێتەوە.

هەر بۆیە لە کۆتایی ئەم باسەمدا لە زمانی شاعیرەوە دەڵێم:

لە ناکەس کاریا خاکم بەسەر ڕۆیی بەبا عومرم
خودا تۆ بمژێنە تا لەبەر قاپی کەسێ دەمرم
بەزایع چوو لە (مالا یعنی) یا وەقتم هەموو یەعنی
دەبێ وەقتێ لە (بو الوقت)ێ بخوازم تا تیا بمرم

**سەرچاوە**

بۆ نووسینەوەی ئەم باسە سوود لەم سەرچاوانە وەرگیراوە:

١- دیوانی مەحوی: لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەدی مەلا کەریم.

٢- کتێبی لەبارەی مەحوی لوتکەوە: نووسین و ئامادەکردنی مامۆستا عەبدوڵڵا عەزیز ئاگرین.

# مرۆڤی تراژیک –Tragic
# مەحوی وەک نموونە

**کەریم دەشتی**

## بەشی دووەم

«بەشی یەکەمی ئەم باسە لە گۆڤاری رۆشنبیری کوردستانی ژمارە (٣)ی ساڵی ٢٠٠٠ بڵاوبۆتەوە کە بەگشتی باس لە سۆفیگەریتی و بەرجەستە بوونی چەمکی مرۆڤی تراژیک لە نێو موتەصەوفەکان دەکات»

شەو هات و ئەمن مەستی خەیاڵاتی کەسێکم
مەشغولی نەفەس گرتنی موشکینی نەفەسێکم
«نالی»

دیکارت وتوویەتی «رەنج و ئازاری مرۆڤ لەوەدا دێت کە ئەو سەرەتا مناڵ بووە.» ئەگەر بەوردی لەم چەمکەدا کار بکەین بۆمان روون دەبێتەوە، کە مەبەستی ئەوەیە بڵێت مرۆڤ وەک منداڵێک وایە کە هیچ خواست و ئارەزوو و دەسەڵاتێکی نەبووە کاتێک فرێ دراوەتە ناو ئەم ژیانە و بەشداری نەکردووە لە پێکهێنانیدا کەچی کەوتۆتە ژێر یاسا و رێساکانیەوە، ئەمەیان پێگەی بیرکردنەوەیێکی وجودیانەیە و زۆربەی هەرە زۆری بیرمەندە موتەصەویفەکان و شاعیرە کلاسیکیە سۆفیەکان لەناو پانتایی ئەم بۆچوونەدا کاریان کردووە، ئەمەش بیرکردنەوەیەک نییە پەیوەست بێ بەهەڵگەرانەوە لە مەزهەبێک یاخود هەڵوەشاندنەوەی ئەقیدەیەک یا بەگژاچوونەوەبێ بۆ چەمکەکانی ئاسمانی، بەڵکو بیرکردنەوەیێکە لە ئەنجامی تێرامان و دامانێکی زۆر لە چەندین پرسیارەوە دروست دەبێ، بەتایبەت لەو پرسیارانەی سەر بەرەمزی «بۆ، کەی، چۆن»دەوەن، کە تێکرا شێوەبیر و شێوەزاری مرۆڤێکی کارەسات بار و ئازارکێش دروست دەکەن... ئەویش مرۆڤی تراژیکە.

مرۆڤی تراژیک مرۆڤێکی نیتشەویە، بەو مانایەی کە جۆری بیرکردنەوەی هەوێنی کارەساتەکانیەتی یاخود پرۆسێسی بیرکردنەوەی ئەم جۆرە مرۆڤە پرۆسێسی هەڵکشانە بەرەو خاچ، بەرەو مەرگێکی حەتمی، ئەلیرەوەیە تراژیدیای ئەو مرۆڤە دەست پێدەکات و دەبێتە مرۆڤێکی تراژیک، نموونەی مرۆڤی تراژیک هێجگار زۆرە لە مێژووی بیرکردنەوە و ئەدەب و هونەر، کە دەڵێین مرۆڤی تراژیک مەرج نییە کۆتایی ئەو مرۆڤە تەنها بەمەرگی جەستەیی بێت، چونکە هەندێ جار هەمان ئەو مەرگە لە گێرمە و کێشەیێکی بێ کۆتاییدا لەناو خەیاڵدانی

مرۆڤی تراژیک دەژیت... ئەگەر بەوردی سەیری مێژووی بیرکردنەوەی مرۆڤی تراژیک بکەین بۆمان روون دەبێتەوە زۆربەیان مرۆڤی عیرفانی و سۆفی بووینە، لەوانە سوهرەوەردی، حەلاج دوو نموونەی زۆر بەرزی بیرکردنەوەی مرۆڤی تراژیکن، ئەلێرەشدا مەحوی لەنێو ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا نموونەی مرۆڤی تراژیکە، کە شیعرەکانی شەلاڵی گێرمە و کێشەیێکی رۆحی گەورەن لە میانی بەباڵابردنی رۆحی خۆی بۆ مەقامی خودا و دەرباز نەبوونی لە زەمینێکی بچووک کە جێ خەونی ئەو نییە، بەڵکو ئەو بە دوای خەونی ئەو فیردەوسەیە کە لەناو پانتایی بیرکردنەوەی ئەودا مەودایێکی زۆری هەیە.

موحەقەق هەر کەسێ مەسلەکیە حەقق حەققییە مەنظور
سلوکی چوونە سەرداره طەریقەی پیرییە مەنصور

بەکارکردن لەنێو ئەو کاتە گۆڕیایەی کە دەق تیمای فەلسەفەی وجودی ساغ دەکاتەوە کە دەڵێت «هەموو ئەو کارەی کە لەژیاندا دەیکەین بریتییە لە بونیات نانی مەرگ» واتە مەرگ پارسەنگی بابەتییە بۆ ژیان و هەوڵەکانی، چونکە ئەوە تاکە راستخەری هەردوو ئەو گۆتە ئاینگەراییە کە چەمکی مەرگ و ژیان روون دەکاتەوە بەوەی کە «ئەوەی ژیانی بەئێمە داوە پاشان لێمانی دەسەنتەوە» یاخود «ئێمە لەدایک دەبین و دەمرین» ئەمەشیان ترۆپکی کارەساتەکانە کە مرۆڤ بەتەواوی لەناو ماناکانیدا دەژیت و هەستی پێدەکات و کاری پێدەکات، بۆیە زۆرجار شاعیر هەوڵ دەدات ئەلتەرناتیڤێکی هۆبەندی بدۆزێتەوە بەوەی کە تەنها مەرگ هەیە وەک چۆن مەحوی بەم دەلالەتەوە لە ژیان رادەکات:

کەشک بەم مەحویا هەر شەربەتی مەرگ
لەسەر ئەرزا نییە ئاوی گەوارا

یاخود بەهەمان ئەو چەمکەوە کارەساتەکانی ژیان دەکا بەو ئەلتەرناتیڤە و مەرگ دەکا بە چارەسەر:

بەو هەموو تاڵییەوە شەربەتی مەرگ ئەهلی حەیا
خۆش گەواراترە بۆی ئێستە لەشەکراوی حەیات

چونکە مرۆڤی تراژیک خودانی چەند ڕەهەندێکە لە بیرکردنەوە کە دەکرێ بەمجۆرەی خوارەوە پۆلبەندی بکەین..

مرۆڤی تراژیک بەنێو ئاستانییێکی ئەگزیستانسیالیزمی کەونیدا تێدەپەرێ لەوێدا ماناکانی مانەوەی مرۆڤ لەنێو بازنەیێکی بۆشدا وێنا دەکا و هیچ جەدواییێک بۆ بوونی مرۆڤی ناهێڵێتەوە و پێی وایە بوونی مرۆڤ لەم سەر زەویەدا حەسرەتێکە چارەنووسی پەیوەستە بە خۆکوژی و مەرگ چونکە تروسکاییەک نامێنێ بۆ ئەوەی لە تۆنێلی وجوددا بەکاری بهێنێ، بەماناییێکی دیکە جیهان دۆستی و ژیان دۆستی وەهمێکە مرۆڤ بۆ خۆی نەخشاندوێتی و ئەگەر لە بازنەیێکی

حەقیقیدا سەیری ژیان بکەین هەمووی کارەساتە، بە گوتەیێکی شکسبیر لە هاملێت دا ژیان بریتییە لەو مرۆڤەی گۆڕی هەمیشەیی لێدەدا و گۆرانیش دەلێت. مەحوی لەم مەودایەدا واتە لە مەودای بیرکردنەوەییێکی وجودیانەی ئاینگەرایی بوونەوەرێکی هێجگار تراژیکە زۆر بەوردیش لەم چەند دێڕە شیعرانەی وا بەدیار دەکەوێ.

بەخۆکوشتن نەجاتی خۆ بدە مەحوی وەکو فەرهاد

لە زۆربەی قەهرەمانی عیشق ئەفەندم هەر ئەجەل بەستە

مرۆڤی تراژیک لە مەودای ڕاکردن لە ڕاڕەوی ئەگزیستانسیالیزمەوە بۆ ڕاڕەوی ئاینگەرایی... بەشێوەییێک کە نائومێدی و بێ مانایی ژیان هەموو کایەکانی ڕۆحی مرۆڤی تراژیک پردەکاتەوە و بڕستی هەناسەدانی لێ دەبڕێ و ژیان دۆست و جیهان پەرستی دەبن بەجۆرێک لە دۆزەخ کە ناچاربێ بەدوای سێبەری بەهەشتێکدا بگەڕێ کە دڵنیایە ئەم بەهەشتە تەنها بەجێبەجێ کردنی فەرمانەکانی ئاسمانی دەست دەکەوێ واتە ئەو دەبێ بەدوای هەموو ئەو گوتارانەدا بگەڕێ کە گوتاری پیرۆزن، بۆیە بەناچار پەنایان بۆ دەبات و وەک چۆن (نیتشە) لە مەوداکانی ئەگریستانسیالیزم دا پەنای بۆ دارشتەکانی پیرۆزی دەبرد و زەرادەشتی دەکرد بە مورشیدی خۆی و دانتی ئاسا فرجیلی لە پێناوی میعراجی بیاتریس دا لەگەڵ خۆی بۆ تەبەقاتی ئاسمانی دەبرد... ئەم پرۆسەیە پرۆسەییێکی دەستکرد نییە بەڵکو لەسەرووی جەستەی مرۆڤی تراژیکەوەیە و لە بەرابەریا دەستە پاچەیە ڕەنگە لەمەشدا پرۆسێستی ڕۆحی (دانتی) هەر لە دۆزەخەوە تا گەیشتن بە پاکستان (مطهر) و پەڕینەوە بۆ فیردەوس باشترین نموونەی مرۆڤی تراژیک بێ، لەمەشدا مەحوی بەچەندین دێری شیعر گوزارشت لە خۆی دەکات لە پەنابردن بۆ خودی ئینساندا.

نەگەیمە ئەو جەوانە گەیمە پیری

مەددەد یا پیری پیرانی بوخارا

مرۆڤی تراژیک لەمەودای پاکستانەوە بۆ فیردەوسی ئەبەدی و بەهەشتی مەجازی، لەو کاتەی کە تەواو لەناو کارەساتە ڕۆحییەکانی خۆی قاڵ دەبێتەوە و دەبێتە یەک پارچە بیرکردنەوە و ئازار، دەبێ لەنێو تەوقی ئاینگەرایی دا ڕێگەیەک بدۆزێتەوە پێی دابپەڕێتەوە و ئیدی باوەڕی بەمیانەیەک نەبێت بیگەینێتە خواو، واتە مرۆڤی تراژیک وێنەی موتەصەوفێکی گەورە وەردەگرێ کە بیەوێت یەکسەر لەگەڵ زاتی خودادا تێکەڵ بێت، تێکەڵبوونێک هیچ جەستەییێکی تێدا نامینێ و ئەوەی هەیە تەنها ڕۆحێکە بەقۆناغەکانی دۆزەخی زەوی و پاکستانی ڕۆحی و فیردەوسی خودا تێپەڕیوە تا لەگەڵ نوری خودادا یاخود لەناو نوری خودا تێکەڵ بێت... مەحویش لە ئەزموونی ڕۆحی خۆیدا ئەم سێ قۆناغە گرنگەی نەخشاندووە و بەلەنێوچوونی یەکجارەکی جەستەی مەحوی ڕایدەگەینێ کە بێ تەفر و تونابوونی جەستە کارەکان بۆ دوا قۆناغی مرۆڤی تراژیک بەرجەستە نابێ لە فیردەوس دا:

چ خـەیاڵێکە لیـقـابێ بەفـەتاچوونی جـەسـەد
تا پریشـــان نشـــود کـــاربـســـامـــان نرسـد

چەند نموونەیەک لەو بەیتە شیعریانەی کە مەحوی دەخەنە ناو سیفەتی تراژیکەوە:

(١) غـەیری وەحـدەت لە وجـودا نیـیـە کـەثرەت وەهمە
سـادە تەکـراری یەکـە مـەنشـەئی ئەوهامی عـەدەد
(وجود: خودا)

(٢) بەڵکە لەو ڕێیـە من پەی بەو عـیـمـرانی بەقـا
مـەحـویا غـەیری خـەراباتی فـەنا نیـمـە مـەلاذ
(بەقا: فەنا)

(٣) موحەقەق هەر کەسێ مەسلەکیە حەقق و حەققییە مەنظور
سـولوکی چوون سـەرداره طەریقـەی پیـریە مـەنصـور
(تەریقەت: مەرگ)

(٤) بە خۆکوشتن نەجاتی خۆ بدە مەحوی وەکو فەرهاد
لە زۆربەی قەهرەمانی عیشق ئەفەندم هەر ئەجەل بەستە
(عەشق: خۆکوشتن)

(٥) لەسەر تۆ بوومە پەندیی عالەمێ وتم وتی: مەحوی
بەس بێ مـوشـریکی بەس یا لە دنیـا یالە من لادە
(دنیا: قیامەت)

(٦) چلۆن ئەو دێتە چاوی من کـە یەکسەر عـونصوری ئاوە
مەحـاڵە من کـە بچـمـە دڵێـیـەوە دڵ کـیـشـوەری بەردە
(ژیان: دژ بەندی)

(٧) کـە شک بەم مـەحـویا هەر شـەربەتی مـەرگ
لەســـەر ئەرزا نیـــیــــە ئاوی گـــەوارا
(زەوی: مەرگ)

(٨) نەگـــەیمە ئەو جـــەوانە گـــەیمە پیـــری
مـــەدەد یا پیـــری پیـــرانی بوخـــارا
(تەمەن: پیری)

(٩) بەو هەموو تاڵییەوە شەربەتی مەرگ ئەهلی صەبا
خۆش گەوارا ترە بۆی ئێستە لەشەکراوی حەیات
(ژیان: مەرگ)
(١٠) منی بەم حاڵ و قاڵە دی کە دەیوت
کتێبێکی غەریبم دیوە پەرپوت
(مرۆڤ: کارەسات)
(١١) تاسەر نەبۆتە گۆ دە لە دنیا دە تۆ شەقێ
هەر ئەم شەقە بەکارە کەوا هەڵدرێ لە هیچ
(جیهان: هیچ)
(١٢) چ خەیاڵێکە لیقابێ بەفەنا چوونی جەسەد
تا پریشیان نشود کاریسامان نرسد
(جەسەد: فەنا)

بەمجۆرە هەموو وجودێ لای مرۆڤی تراژیک و شاعیری تراژیک بریتییە لە سووڕانەوەی ئەم کەونە لە نێو بازنەیەکی بێ جەمسەر لە وجودەوە بۆ مەرگ لەمەرگەوە بۆ خودا ئایدیای باڵا و ئەبەدیەت.

## بولبولی فەصڵی خەزان

شمشادە ئەمە، یا قەدە، یا سەروی ڕەوانە
یا عەرعەرە یا نەخلی مورادی دڵ و جانە!
داخۆ ئەمە ئەگریجەیە پەخشاوە بەسەردا
یا سونبولە کردوویە صەبا زوڵفی بەشانە!
ئاهووی خوتەنە جیلوە دەکات و لە خەطادا،
یا چاوی ڕەشی فیتنەگەری سورمەکەشانە!
دڵ هایمە دائیم کە ئەمە قەترەیە داخۆ
یا جوزئێکی بێ جوزئە موسەمما بەدەهانە!
ئەم مەی صیفەتی خون خۆرە وا نازک و سوورە
یاقووتی لەبە، یا گوڵە، یا قووتی ڕەوانە!
ناڵاندم و فەرمووی ئەو ئاوازە حەزینە
یا «مەحوی»یە، یا بولبولەکەی فەصڵی خەزانە

# مەحوی لە پرۆژەی «فەرهەنگی شاعیران»دا
# چەند سەرنجێکی مەنهەجی

نووسینی: عەبدوڵلا قەرەداغی

## پێشەکی

دەکرێ ئەم پرۆژەیە هەر بەو چوارچێوە گشتییە، واتە «فەرهەنگی شاعیر»، یان «فەرهەنگی شاعیران» ناو ببرێ، بەو مەعنایەی وشەی «فەرهەنگ» مەعنایەکی بەرفرەوانی هەیە کە پێوەندیی بەزەمینەی رۆشنبیریی شاعیرەوە هەیە و، لێرەدا دەبێ ئەو رۆشنبیرییە لە شیعرەکانیدا رەنگ بداتەوە. هەروەها «فەرهەنگ» مەعنایەکی تایبەت و، تا رادەیەک بەر تەسکی هەیە و پێوەندیی بەمەعنای زمانەوانیی ئەو وشانەوە هەیە کە شاعیر لە شیعرەکانیدا بەکاریان دێنێ. بێگومان، ئەو مەعنایەی لەم نووسینەدا مەبەستە، یەکەمین مەعنایە و، بەمەش ئەو فەرهەنگە دەبێ بریتی بێ لە پەیکەری گشتیی جیهانبینیی شاعیر و، لە هەمان کاتیشدا بتوانی کلیلی خوێندنەوەی سیستماتیکیی شیعرەکان بدا بەدەستەوە.

ئەگەر ئەمە مەبەستی ئێمە بێ لە بواری «شاعیر ناسی»دا، ئەوە دەتوانین بەبێ هیچ دوودڵییەک بڵێین کە لە ئاستی کۆششێکی تازە داین، واتە کۆششێک کە نموونەی لە رۆشنبیری کوردیدا نییە و، نەک تەنها مەحوی، بەڵکو هەموو شاعیرانمان پێویستیان بەوە هەیە کە «فەرهەنگی شیعری»یان بۆ دابنرێ، بەتایبەت شاعیرانی کلاسیک، لە هەمان کاتیشدا دەتوانین بڵێین کە شاعیرانی صۆفی، بەتایبەت مەلای جزیری و مەولەوی و مەحوی، پتر لە هەموو شاعیرانی دیکەمان پێویستیان بەو جۆرە کۆششە هەیە.

ئەم چەند لاپەڕەیە هەوڵێکە بۆ دەرخستنی لایەنەکانی ئەو پرۆژەیە:

## پرۆژەی «فەرهەنگی شاعیر»

بیرۆکەی ئەم پرۆژەیە لای بەندە دەگەڕێتەوە بۆ نیوەی دووەمی هەشتاکانی سەدەی رابوردوو، رێک بۆ ساڵانی ١٩٨٦-١٩٨٧، لەو کاتەدا کتێبێکی فارسیم بەرچاو کەوت بەناونیشانی «فەرهنگ اشعار حافظ»، و شێوازی لێکدانەوەی زاراوە عیرفانییەکانی ئەو شاعیرە گەورەیەی فارسی سەرنجی راکێشام و، ئەو ئارەزووەشی لە ناخمدا خوڵقاند کە شاعیرانی کورد و، لە رێزی پێشەوەشدا «مەحوی» ئەو هەلەی بۆ رەخسابا کە فەرهەنگێکی

ئاوەها بۆ شیعرەکانی بکەوێتە بەر چاوی خوێنەرانی.

لەو سەردەمەدا لە خۆم ڕاندەبینی، بەهۆی سەختییەکانی ژیان و نەبوونی سەرچاوە و کاتی پێویست ئەو ئەرکە بگرمە ئەستۆ، بەلاّم پاش ڕاپەڕین هەولّی زۆرم خستەگەڕ بۆ ئەوەی ئەو خەونە بەکۆمەلّ بێنینە دی و، یەکێک لەو کەسانەش کە هەولّم لەگەلّی دا، برای بەڕێز و خۆشەویستم دوکتۆر ئیبراهیم ئەحمەد شوان بوو، کە بەداخەوە نەچووە ژێر باری ئەم ئەرکەوە، ئەگەرچی لە تێزی دوکتۆراکەیدا ژمارەیەکی باشی ئەو زاراوە سۆفییانەی کۆکردبووەوە کە «مەحوی» لە شیعرەکانیدا بەکاری هێناون.

پاش ئەوەی هەستم کرد دەرگای هاوکاریم بەڕوودا داخراوە، ناچاربووم بیخەمە ئەستۆی خۆم و، ناشزانم چۆن و بۆ پرۆژەی فەرهەنگی شاعیر لای من لە سنووری «زاراوە سۆفییەکاندا» ڕانەوەستا، بەلّکو پەلی بۆ هەموو ئەو بوارانەش هاوێشت کە تێکڕا زەمینەی جیهانبینی شاعیر پێکدێنن، وەکو: قورئانی پیرۆز، فەرموودەکانی پێغەمبەر «د.خ»، ئوسوولّ، واتە «علم الکلام، عەقاید- بیروباوەڕ» و مەنتیق-یش.

تا ئێستا کارێکی باشم لەم پرۆژەیە کردووە. ئەنجامی ئەم کارەم تا ئێستا ئەوەیە کە ئاواتەخوازم هەموو شاعیرانیش ئەو کارەیان بۆ بکرێت و، ئەم پرۆژەیەش کۆمەلّێک کێشەی مەنهەجیی لەبەردەمدایە کە دەبێ چارەسەر بکرێن. لە وردبوونەوەم لەم دەرەنجامەی دوایی، ئەم باسەم دابەش بووە سەر سێ بەش.

## یەکەمین بەش

## کێشەی زاراوە

لە هەر پرۆژەیەکی ئاوەهادا کێشەی زاراوە سەرەکیترین کێشەیە، نەک تەنها لەبەر ئەوەی پرۆژەکە پرۆژەی «فەرهەنگی زاراوە»یە، بەلّکو لەبەر کۆمەلّە هۆیەک لە ئارادایە «زاراوە» دەخاتە خولگەیەکی ئەوتۆوە کە لە دەرەوەی ئەو خولگەیەدا مەعنای ڕاستەقینەی خۆی بەتەواوی لە دەست دەدات. بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم ڕاستییە پێویستمان بەوە هەیە کە لەم چوارچێوەیەدا لە دوو گرووپە کێشە وردببینەوە، ئەو دوو گرووپە ئەمانەن:

١- کێشەی میتۆد: واتە ئەو کێشە سەرەکییانەی کە دەرەنجامی ڕاستەوخۆی لە دەرەنجامی خوێندنەوە جۆربەجۆرەکانی شیعری یەکێک لە شاعیرە خاوەن مەنهەجەکاندا دەردەکەوێ و هێلّ و سنوورە ئێجگار باریک و نادیارەکانی نێوان خوێندنەوەی مەنهەجی و خوێندنەوەی نامەنهەجی ڕوون دەکاتەوە. بەنیسبەت مەنهەجی سۆفییانەوە ئەم خالاّنە بنەما سەرەکییەکانن:

١-أ- جیاوازیی نێوان دیوی دەرەوە «ڕوالّەت» و دیوی ناوەوە: ئەم کێشەیە لەوەدایە کە هەموو

گەورە پیاوانی تەسەووف کۆکن لەسەر ئەوەی خودی مەنهەجی ئەم ڕێبازە بایەخ دەدات بەدیوی ناوەوە «جەوهەر»ی مەسەلەکان، لەکاتێکدا کە شەریعەت، بۆ نموونە، بایەخ دەدا بەڕواڵەت. ئەمەش بەو مەعنایە نییە کە تەسەووف «تەریقەت» جیاوازە لە شەریعەت و ناکۆکە لەگەڵیدا، بەڵکو بەو مەعنایەی کە تەواوکەریێتی لە ڕوانگەیەکی دیاریکراوەوە.

لێرەوە، تەنانەت قورئانی پیرۆزیش لێکدانەوەی سۆفییانەی تایبەتی هەیە کە بایەخ دەداتە وردە ئاماژە ناسکەکانی ئایەت و سوورەتەکان و کۆششە بەناوبانگەکەی ئیمام ئەبولقاسمی قوشەیری لە لێکدانەوە، حەوت جەڵدییەکەی قورئانی پیرۆز، کە بە«لطائف الاشارات» ناونراوە، بەڵگە و بەرهەمێکی دیاری ئەم کۆششەیە. هەر لەم ڕوانگەیەشەوە، لە کاتی لێکدانەوەی مەعنای هەر زاراوەیەکی قورئانیدا کە لەلایەن شاعیرێکی سۆفییەوە بەکار هێنرابێ، مێتۆدی لێکۆڵینەوە ناچارمان دەکات پشت بەلێکدانەوەی سۆفییانەی ئەو زاراوە قورئانییە ببەستین، هەروەها دەبێ بۆ فەرموودەکانی پێغەمبەریش پەیڕەوی لە هەمان ڕێباز بکەین.

١-ب- لێکدانەوەی سیستماتیکی لەسەر بناغەی مێتۆدی سەر بەجیهانبینی شاعیر، مەسەلەیەکی گرنگی دیکەیە کە لە بواری لێکدانەوەی مەعنای هەر زاراوەیەکدا بایەخێکی گەورەی هەیی. بۆ نموونەش دەتوانین ئاماژە بۆ ئەو خاڵە جەوهەرییە بکەین کە سووربوونی شاعیری سۆفی لەسەر داکۆکی کردن لە حەق، بەهەموو لایەنێکیەوە، پابەندییە بەوەی کە ئەسڵی شەڕ «خراپە» لە ڕوانگەی تەسەووفەوە لەو خاڵەوە سەرچاوە دەگرێ کە هەڵپەیەکی نابەجێ هەیە بۆ تێرکردنی ئارەزووە ماددیەکانی جیهان و، ئەمەش ئەگەرچی بتوانرێ لەگەڵ بۆچوونی چینایەتی، یان نەتەوایەتی لە چەند خاڵێکدا بگونجێ، بەڵام لە هیچ تیووری و مێتۆدێکی نەتەوایەتی و چینایەتییەوە هەڵنەقووڵاوە.

١-ج- لە مەسەلەی لێکدانەوەی زاراوەدا دەبێ ئەو ڕاستییە فەرامۆش نەکرێ کە ڕەوانبێژی، بەهەموو بوارەکانەوە، ئامرازی ڕازاندنەوەی دارشتنە و ناکرێ ئەم ئەرک «وەزیفە»یە پتر لەمە پەرەی پێ بدرێ و، ئەرکی پەرەپێدانی چەمکیشی پێ بسپێرین.

١-د- مێتۆدی سکولاستیکی و سەپاندنی هەر مێتۆدێکی نامۆ بەسەر جیهانبینی شاعیردا، ئەگەر لە بواری لێکدانەوەی مەعنای زاراوەکاندا ڕەنگ بداتەوە، بێگومان بەرەو کۆمەڵێک کێشەی مەنهەجی گەورەمان دەبەن. کە دەبنە مایەی شێواندنی هەردوو کۆششی لێکدانەوەی سیستماتیکی و فەرهەنگسازیمان.

٢- کێشەی بوار: گرنگیی «زاراوە» لەهەر بوارێکی تایبەتدا ئەوەیە کە لە چوارچێوەی بونیادێکی چەمک و پڕ نسیب «مبادیء» و کاتیگۆری «مقولە»دا مەعنایەکی تایبەت و جیاوازی هەیە و، ئەم تایبەتمەندییە دەبێتە مایەی جیاوازی و تایبەتمەندی و ڕەسەنایەتیی بوارەکە. ئەم کێشەیە لە جیهانبینی سۆفییانەی مەحویدا و، لە بواری پرۆسە و کۆششی فەرهەنگسازیدا ناچارمان دەکات وریا بین هێندێک لەو سنوورانە نەبەزێنین کە بوونەتە

مایەی جیاوازی و ڕەسەنایەتیی ڕێبازی تەسەووفی لای مەحوی. ئەو سنوورانەش ئەمانەن:

٢-أ- کێشەی سەرەتایی تەسەووف دوو گریمانەی عەمەلی، یەک تیۆری جەمسەرەکانیەتی، یەکەمیان ئەوەیە کە کۆششێکە بەمەبەستی ڕەتکردنەوە (نفی) کردنی خود لە پێناوی گەیشتن بە«بوون» یان بەمانەوەیەکی پایەدار تر کە بە«مانەوەی پاش فەوتان- البقاء بعد الفناء» ناسراوە. گریمانەی دووەمیش ئەوەیە کە ئەو کۆششە، هەر لە سەرەتاوە بەندە بەو مەرجەی کە خۆشەویست «خودا» ڕەزامەندیی لەسەر هەبێت. ئەم دوو بنەمایەش، کە دوو گریمانەی سیستماتیکین تەسەووفی ئیسلام لە نەزعە ڕۆحییە هیندۆسی و مەسیحییەکان و هەموو نەزعەکانی دیکە جیا دەکاتەوە.

٢-ب- بەهەڵە ڕۆژهەڵاتناسان دوو ئاڕاستەیان لە تەسەووفدا لێک جودا کردۆتەوە و گوتوویا کە «تەسەووفی عەمەلی» و «تەسەووفی تیۆری» هەیە و، دەرکیان بەو ڕاستییە نەکردووە کە تەسەووف لە جەوهەردا ئەزموونێکی عەمەلیی سەخت و نائاساییە و دەرئەنجام و ڕەنگدانەوەکانیشی نائاسایین، بۆیە نابێ بخرێنە بەرچاو و گوێی ئەوانەی لە دەرەوەی ئەزموونەکەدان، کە بە«نامەحرەم» ناویان بردوون. ئاسایی نەبوونی ئەو «ڕاز»انەی هێندێ گەورە سۆفی درکاندوویانن بۆتە مایەی بەهەڵە تێگەیشتن و ناوزەدکردنی ئەو ڕازانە بەوەی گوایە کۆششی تیۆرین.

٢-ج- خودی ئەو ئەزموونە جیاوازە، چونکە پێویستی بەوە هەیە بەزمانی ئاسایی هەست تەعبیری لێ بکرێ، بۆتە مایەی پەیدابوونی دەیان هێما و ڕەمزی ئاڵۆز.

لەدەرەوەی بواری تەسەووفیشدا، گرنگترین ئەو بوارانەی مەحوی زاراوەکانیانی بەکارهێناوە، ئەمانەن:

٢- د-فیقە (شەریعەت). لە زاراوەکانی ئەم بوارەدا پێویستە ئاگادار بین کە مەحوی شافیعی مەزهەب بووە، بەڵام بۆ هێندێ مەبەستی ناسک سوودی لە هێندێک لە تایبەتمەندییەکانی مەزهەبەکانی دیکەی «ئەهلی سوننەت و جەماعەت» وەرگرتووە.

٢-هـ- لە بواری (علم الکلام -عەقاید -بیروباوەڕ)دا کە بەبواری (ئوسووڵ)یش ناسراوە، پێویستە سەرنجی ئەو ڕاستییە بدەین کە مەحوی سەر بەمەزهەبی کەلامیی «ئەبولحەسەنی ئەشعەری»یە و دژی هەموو بۆچوونەکانی کەنارگیران (المعتزلە)یە و، لەم بوارەشدا کاریگەریی تەواوی ئیمام (محەممەد ئەبو حامیدی غەزالی)ی بەسەرەوەیە.

٢-و- لە لێکدانەوەی زاراوە قورئانییەکاندا پێویستە ئەو ڕاستییە ڕەچاو بکرێ کە «مەحوی» لایەنگیری لێکدانەوەی پێشینان (السلف)ە بۆ قورئانی پیرۆز.

٢-ز- لە هێنانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەردا (د.خ) زۆر پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکرێ کە فەرموودەی دانراو (موضوع)، یان لاواز (ضعیف)، هەن کە مەحوی بەکاری هێناون و،

ئەمەش لە جەوهەردا یەکێکە لە کێشە گەورەکانی کۆششی فەرهەنگسازی بۆ مەحوی.

٢-ح- هەموو بەکارهێنانێکی زاراوەی مەنتیقی لە شیعری مەحویدا لە چوارچێوەی مەنتیقە شەکلییەکەی ئەرستۆ دایە و، پشت بەستنی بەهەر مەنتیقێکی دیکە هەڵەی لێ دەکەوێتەوە.

## دووەمین بەش

## کێشەی سەرچاوە

هەموو سەرچاوەکانی تەسەووفی ئیسلامی لە کتێبی بەناوبانگی ئەبو نەسری سەراجی تووسی و «قوت القلوب»ی ئەبو تالیبی مەکییەوە تا گەورە سۆفییەکانی سەدەی شەشەم و حەوتەمی کۆچی، دەتوانرێن بکرێنە سەرچاوەی لێکدانەوەی مەعنای زاراوەکانی لای «مەحوی». بەڵام «شێخ محێدینی ئیبن عەرەبی» پتر سوودبەخشن لە بواری قووڵبوونەوەی لە چەمکەکاندا، بەتایبەتی چەمکی «کات».

لە بواری عەمەلیشدا، وەکو یەکێک لە پەیڕەوانی ڕێبازی نەقشبەندی، ڕێ و ڕەسمەکانی ئەو تەریقەتە و ڕێنماییەکانی شا عەبدوڵڵای دەهلەوی و مەولانا خالید و مورشیدە ڕاستەوخۆکانی زۆر گرنگن بۆ تێگەیشتنی زاراوەی سۆفییانەی لای مەحوی، وەکو بنەمای سلووک.

## سێیەمین بەش

## کێشەی داهێنان

مەحوی سۆفییەکی خاوەن ئەزموونی داهێنەرانە بوو، لەم بوارەدا ئەوەی گرنگە ڕەچاو بکرێ ئەوەیە کە:

٣-أ- لە شیعرەکاندا مەحوی جاری وا هەیە پابەند بووە بەمەعنای زاراوە سۆفییە باوەکان و جاری وا هەیە مەعنای دیکەی پێ بەخشیوە، یان وەکو زاراوەیەکی ناسۆفییانە بەکاری هێناون.

٣-ب- لەسەر بنەمای جیهانە گشتییەکەی تەسەووف هێندێ زاراوەی وردی خاوەن مەعنای تایبەتی داتاشیوە، لەوانەش پێغەمبەرستان، وحووشستان و سەرابستان و ... هتد.

# ناوەڕۆک